



# کۆندی

## چیرۆکی سەرکەوتنی کۆندۆلیزا رایس

وەرگێڕانی

والی شێخ عەلی

# کۆنـــــدی

چیرۆکی سەرکەوتنی کۆندۆلیزا رایس

نووسینی: ئەنتۆنیا فێلیکس

لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی: سەعید ئەلحوسنیە




حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

xanecontact@yahoo.com

- ناوی کتێب: کۆنـدی
- نووسەر: ئەنتۆنیا فێلیکس
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: والی شێخ عەلی
- بابەت: ژیاننامە
- پیتچنین: والی شێخ عەلی
- هەڵەبڕی: ئەحمەد مەحمود
- دیزاینی ناوەڕۆک: نزار نوری
- بەرگ: ئارام عەلی
- تیراژ: ٥٠٠
- زنجیرە: ٤٢٩
- چاپخانە: شڤان
- چاپ: چاپی یەکەم
- ژمارەی ڕۆلێن: ٩٢٨/٦١- ف ٤٧٤
- ژمارەی سپاردن: (١٨٧٢) ساڵی (٢٠١٣) لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی پێ دراوە

# ناوەرۆک

#

# پێشەکی چاپی کوردی

کە گەڕامەوە نێوەندی زانکۆ، زۆر بەکەیف بە نیازبووم ئەو مۆڵەتنامە ئەکادیمیەی بەدەستمهێناوەو ئەوانەی دواتریش بەدەستیان دەهێنم ببنە سوکنایەك بۆ منو هاوپیشەکانم تا کورسییە ڕەقوتەقەکان بکەنە جێنشینی شاهانەو دەسەڵاتی سیاسی هەموو دەم بخەینە ژێر پرسیارو چاودێریو بگرە ئامۆژگاریکردنەوە. لە دونیاگەلێکی وەك ڕۆژاوا مرۆڤە بڕوانامەدارەکان دەبنە راوێژکارو هەر لە زووەوە پشتیوانی دوورمیدیای سەرۆكو پیاوانی یاریچی گۆڕەپانی میدیاکانن، ئەمانەی کە پێیان دەوترێت ئەکادیمیست لەنێو زانکۆکانەوە تیۆریزەی چەمكو بیردۆزەکان دەکەنو بە وانەی تایبەت بۆ سیاسیەکانو پیاوانی دەوڵەتی ڕووندەکەنەوەو دەبنە مەشخەڵێك هەم ڕێڕەوی سەرکردایەتی ئایندە ڕووندەکەنەوەو هەم سەرکردایەتی ئێستاش لە تاریکی دەرباز دەکەن.. ئەمە ئەو شتەیە کە بەدرێژایی خوێندنەوەی ئەم کتێبە من تێیگەیشتمو خواستم بوو ڕۆژێك ئەکادیمیستەکانی کوردیش لە حەرەمی زانکۆکانەوە سیاسیەکان ناچاربکەن گوێیان لێبگرن، نەوەك زانکۆکان ببنە گۆڕەپانی گەمەی نالۆژیکی سیاسیەکانو بەمەش نە زانکۆ داهێنانو تیۆر بەرهەمبهێنێتو نە سیاسیەکانیش ئامۆژگار بن لەجێی ئەوەی داواکاری ئامۆژگاری بن!

دەڵێن لەپشت هەموو پیاوێکی مەزنەوە ژنێك هەیە، بەڵام من پێم وایە کاتێك ژنێك دەچێتە لوتکە ئیتر دیارە لە گەمژەیی ئەو پیاوانەوەیە کە ئەو ژنە کاریان لەگەڵ دەکات. پیاوگەلێکیش هەن لە فۆبیای لەدەستدانی کەسایەتییەوە هەموو دەم وا دەزانن کە دەرکەوتنی ژنان مایەی سنووردارکردن و کورتکردنەوەی دەسەڵاتەکانی ئەوانە بۆیە بەردەوام لەژێر سێبەری زاڵی نێرینەدا چەکوشەکانیان ئێسك و پروسکی مێینەکانی دەوروبەریان دەهاڕێت! رەنگە کۆندۆلیزا رایس بەختەوەربووبێت کە بووەتە هاورێی سیاسییەکی هەڵەشەی کاڵرۆشنبیری وەك بوشی کوڕ، لەچاوی ئەمەریکییەکانەوە، کە ئەمەش بواری بۆ رەخساند بتوانێت ئەو هیواو خەونانەی هەیبوون لە تەمەنێکی نیمچە زوودا بەدییان بهێنێت.

هەڵبەت شکۆیەکی گەورەیە وەك ژنێك، کە تەنها چەند دەیەیەك لەوەوپێش هێندە بڕوا بەخۆبوونی تێدا نەبووبێت پیاسەیەکی خێرای گەشتیاری بەنێو کۆشکی سپیدا بکات، لەدووخولی سەرۆکایەتی بوشی کوڕدا ببێتە پلاندانەرو ئەقڵی دارشتنی زۆرێك لەو سیاسەتە حەکیمانەی کە بوشی لە شپرزەیی دادەچۆڕاند، لە یەکەم خولدا وەك سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و لە دووەم خولیشدا وەك سکرتێری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ئەو وڵاتە. کۆندی چۆکی بە پرەنسیپی بەکۆیلەسەیرکردنی ژن و رەشپێست لە وڵاتەکەی خۆیدا دانا و کەلتوری بینینی مرۆڤی رەنگەکانی تری لە پۆستە باڵاکاندا داهێنا. (ژنێك لە حیکمەت) لەوانەیە شایستەترین ناوبانگ بێت بۆ خاتوونێك کە خۆی خۆی گەیاندە لووتکە. هاوڕەگەزەکانی ئەوی رەشپێست هەتا شەستەکانی سەدەی رابردووش نەیاندەتوانی لەنێو پاسدا لە حزوور سپیپێستێکی پیاو یان ژندا لە جێگاکەی خۆی دانیشێت، تەنانەت ئەگەر دووگیان بەدوانەیەکیش بوایە. ئەوی ژن هەتا چلەکانی سەدەی رابردوو نەیدەتوانی دەنگ بدات، بە هەموو پێوەرەکان پێی دەوترا جێگەی کارکردنی ژنان دوو شوێنە، چێشتخانەو ژووری نووستنەکان، لەوەڕا بەدواوە کاری پیاوەو ملهەڵقورتاندن لەکارو پیشەی پیاوان پێڕاکێشانە لەلایەن ئەو ژنانەی کۆمەڵگا

بەرەو بێ ئابڕوویی دەبەن!

سەردەمانێك لەو ئەمەریكایەی كە ئەمڕۆ ماڵی خەونەكانی زۆرێك لە گەنجو پیرە پڕهیواكانە، تەنانەت نەژادو پێكهاتەی ئیتنیكی مرۆڤەكان كاریگەری راستەوخۆیان لە مەكانەو جێگای پرسی هاوڵاتیبووندا هەبوو. مرۆڤێكی بەریتانی یان ئەوروپای خۆراوایی مەقامەتێكی مەزنتری لە هی رۆژهەڵاتی ئەوروپاو ئاسیای رۆژهەڵات هەبوو، ئەمانەی دواینیش جێگاو پایەیان بڵندتربوو لە هی رۆژهەڵاتی ناوین و ئەفریقییەكانیش لەدوا ریزبەندی بە مرۆڤناسراویدا بوون و تەنها هێڵێكیان لەگەڵ ئاژەڵە خاوەندارەكاندا لەنێوان كێشرابوو لەوەی ئەمان ئاژەڵێكی قسەكەر بوون..بۆ كۆندی بەم سێ پێوەرە، رەشپێستی، ئەفەریقی نەژادو ژنبوون، ئاسان نەبوو بگاتە لوتكە، بەڵام ژنێكی خاوەن سەنگو سەقامگیریو كاریزمایی خۆی بوو بۆیە توانی ببێتە پرەنسیسی ئەفەریقا وەك موعەمەر قەزافی ناوی لێنابوو.

راستی خوێندنەوەی ئەم كتێبە بۆ من لەباروزروفێكی دژواری تاكەكەسیدا روویدا كە بەهۆیەوە هیوایەكی بێهاوتای پێبەخشیم لەوەی تا بڕوابوونەكان لە هەناوەوە سەرچاوەبگرن خەونەكان مایەی بەدیهاتنن. ئەو رۆژەی ئاگاداركرامەوە دەبێت لەماوەی تەنها سێ رۆژدا ئوردن بەجێبهێڵم و بەرەو ئەمەریكای خەون و خەیاڵەكان بەرێبكەوم، ماتەمینییەك باڵی بەسەر شوناسی كەسیمدا كێشا لەوەی ئاخۆ من بتوانم ئەوەی لەوێ چاوەڕێی دەكەم ئەنجامی بدەم و بۆم بچێتەسەر! مرۆڤێك كە روو لە هەندەران دەكات و مێینەیەكی خێزانێكی مامناوەندی كۆمەڵگایەكی وەك كۆمەڵگەی كوردییە، زمان نازانێ و تەنها دوو سێ جارێك سەفەری بۆ دەرەوەی وڵاتەكەی كردووەو هەموو دەم لەگەڵ گروپێكی سیاسی كە بۆ كاری دیبلۆماتی حیزبەكەی رۆیشتووە، ئاسان نییە بەتەنێ رووی مەنفا بگرێت و چاوەڕێ بێت ژیان بەخەندەوە بەرەورووی بێت!! ئەوە من بووم كە جگە لە چەند وشەیەكی سادەی زمان و كەشكۆڵێك هیواو مۆتەكەیەك لە ترسی ونبوون و توانەوە ١٤ سەعات رێی فڕۆكەم گرتەبەر تا بۆ خۆمی ئیسپات بكەم كە دەتوانم خۆم بم..

ئەم کتێبە لە تەواوی ١٤ کاتژمێرەکەی سەفەری نێو فڕۆکەکەدا لەگەڵم بوو، دەمخوێندەوەو رادەوەستام تا تەماهی بکەم لە کەسایەتیەکەی کۆندیدا، دەمخوێندەوەو رادەوەستام ئەمجارەیان بۆئەوەی باشتر لێی تێبگەم‌و وێنای رووداوەکان بکەم..تا لەدواجاردا بەخۆم وت "رەنگە لەم سەفەرەدا بەپلەی یەکەم نەتوانیت ئەوەی بۆی هاتویت بیبەیتەوە لەگەڵ خۆت، بەلام ئەزموونێکی ئەوەندە گەورە دەبێت کە بۆ باقی تەمەنت رێنیشاندەرت دەبێت.. لەدواجاردا تۆ ژنیت وەك کۆندی، بەلام نە کۆیلەیت‌و نە رەشپێستێکی ئەفەریکی کە کڕین‌و فرۆشتنت پێوەکرابێت لە زەمەنی کۆیلەگەریدا، بۆیە ئەگەر ئەو توانیبێتی لەو باروزروفە ئالۆزو قورسەدا بیکات تۆش دەتوانیت".

ئەمە ئەو راستییەیە کە ئەم کتێبە بە منی بەخشی..فێری کردم خاڵی ناوات لەپێش چاوم دیاری بکەم‌و تێبکۆشم بێ گوێدانە باروزروفەکان، بەردەوام بم تا پێی دەگەم..بەو واتایەی کتێبەکە ناوێتەی کۆمەڵێك باکگراوندی ئالۆزی کۆمەڵگای ئەمەریکییە کە پێکەوە دەبنە گوژمەیەك لە تەحەدداو کۆندی پێدەخەنە رەوڕەوەی زەمەن بۆ بەدیهێنانی هیواکانی. لێرەوە ئەو ژنەی کە بەچاوە بازناساکانی‌و بە پێستە تاریکەکەی‌و بە کەسایەتییە پڕ ئامادەییەکەی لەنێو کۆڕو کۆبوونەوەکاندا ناسراوە، نهێنییەکانی سەرکەوتنی خۆی لەرێگای نووسەری کتێبەکە ئەنتۆنیا فیلێکسەوە دەگێڕێتەوەو بەمەش دەبێتە نموونەیەکی باڵا بۆ زۆرێك لە ئێمە، کە هێشتا کاروانی بەدیهاتنی خەونەکانمان زۆر دوورە!

لەکۆتایشدا کاتێك بڕیارماندا دەست بەکاری وەرگێڕانی کتێب بکەین، ئەم کتێبە لە لیستی پێشەوەی ئەو کتێبانەدا بوو کە بوونە ئامانجی سەنتەرەکەمان، گەرچی وەرگێڕی دەقە ئینگلیزییەکە بۆ دەقە عەرەبییەکە، کارێکی هێجگار باشی نەکردووە لە گۆڕینی ناونیشانی کتێبەکە لە "کۆندی..چیرۆکی کۆندۆلیزا رایس، بۆ چیرۆکی سەرکەوتنی کۆندۆلیزا رایس" و پاشان پەلەپەلییەك لەنێوان دەقە ئینگلیزییەکەو عەرەبییەکەدا هەیە، بەلام ئێمە ئەوەندەی توانیبێتمان لە

کتێبەکانی وێبسایتی گوگڵەوە بەراوردی نێوان هەردوو دەقەکە بکەین، کردوومانە، گەرچی بەداخەوە نەمانتوانی دەقی ئینگلیزیەکە بەتەواوی بەدەستبخەین بۆیە بەناچاری دەقە عەرەبییەکەی (سەعید ئەلحسنیە) بووە سەرچاوەی سەرەکی کارەکەمان..لەگەڵ هەموو ئەوەشدا پێم وایە هاندەرێکی باشمان داوەتە کۆڵنەدەرەکان..تا بتوانن دوورنمایانە لە ئاسۆ بڕوانن‌و وردکارانە هەنگاوەکانیان رێکخەن، لە دواجاردا زەمەن کەسی لەیاد ناچێت!

دوا هیوایەکیش ئێمە هەمانبێت ئەوەیە ئەم کتێبە هەوێنی هەنگاونانی جدی بێت بۆ ژنان‌و ئافرەتان تا بتوانین ئەم قاڵبە رووکەشەی کە ئەمڕۆ تەواوی رۆڵی ژنی پێ سنوورکێش کراوە وەرچەرخێنینە بوارێکی پراکتیزەیی کێبەرکێکار کە تیایدا ئەزموون‌و سەلیقەی کارکردن‌و دانایی پێوەربن..

ڤیان مەجید فەرەج
بەڕێوەبەری سەنتەری نیشتیمانی بۆ لێکۆڵینەوەی جێندەر#
سلێمانی (۲۰۱۳/۵/۱۵)#

# پێشەکی نووسەر

کاتێك کۆندۆلیزا رایس لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا بوو، بەیاوەریی دایكو باوکی گەشتێکی بەرەو واشنتۆنی پایتەخت ئەنجام دا. جۆنو ئەنجێلینا رایس، کە کۆندۆلیزا رایس بە دوو بانگخوازی فێرکاری ناویان دەبات، پایتەختی وڵاتەکە بەڕوخساری گەشتوگوزاریی نموونەیی بۆ بەسەربردنی پشووەکان دادەنێن. لەوێ مرۆڤ دەتوانێت بەزۆر مێژوو و مۆزەخانە ئاشنا ببێت، هەروەك چەندین شتی تێدایە کە دەبنە سروش بۆ عەقلە تازەپێگەیشتووەکان. لەکاتی گەشتکردنیان بۆ شەقامی پنسلڤانیا، کە زۆرێك لە خەڵك لەنگەر دەگرن بۆ ئەوەی لە دەروازەی پێشەوەی بڕواننە کۆشکی سپی، کۆندۆلیزا رایس بەهێمنییەوە چاوی بڕییە ئەو بەردەمەی کە لێوانلێوە لە پایە، ئەم سیانە بەبێدەنگی لەوێ وەستانو کچەکە ئاوڕێکی بۆ باوکی دایەوەو وتی: "بابە ئێستا بەهۆی رەنگی پێستمەوە رێم پێ نادرێت بچمە ناو ئەو شوێنەوە، بەڵام رۆژێك دێت خۆم لەناو ئەم باڵەخانەیەدا ببینمەوە"

کۆندی توانی ئەم وشانەی بسەلمێنێت نەك تەنها لەرێگەی کامڵبوونێکی پێشوەختەوە بەڵکو لەرێگەی تێڕوانینیشیەوە بۆ داهاتوو. پاش تێپەڕبوونی ٢٥ ساڵ، ئەم کچە گەیشتە قۆناغێك کە رۆژانە ١٤ سەعات وەك گەورەڕاوێژکاری سەرۆك جۆرج بوشی باوك بۆ کاروباری یەکێتیی سۆڤیەت کاری دەکردو لەکاتی

یەکخستنەوەی ئەڵمانیاو کۆتایی شەڕی سارددا یارمەتی دارشتنی سیاسەتی ئەمەریکای دەدا. پاش ١١ ساڵیش لە کۆتاییهاتنی کاری یەکەمی لە ئیدارەکە کە دوو ساڵی خایاند، جارێکی تر چووە ناو ئیدارەی کۆشکی سپییەوە بەڵام ئەمجارەیان وەك راوێژکاری جورج بوشی کوڕ بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی.

جای نۆردلینگەر لە وتارێکدا کە لە نەشناڵ ریڤیودا لەکاتی هەڵمەتی سەرۆکایەتی بوشی کوڕدا بڵاوکرایەوە، پێشبینی کرد کە بەچاوپۆشین لەو پۆستەی کۆندۆلیزا رایس لە ئیدارەکەدا وەریدەگرێت، ئەم خانمە دەبێتە دیارترین ئەستێرەی تیمی کاری ئیدارەکەی بوش و ناوی دەچێتە سەر زمانی هەموو کەسێك. راستە کۆندی دواتر لە تابلۆ ریکلامییە گەورەکانی گۆڕەپانی تامیس ـدا دەرنەکەوت، بەڵام ناوبانگەکەی لە هەڵکشاندابوو. ئەمە زیاتر پاش روداوەکانی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ دەرکەوت کاتێك وەك یەکێك لە وتەبێژە بنچینەییەکانی کۆشکی سپی بۆ کاروباری شەڕی دژە تیرۆر، دامەزرا. وێنەو روخساری زیاتر لە دەرکەوتنە یەك لەدوا یەکەکانی لە بەرنامەی دیالۆگئامێزی ئەم یەکشەممەیەی واشنتۆنو دیدارە درێژەکانی لە گۆڤارەکانی ڤۆگ، جۆرج کە ئێستا دەرناچن، یان گۆڤاری ئۆپرا کە هەموویان پێکەوە بوونە هۆی ناوبانگێکی زیاتر بۆی. ماوەیەکی زۆر کۆندی وەك ئەستێرەیەك لە هەندێك شوێنی وڵاتدا سەیردەکرا. بۆ نموونە ئەم ژنە لە پالۆ ئەڵتۆی رۆژهەڵات لە کالیفۆرنیا وەك پاڵەوانێکی ناوخۆیی سەیردەکرێت کە تێیدا بەشداریکردووە لە دامەزراندنی ئەکادیمیایەك بۆ فێرکردنی مندالان پاش دەوامی فەرمی ئەو خوێندنگا ناوخۆییانەی کۆمەکی دارایی نەدەکران. هەروەها کۆندی وەك بەناوبانگترین پسپۆڕ لەسەر ئاستی وڵات، لەرووی لێکۆڵینەوە لەسەر یەکێتیی سۆڤیەت، سەیردەکرێت، ئەمەش پسپۆڕییەکە کۆندی لەو کاتەوە هەڵیبژاردووە کە بۆ یەکەمین جار گوێی لەوانەیەکی ستالین بووە لەسەرەتای پەیوەندیکردنی بەزانکۆوە.

کۆندۆلیزا رایس لە ژیانیدا شەیدای دوو شت بووە ئەوانیش موزیكو روسیابوون. ئەم کتێبە باس لەو رەگە موزیکییانەی خێزانەکەی دەکات کە

پشكیان هەبووە لە پێكهێنانی ناوەكەی‌و ئەو ئامانجەی كە ئەو خێزانە داینـاوە بۆئـەوەی كۆنـدی ببێتـە پیـانۆژەن. ئـەم گۆڕانكارییـە كتـوپڕە لـە ژیـانی كۆندیـدا كاتێك روویدا كە هەرزەكاربوو، ئەو كاتەی بڕیاری دا كـە خـاوەنی مـەرجی پێویسـت نییە بۆ ئـەوەی ببێتـە خـاوەنی بڕوانامەیـەكی بـەرز لـە جیهـانی موزیكدا. كۆنـدی كاتێـك بڕیـاری یەكلاكـەرەوەی دا بـۆ گـۆڕینی ئاڕاسـتەی پسـپۆڕییەكەی، كـە گـوێی لەوانەیەكی پرۆفیسۆری لێهاتووی زانكۆ (باوكی مادلێن ئۆلبرایتی وەزیـری دەرەوەی پێشـوو) بـوو سـەبارەت بـە یـەكێتیی سۆڤیەت. لەوكاتـەوە كۆنـدی چـووە نـاو ئـەو بوارە ناباوەوەو هەرگیز لێی پاشگەز نەبوویەوە.

چیرۆكی كۆنـدۆلیزا رایـس زیـاتر بـاس لـە میراتێكی خێزانیی كاریگـەر دەكـات، هـەر لەسـەردەمی منداڵییـەوە لـە شـاری بیرمنگهـامی سـەر بەویلایـەتی ئـەلاباماوە بیگـرە كـە لـە ساڵەكانی پـەنجاو شەسـتەكاندا یـەكێك بـوو لـەو شـارانەی باشـوری ویلایەتــە یــەككرتووەكان كــە جیاكــاری نــەژادی تێــدا پــەیڕەو دەكــراو خــاڵێكی وەرچەرخان بوو بۆ بزوتنەوەی مافە مەدەنییەكان، تـا دەگاتـە قۆنـاغی هەڵگـەڕانی كۆنـدی بەپلـەكانی سـەركەوتن‌و وەرگـرتنی گـرنگترین پۆسـتەكان لـە حكومەتـدا. كۆندی شانازی بـەوەوە دەكات كە كچی هـەردوو بنەماڵـەی رایس‌و رای ـ ە كـەدوو بنەچــەن ئەنــدامی خێزانــەكانیان بــەوە ناســراون ژیانیــان بــۆ فێركــردن‌و بەدەستهێنانی دەستكەوت تەرخان دەكەن. دەتوانین بڵێین كۆنـدی بەڕاسـتی كچی باوكی خۆی بووە، واتە كچی ئـەو پیـاوە بـانگخوازەی ژیـانی لـە هـەمان پرسـەكانی كۆندیدا بەسەربردووە. كۆندی خاوەنی هەمان ئەو هێزی كەسایەتییەیە كە بـاوكی خاوەنی بـوو، پشـتگیرییەكانی لـەو بڕوایـەوە سەرچاوە دەگرێت كـە خـودی بـاوكی كۆندی هەیبوو.

ئـەم چـیرۆكە گەشـتی كۆنـدی لـە رێـڕەوی بـالاترین پلـەكانی ئـەو بـوارەدا دەگێڕێتــەوە، كــە پیــاوان كۆنترۆڵیــان كــردووە، هاوكارەكــانی شــێوازەكەی كۆنــدی بەتونـدوتۆڵی ئاوێتـە بـوو بەنـەرمیی، ناودەبـەن. لـە رۆژنامـەی **نەشـناڵ ریڤیـو**ـ دا هـاتووە: "هـەمووان لەسـەر ئـەوە كـۆكین كـە كەسـایەتییەكی زۆر سـەرنجڕاكێش‌و ئــارام‌و بــاش‌و زیــرەك‌و خاكییــە، لەگــەڵ ئەوەشــدا تائێســتاش بەسروشــتە

باشورییەکەی جیادەکرێتەوە هەرچەندە چەندین ساڵ لە شوێنە جیاکانی تردا ژیانی بەسەربردووە". زۆرێك لەوانەی لەکاتی ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا دیدارم لەگەڵدا ئەنجامداون، ستایشی زۆری ئاستی زانیارییەکانیان دەکردو ئاماژەیان بەوە دەکرد کە لە بیرێکی قولەوە زانیاری دەردەهێنێت. کارین فیست کە مامۆستای کۆندی بووە لە زانکۆی دێنیڤەر دەڵێت: "کۆندی یەکێکە لە مرۆڤە بەختیارەکان‌و لایەنی خەمباریی لە ژیانیدا نییە یان بەلایەنی کەمەوە ئەوەندەی من ئاگاداریم ئەو لایەنەی نییە". کۆندی لەمیانەی هۆکاری دەرکەوتنیدا دەڵێت: "من کەسێکم چێژ لە بڕوایەکی راستەقینەوەردەگرم‌و پێم‌وایە خودا بۆ ئەوە دروستی نەکردووم لەم جیهانەدا کە خەم بخۆم، بۆیە من بەبەردەوامی دەڕوانمە کارەکان".

کۆندی دەستکەوتەکانی ئاشارێتەوە بەڵام هاوکات زیاد لەئاستی خۆی رێز لەخۆی نانێت‌و لەو بارەیەوە دەڵێت: "پێم‌وایە من لەسەروو ئاستی مامناوەندییەوەم بەڵام زۆر نا. کاتێك دەبیتە پرۆفیسۆرو کەسێکی کارگێڕیی گەورە لە زانکۆی ستانفۆرد، ئەو کاتە بەبلیمەتیی راستەقینە ئاشنا دەبێت. بلیمەتیم بینیوەو خاوەنی نیم".

رەنگە سەرۆك جۆرج بوشی کوڕ لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا کۆك نەبێت. پێشتر باوکی بوش لەکاتی فەرمانڕەواییکردنیدا، کۆندی زۆر بەدڵبوو، لەوکاتەی لە ئیدارەی راوێژکارەکەی بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی بێرنت سکۆکرۆفت کاریدەکرد. هەر ئەو کاتە بوش سەرنجی دا کە کۆندی زیرەك‌و لایەنگرێکی زۆر لێهاتووەو ئەوەندەی پێنەچوو خستییە ناو بازنەی ناوخۆیی خێزانەکەیەوە. هەر چەند هەفتەیەك پاش ئەوەی بوشی کوڕ پۆستی حاکمی ویلایەتی تەکساسی وەرگرت، کۆندی بووە هاوڕێی، دواتریش دەستبەجێ لەگەڵ دەستپێکی هەڵمەتی سەرۆکایەتییەکەیدا، بووە باڵاترین راوێژکار بۆ سیاسەتی دەرەوە. زۆربەی جار کۆندی وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی رۆڵی دوا ناوبژیوانی دەبینی لەنێوان بیروڕا زۆر دژبەیەکەکانی وەزیرانی بەرگری‌و دەرەوەو ئەندامانی تری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی‌و وا ڕاهاتبوو کە کۆبەندی ئەم بیروبۆچونانەی دەخستە سەر مێزی سەرۆك.

ئەگەر بمانەوێت ژیانی کۆندۆلیزا رایس بە پارچە موزیکێك بچوێنین ئەوا دەتوانین بڵێین ئێستا ئەو پارچە موزیکە لە قۆناغی پەرەسەندندایە. هەموو بابەتێك بووەتە پاڵنەرێك بۆی لە رێڕەوی پارچە موزیکەکەدا بەرەو ساتی گەیشتن بە لوتکە. لەو لوتکەیەشدا هەموو بابەتە تێکناڵاوەکان لە راگەیاندنێکی کاریگەری ئاوێتە بەسەرکەوتندا، دەتەقنەوە. هەندێك پێیانوایە ئەو لوتکەیە چاوەڕێی کۆندی دەکات بۆ ئەوەی ببێتە یەکەم ژن کە پۆستی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بگرێتەدەست. هەندێکی تر پێشبینی دەکەن ببێتە حاکمی کالیفۆرنیا، یان کورسییەك لە ئەنجوومەنی پیرانی ئەو ویلایەتە بەدەستبهێنێت.

# بەشی یەکەم

## راهێنانی کاندیدکراو

**سەرۆکایەتی بەتەنها لە سەرۆکی وڵاتدا کورتناکرێتەوە، بەڵکو تیمێکی تەواوە لە خەڵك کە سەرخستنی کارەکان لە ئەستۆ دەگرن.**

### کۆندۆلیزا رایس– ١٩٩٩

لای کەسە نزیکەکانی بەکۆندی ناسراوە، ئەمەش ناوێکە بۆ دەربڕین، لەناوە درێژەکەی خۆی ئاسانترە. دایکی کە ژەنیاری پیانۆو ئۆرگ بوو، ناوی کۆندۆلیزای لە دەستەواژەی ئیتالی "کۆن دۆلیسزا"وە داهێناوە کە نیشانەیەکی موزیکیە ئاماژە بەوە دەکات کە ژەنیار زۆر بەشیرینی موزیکەکە بژەنێت. وەك نەریتێك هەردوو باڵی خانەوادەی کۆندی کۆکن لەسەر ئەوە کە تاکەکانی خێزانەکانیان بەناوی ئیتالییەوە ناو بنێن وەك تێرێزا، ئەنجێلینا، ئەنجێلا، جەنەوا، ئالتۆ. جۆن و ئەنجێلینا کۆندۆلیزایان بەو ئاڕاستە پڕ مانایەی کە گوزارشت لە ناوەکەی دەکات پەروەردە کردووەو نوقمی سۆزو خۆشەویستیان کردووە کە ئاوێتەبوو

لەگەڵ ئەو هەوڵو کۆششە زۆرەی کردیان بۆ پێگەیاندنیو هاندانی کچەکەیان لە رێگای سەرکەوتندا. بناغە پتەوەکانی خۆشەویستی کاریگەرییەکی پۆزەتیڤیان لەسەر هەر هەنگاوێکی پێشکەوتنی کۆندی هەبوو لەنێویشیاندا چوونەناو ئەو نووسینگەیەی راستەوخۆ دەکەوێتە ژێر هوڵی تایبەت بەسەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان.

سەرۆك وا راهاتبوو بەکۆندی بانگی دەکرد، بەڵام ئەو ستافەی کاریان لەگەڵ دەکرد بەدکتۆر رایس ناویان دەبرد. دیاربوو کۆندی رزگاری ببوو لەوەی کە سەرۆك نازناوێکی بۆ دابنێت کە ئەمەش پێچەوانەی ئەوانی تر بوو، چونکە نازناوی بۆ هەموو ئەوانەی دەوروبەری دانابوو کە کاریان لەگەڵدا دەکرد بەرۆژنامەنووسو یاوەرەکانیشیەوە. ئەوەش بەبیردێنینەوە کە تەنانەت سەرۆکی وڵاتانیش نەیان دەتوانی خۆیان لەو نازناوانە بپارێزن کە سەرۆك بوش بۆی دادەنان بۆ نموونە لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٢دا لەکاتێکدا پەیوەندی لەگەڵ سەرۆکی روسیادا بەهێزبوو، نازناوی بۆتی بۆتی لێنا.

کۆندۆلیزا لە ساڵی ١٩٨٧ لەمیانەی ئێوارەناهەنگێکدا کە لە زانکۆی ستافۆرد سازکرا، توانی بچێتە ناو بازنەی خێزانی بوشەوە. ئەو کاتە کۆندی چەند سەرنجو تێبینییەکی دەربڕی کە بوونە هۆی گۆڕینی رێڕەوی پیشەکەی. کۆندی بەیاوەری چەند کەسێك لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان ئامادەی ئەو ئاهەنگەبوو کەتێیدا بێرنت سکۆکروفت راوێژکاری سەرۆك بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی، وتارێکی پێشکەش کرد. راستەوخۆ دوای وتارەکە ئێوارەخوانێك ئامادەکرا کەتێیدا چەند کەسێك لە گەورە داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەوە بەشداربوون. دیاربوو قسەکردن لەکاتی ئەم خوانەدا بەلای سکۆکرۆفتەوە ماندووکەرە تائەوکاتەی کچە پرۆفیسۆرە گەنجەکەی زانستە سیاسییەکان کە دکتۆر رایس بوو، دەستی کرد بەقسەکردن. سکۆکرۆفت ئەم بۆنەیەی لەیادەو دەڵێت: "دیاربوو کچێکی باریکەلەو بچکۆلانە بوو، بەخۆمم وت بەڕاستی زۆر متمانەی بەخۆی هەیەو بێگومان کەسێکە کە پێویستە من بیناسم" سکۆکرۆفت لەمیانەی قسەکانی کۆندیدا ئەوەی بۆ دەرکەوت کە خاوەنی

تێگەیشــتنێکی فراوانــە لــە ئایــدۆلۆژیای ســۆڤیەت کــە هاوتــەریبی تێگەیشــتنی ســکۆکرۆفتە بــۆ واقعــی سیاســی. ســکۆکرۆفت بــەردەوام دەبێــتو دەڵێــت: "بــۆم دەرکــەوت کۆنــدی لــە هــەموو ئــەو بوارانــەدا شــارەزایی هەیــە کــە ئێمــە دەتــوانین هاوکاری تێدا بکەینو ئەوانەش کە ناتوانین هاوکاری تێدا بکەین".

ئەو کاتە سکۆکرۆفت هێندە بە رایس سەرسام بوو، دەستبەجێ پاش وەرگـرتنی پۆستی راوێژکاری ئاسایشی نەتـەوەیی لـە ئیـدارەی بوشـی باوکـدا، بـیری کەوتـەوەو پەیوەنـــدی پێـــوەکرد. دەســـتبەجێ دوابـــەدوای هەڵبژاردنـــەکانی ســـاڵی ١٩٨٨، سکۆکرۆفت دەستیکرد بە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە لە کۆشکی سپی پەیوەنـدی پێوە دەکەن. سـکۆکرۆفت دەڵێـت: "یەکـەم پەیوەنـدی تەلـەفۆنیم لەگـەڵ کۆنـدی رایسـدا بـوو". بـەهۆی ئـەو پسـپۆڕییە زانسـتیو خوێندنانەیـەوە کـە سـەبارەت بـە یەکێتیی سۆڤیەت بەدەستیهێنابوو، بێرنت پۆستی بەڕێوەبەری کاروبـاری سـۆڤیەتی لـە ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نەتەوەییـدا بەکۆنـدی بەخشـی. کۆنـدی تـوانی رێـزو خۆشەویستی هەموو هاوکارانی دەوروبەری بەدەسـتبهێنێت لـە پۆسـتە نوێیەکەیـدا، هاوکات توانی ببێتە هاوڕێیەکی تایبەتی سەرۆك بوشو باربێرای هاوسەری.

بوشـی بـاوك چـەند وانەیـەکی تایبـەتی لەبواری مێـژووی سیاسـیو سـەربازیی یەکێتیی سۆڤیەت بەکۆنـدی وت کـە ئەمـەش رێـك وەك کـاری کوڕەکـەی وابـوو کـە پـاش دەیەیـەك ئـەنجامی دا. بوشـی بـاوك بەوپـەڕی راشـکاوییەوە لـەماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەیـدا، کـە دارمـانی دیـواری بـەرلینو هەڵوەشـانەوەی یـەکێتیی سۆڤیەتی بەخۆوە بینی، ستایشـی کۆنـدی دەکرد بـەهۆی مانـەوەی لـە کەشـی ئـەو گۆڕانکارییـە خێرایـەی سـەبارەت بـەو دوو بابەتـە روویـدا. بوشـی بـاوك بـە حاکمی یەکێك لە ویلایەتەکانی وتبوو: "هەموو ئەو شتانەی لەبارەی یەکێتیی سـۆڤیەتەوە دەیانزانم، کۆندی پێی وتووم".

پاش کۆتاییهاتنی حوکمی بوشی باوك، کۆندی گەڕایەوە سەر کاری وانەوتنـەوە لە ستانفۆرد، بەڵام لە هاوڕێیەتیکردنی جـۆرجو بـاربێراو بـوش بـەردەوامبوو زۆرجـار بۆ ماڵەوە لە هیوستنو بـۆ ماڵـە گەشـتیاریەکەیان لـە کینیبنـك لـە ویلایـەتی مـاین، بانگهێشت دەکرا.

چەندین جار رایس لەگەڵ سەرۆکی پێشووتر وەك ئەندامی ئەوەی باربێرا بوش ناوی نابوو لیژنەی کتێب، کۆدەبوویەوە. سەردەمانێك ئەو لیژنەیە کۆندی و سکۆکرۆفت و بوشی لەخۆگرتبوو، ئامانجی لیژنەکە پێشکەشکردنی یارمەتی بوو بۆ نووسینی کتێبێك سەبارەت بەو روداوە جیهانییە گرنگانەی لە سەردەمی بوشی باوکدا روویانداوە. لەماوەی ساڵی یەکەمی کۆتاییهاتنی فەرمانڕەوایی بوشدا دەستکرا بەنووسینی ئەم کتێبە کە تێیدا چەندین کەس بەشدارییان کرد. بەمەبەستی یارمەتیدانی بوش بۆ نووسینی ئەم کتێبە، کۆندی لە ساڵی ١٩٩٧دا چەند سەردانێکی درێژخایەنی بۆ هیوستن و کینیبنك بۆرت ئەنجام دا.

دواجار لە ساڵی ١٩٨٩دا ئەم کارە لەژێر ناونیشانی جیهانی گۆڕاودا بڵاوکرایەوە کە ئەو روداوانەی لەخۆگرتبوو لەنێوان ساڵانی ١٩٨٩و١٩٩١دا رووی اندابوو لەنێویشاندا روخانی دیواری بەرلین و دارمانی یەکێتیی سۆڤیەت و کۆتایی جەنگی ساردو جەنگی کەنداو. بوش و سکۆکرۆفت لە پێشەکی کتێبەکەدا نووسیویانە: " لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٩و ١٩٩١دا هەندێك روداوی سەخت و توندی مێژوویی سەدەی بیستەم رووی انداوە... ئایا توانیومانە سەرپەرشتی روداوەکان بکەین ئەو کاتەی فەرمانڕەواییمان گرتەدەست؟ وەڵامەکەی نەخێرە، نەمانتوانی ئەوە بکەین و نەمانتوانی پلان بۆ ئەم روداوانە دابڕێژین... سەرەڕای ئەوەش جەنگی سارد لەماوەی تەنها سێ ساڵدا کۆتایی هات کە ئەمەش وەك تەنها ساتێك وایە لە تەمەنی مێژوودا". بوش دان بەوەدا دەنێت کە کۆندی بەشدارییەکی چڕوپڕی لەم کتێبەدا کردووە، ئەمەش لە رێگای یارمەتیدانی نووسەرەکان بۆ تێگەیشتن لە ناوەرۆکی کتێبەکەو بوژاندنەوەی مێشکیان بە هەندێك لە وردەکاری دیاریکراو، هەروەك لە رێگەی ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە کتێبی ئەڵمانیای یەکگرتوو و ئەورووپای گۆڕاودا ئەنجامیداوە، بەشداری لە دابینکردنی زانیاری بۆ کارەکە کردووە، ئەمەش کتێبێکە لەگەڵ فیلیب زیلیکاو لە ساڵی ١٩٩٥دا پێکەوە نووسیویانە.

لە ساڵی ١٩٩٥و لەمیانەی سەردانێکدا بۆ هیوستن کە بەیاوەری جۆرج و باربێرا بوش بوو، جۆرج داوای لە کۆندی کرد پێش ئەوەی بگاتە ماڵەکەی خۆی،

له ئۆستن سەردانی کوڕەکەی واته جۆرج بوشی کوڕ بکات. بوشی کوڕ ئەوکاته خەریکی خۆئامادەکردن بوو بۆ پۆستەکەی وەك حاکمی تازه هەڵبژێردراو، که ئەمەش یەکەم پۆستی سیاسی فەرمی بوو کەخرابووه سەر شانی. (پێشتریش له ساڵی ۱۹۷۸دا بوشی کوڕ نەیتوانیبوو سەرکەوتن له بردنەوەی کورسییەکی کۆنگرێسدا بەدەستبهێنێت). ڕەنگه جۆرجی باوك لەو کاتەدا هەستی بەوه کردبێت که کۆندی دەتوانێت یارمەتی بەنرخ پێشکەش به کوڕەکەی بکات لەکاتێکدا تموحه سیاسییەکانی دەستیان کردبوو بەوەی زیاترین له ویلایەتی تەکساس. ئەگەرێکی تریش هەیه ئەویش ئەوەیه که ڕەنگه بوشی باوك ویستبێتی بەهۆی ئەو شەیداییەی که هەردووکیان بۆ وەرزش هەیانبوو، بەیەکتریان بناسێنێت وێڕای پەیڕەوکردنی هەمان سیستمی توند له ڕاهێنانه ڕۆژانەییەکاندا لەلایەن هەردوو بوشی کوڕو کۆندییەوه، که ئەمەش نیشانەیەکی دیاری خێزانه وەرزشکارەکەی بوش بوو که حەزیان له کێبەرکێ دەکرد. ئەم شێوه هێڵه هاوبەشه دەبێته بناغەیەکی بەهێز بۆ هاوڕێیەتیو دەبێته هۆی پێکهێنانی چوارچێوەیەك بۆ مشتومڕکردن لەسەر کێشه سیاسییەکانو پرسه جیهانییەکان. به چاوپۆشین لەو هۆکارانەی هانی دا بۆ ئەم مەبەسته، بوشی باوك پێشنیازی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەم حاکمه نوێیه خستەبەردەم کۆندیو ئەویش پێشنیازەکەی پەسەندکرد.

دەستبەجێ هەردووکیان بوونه دوو کەسی هاوڕاو وەك دوو کەسی تامەزرۆ به وەرزش، لەیەك نزیکبوونەوه. ئەوکاته که جۆرجی کوڕ هێشتا یەکێکبوو له خاوەندارەکانی کۆمپانیای تەکساس ڕانجەرز، لەگەڵ کۆندیدا لەکاتی بەسەرکردنەوەی گروپی جۆرج له تۆپەکانی بەیسبۆڵ که بەشێوەیەکی زۆر جوان له کۆمەڵێك کۆگای شوشەییدا نمایش کرابوون، قسەیان لەسەر ئەو یارییه دەکرد، کۆندی مێشکی جۆرجی بەگێڕانەوەی چیرۆکەکانی سەبارەت بەوێلی مایز پڕکرد، که یەکێك بوو له خوێندکارەکانی دایکی له خوێندنگای پیشەسازیی باڵای فایەرفێلد له بیرمنگهام. کۆندی ژمارەیەکی زۆر چیرۆکی ڕاستەقینەی دەربارەی مایز بۆ بوش گێڕایەوه که ڕەنگه تەنها چەند کەسێکی کەم بیستبێتیان، ئەم

چیرۆکانەش بەلای هەموو هاندەرێکی بەیسبۆلەوە لە هەموو چیرۆکێکی تر جێگرنگیترن. کۆندی باسی ئەو کاتە دەکاتو دەڵێت: "دیارە حاکم بوش زۆر بەم چیرۆکانە سەرسامبوو".

جۆرجی کوڕ لەماوەی ئەم سەردانەدا توانی هاوڕێیەتیو ڕێزی کۆندی بەدەستبهێنێت. کۆندی لەبارەیەوە دەڵێت: "بەڕاستی ئەو زۆر زیرەكو ڕێکوپێکەو ئەمەش بەلامەوە زۆر جێگای ڕێزە. کەسێکی توندوتۆڵو ئارامو هاوسەنگە... سەرباری ئەوەش خۆشەویستییەکی بەهێزی بۆ گاڵتەوگەپو سوعبەت هەیە". پشبینییەکانی بوشی باوك سەبارەت بەکۆندیو بوشی کوڕ ڕاست دەرچوونو ئەم دوانە هەستێکی وایان ئاڵوگۆڕکرد کە بووە هۆی دروستبوونی هاوڕێیەتیو ڕێزگرتنێکی زۆر لەنێوانیانداو لەئەنجامیشدا نزیکبوونەوەی کۆندی لە جۆرجی کوڕ زیاتربوو ئەویش کاتێك کە بوش بڕیاریدا دەست بەهەنگاوی داهاتووی بکات لە ڕێڕەوی سیاسیدا.

لەمیانەی پشویەکی کورتدا کە ئەم دوانە لەگەڵ خێزانی بوش لە کینیبك پۆرت لە هاوینی ۱۹۹۸دا بەسەریان برد، جۆرجی کوڕو کۆندی چەند گفتوگۆیەکی چڕوپڕیان سەبارەت بەزنجیرەیەك پرسی جیهانی هەنوکەیی ئەنجام دا. لەوکاتەدا بوشی کوڕ بیری لەخۆکاندیدکردن بۆ سەرۆکایەتی دەکردەوەو دەشیزانی کە هاوڕێکەی (کۆندی) دەتوانێت زانیاری کورتو پوختو ڕوونو ڕاشکاوی سەبارەت بەکێشە ئاڵۆزەکان، پێبدات. هیچ کامیان لەو جۆرە کەسانە نەبوون کە لەکاتی حەوانەوەو پشوودا بەدەم خواردنەوەی چاوە حەز بەگۆڕینەوەی گفتوگۆ بکەن. ئەم دوانە گفتوگۆکانیان لەکاتی ڕاکردن بەتەریبی لەسەر ئامێری ڕاکردن یان لەکاتی هەڵدانی تۆپی تێنسو تەنانەت لەکاتی ڕاوەماسیشدا، ئەنجام دەدا. لە ڕاستیدا کۆندی بەباشی نەیدەزانی ماسی ڕاوبکات هەربۆیە ئەم کارەی دەخستە ئەستۆی بوشی کوڕو باوکی. هەروەك زۆر چارەی ئاویشی نەدەویست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچاربوو خۆی لەگەڵ ئارەزووەکانی دوو هاوڕێکەی ڕابهێنێت. کۆندی بەم شێوەیە ئەم بابەتە ڕووندەکاتەوە: "من هەرگیز بەدەریا سەرم گێژ ناخوات، بەڵام زۆر حەزم لە ئاو نییە. بەدڵنیاییشەوە من ڕاوەماسی ناکەمو ئەم

کارەم بۆ سەرۆك و حاکم بوش جێدەهێشت و لەوکاتەدا خۆشم تەنها دادەنیشتم و قسەم دەکرد. گفتوگۆمان زۆر لەبارەی هێزە چەکدارەکانی ئەمەریکاو سیستەمی بەرگری بەموشەکی بالیستییەوە، دەکرد". جۆرجی کوڕ واڕاهاتبوو کە چەندین پرسیاری دەکرد لەوانە: "سەبارەت بەپەیوەندییەکان لەگەڵ روسیادا دەڵێیت چی؟ سەبارەت بەپەیوەندییەکان لەگەڵ چیندا دەڵێیت چی؟ لەبارەی بارودۆخی سوپاوە چ قسەیەکت هەیە؟".

ئەم راگۆڕینەوەیەی نێوانیان بووە سەرەتای پەیوەندییەکی درێژو پتەو لەنێوان کۆندی و جۆرجی کوڕداو رێگەخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی ببێتە نزیکترین راوێژکاری سیاسەتی دەرەوەی.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٩دا کاتێک جۆرج هەڵمەتی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی دەستپێکرد، ناوی کۆندی لە ریزی پێشەوەی لیستی رێپیشاندەرەکانی بۆ سیاسەتی دەرەوە، دانا. ئەو کاتە کۆندی کە پۆستێکی کارگێڕی لە زانکۆی ستانفۆرد هەبوو، لەو پۆستەی دوورکەوتەوەو چەند بژاردەیەك خرانە بەردەمی. هاوکات لەگەڵ ئەوەی دەستیکرد بەڕاهێنانی ئەو کاندیدە سەرۆکایەتییە لە کاروبارەکانی تایبەت بەسیاسەتی دەرەوە، کۆندی بیری لەوە کردەوە کە دەتوانێت ئەم بژاردانە بەکراوەیی لەبەردەمیدا بهێڵێتەوە.

کۆندی لەکاتی دەستپێکی هەڵمەتەکەدا وایدانابوو کە ئەم کارەی تەنها بەشێکی کاتەکانی داگیردەکات و ئیشەکەی تەنها دەرکەوتنی ئاشکرایەکی سنووردارە لێرەولەوێ و لە هەندێك لە بۆنەکاندا، سەرباری پێشکەشکردنی هەندێك دانیشتنی رێنیشاندەرانە، بەڵام دیبۆرا کارسۆما کە هاوڕێیەکی بوو و لە هەڵمەتی سەرۆکایەتی ساڵی ١٩٩٢دا لە بەرژەوەندی کلینتۆن کاریکردبوو، بەپەلە ئەم بۆچونەی کۆندی راستکردەوە. دیبۆرا دەڵێت: "کاتێك پێکەوە لەسەر پرسەکە قسەمان کرد، کۆندی پێیوابوو کاری ئەو لەو هەڵمەتەدا تەنها پێشکەشکردنی هەندێك وتارە لەسەر پرسی ئاسایشی نەتەوەیی. ئەو رۆژە پێی وتم: "لەڕاستیدا نابمە بەشێك لەم هەڵمەتە". پێیوابوو کە لەگەڵ ئەندامانی هەڵمەتەکە گەشتێك ئەنجامدەدات بۆئەوەی هەندێك وتار لەبارەی ئاسایشی

نەتەوەییـەوە پێشـکەش بکـات! منـیش پێمـوت: "زۆر چـاکە، پەلـە مەکـە. تـۆ شـارەزاییت لـەبارەی هەڵمـەتی هەڵبژاردنـەوە نییـە. تـۆ هاوشـان لەگـەڵ هـەموو ئامادەکارییەکاندا دەبێت بڕۆیت. ئەمـە بەپەلـە روونـادات، خۆیـان دەزانـن چۆن راتدەکێشنە ناو هەڵمەتەکەیانەوە. تۆ تەنها قسە لەسەر بابەتـەکانی تایبـەت بـە ناسایشـی نەتـەوەیی ناکـەیت، بـەڵکو قسـە لەسـەر هـەموو ئـەو بابەتـە جیایانـە دەکەیت کە ئەوکاتە داوات لێدەکەن قسەیان لەسەر بکەیت". پاش ماوەیـەك لـە دەستپێکردنی هەڵمەتەکە قسەم لەگەڵ کردەوە، پێی وتم، "ئەزانی قسـەکانی تـۆ راست دەرچوون!"

کۆندی تـەنها بـەوەوە نەوەسـتا کە گرنگـی بـە تیمـی راوێـژکاری تایبـەت بـە سیاسەتی دەرەوەی سـەربە جۆرجی کـوڕ بـدات، یـان وەك ڕێنیشـاندەری سـەرەکی ئـەو کاربکـات، بـەڵکو داواشـی لێکـرا لـە چـەندین بۆنـەدا کـە پەیوەنـدییان بـە سیاسەتی دەرەوەوە نەبوو، دەربکەوێت. بەهۆی ئـەوەی کـە ژن بـوو، هەڵمەتەکە وەك یارمەتیـدەرێك بـۆ بەدەسـتهێنانی دەنگـی ژنـان، پێویسـتی پێـی بـوو، رەشپێستییەکەشی بەڵگەی ئەوەبوو کە بوشی کـوڕ دەیـەوێت کەسـایەتی سـەربە کەمایەتییەکان بخاتە نێو ئیدارە نوێیەکەوە.

هەر لە سەرەتای هەڵمەتەکەوە بەڕوونی دیاربوو کە کۆندی دەتوانێت ببێتـە جـێ گرنگیـی کاندیدکراوەکـەو پەیوەندییـەکی زۆر نزیکیـان پێکـەوە هەیـە. هـەردووکیان زۆر تامـەزرۆی وەرزش‌و لەشـجوانین‌و ئـەوەش روون بـوو کـە کۆنـدی تـەنها کەسـێکە بتوانێت کێشـە ئاڵۆزەکـانی سیاسـەتی دەرەوە بەشـێوەیەکی زۆر روون پێشکەش بکات، ئـەم شـێوەیەش جێگـای ڕێـزو پێـزانینی بـوش بـوو. رەنگـە گرنگترین شت لەم پرسەدا بوونی ئەو بەیەکهۆگربوونەی نێوانیان بێت. ئەو کاتە حاکم بوش وتی: "حەزدەکەم لێی نزیـك بم، ئـەو ژنێکی سوعبەتچییە. کەسـانی سوعبەتچیم خۆشدەوێت نەك ئەوانەی شتەکان هێندە بە قورس دەگرن و کارێك دەکـەن دەوروبـەر لێیـان رابکـەن. سـەرباری ئـەوەش پـێم وایـە زۆر زیرەکـە!". جۆرجی کـوڕ قـوڵیی ئـەو پەیوەندییـەی لەسـەر بنـەمای کـار، لەنێوانیانـدا هەیـە باسـدەکات‌و بـە کەسـێکی "خـاوەن متمانـەی تـەواو" نـاوی دەبـات‌و دەشـڵێت:

"خاوەنی رەوشتی بەرزە". هەر لەسەرەتاوە ئەم دوانە بەیەکتر سەرسام بوون. کۆندی دەڵێت: "هەر لە یەکەمجارەوە کە پێکەوە قسەمان کرد هەستم کرد کە شیاوی رێزگرتنە، بەراستی ئەو خاوەنی ئەو جۆرە بیرۆکە کاریگەرەیە کەبەهۆیەوە دەتوانێت راستەوخۆ بچێتە ناو کرۆکی بابەتەوە، چونکە زۆرجار دەتوانیت کۆمەڵێك کەسانی ئەکادیمی لە ژورێکدا کۆبکەیتەوەو ماوەی سێ سەعات قسەبکەن بەبێ ئەوەی تەنانەت لە دەرگای کرۆکی بابەتەکەش بدەن".

گروپی راوێژکارانی سیاسەتی دەرەوەی جۆرجی کوڕ چەندین کەسی خاوەن ئەزموونی ئیدارەکانی پێشوو (لەنێویشیاندا ئیدارەکەی باوکی) لەخۆگرتبوو لەوانە ریتچارد ئارمیتاج، رۆبەرت زۆلیك، پاولو وۆلفوویتز، رۆبەرت بلاکویل، ریتچارد بێرل. بەوپێیەی هەماهەنگکاری کارەکانی ئەم گروپە راوێژکارە بوو، کۆندی هاوشێوەی جۆرج، نازناوێکی بۆ گروپەکە دانا. ئەوە بوو نازناوی ڤولکانـ ی بۆ گروپەکە هەڵبژارد کە ناوی بەناوبانگترین پەیکەری تایبەت بەبەدەستهێنانی بەختە لە شارەکەی خۆیدا. ئەم ڤولکانە ناوی ئەو خواوەندی رۆمانییەیە کە گەردەلولی هەورە بروسکە ئامێزو کانزای دروستکردووە تا ببێتە ئامرازێك بەدەستی خواوەندەکانەوە. ئەم پەیکەرە مەزنە لەسەر لوتکەی شاخی سوورەو لەلایەن شاری بەرهەمهێنانی پۆڵاوە بەبۆنەی ئەو پیشانگایەی لە ساڵی ١٩٠٤دا لە شاری سانت لویس سازکرا، دروستکراوە. کاتێك ڤولکان گەڕێنرایەوە بۆ شاری یەکەمی خۆی، لەسەر لوتکەی شاخەکە بە دوورییەکی وا دانرا کە هەستی هیچ کەسێك بریندارنەکات چونکە جلێکی کەمی لەبەردابوو. گروپەکانی گەنجانی شار ئەرکێکیان خستۆتە سەر شانی ئەم پەیکەرە، ئەویش ئەوەیە کە مەشخەڵێکی نێوانیان لەسەر دەستی چەپی داناوە کە لە رۆژانی ئاساییدا رەنگی سەوزە بەڵام لەکاتی روودانی هەر رووداوێکی مەترسیداری هاتوچۆدا رەنگەکە بۆ سوور، دەگۆڕێت.

کۆندی دەڵێت: "لە بیرمنگهام لەگەڵ ڤولکان گەورەبووم. بیرم دێت کاتێك منداڵبووم، لەکاتێکدا رووداوێکی سەختی هاتوچۆ رووی دەدا رەنگەکەی دەبوو بەسوورو کاتێك هەموو شتێك ئاسایی بوایە تیشکی سەوزی دەدایەوە".

تیمی راوێژکارانی سیاسەتی دەرەوەی کاندیدکراو جۆرج بوشی کوڕ، پابەندی ئەوە بوون کە تێگەیشتنی بوش بۆ پرسە جیهانییەکان دابڕێژن و بۆ جیهانی بسەلمێنن کە بوش ماددەیەکی خاوە بۆ کاندیدێکی سەرکەوتووی سەرۆکایەتی. کۆندی کە تامەزرۆی چواندنە بەتۆپی پێ، خۆی بەیاریزانێکی پشت هێڵی ناوەڕاست لە تیمی فۆلکان، ناودەبات و جەختدەکاتەوە: "من هەوڵنادەم دەستپێشخەری بکەم لە یاریدا، بەوپێیەی پشتی هێڵی ناوەڕاستم دەتوانم تۆپەکە بەرێبکەم یان ئاڕاستەی گۆڵی بەرامبەری بکەم". ئەم ژنە ئەم پۆستە گرنگەی بۆیە وەرگرت چونکە جۆرج بوشی کوڕ تواناکانی کۆندی لەسەر شیتەڵکردنی مەتەڵەکانی پرسە ئاڵۆزەکانی سیاسەتەکانی وڵاتو گۆڕینیان بۆ زمانێکی سادە بەشێوەیەك کە تێگەیشتنیان ئاسان بێت، بەرز دەنرخاند، لەو بارەیەوە بوشی کوڕ بەمشێوەیە باسی دەکات: "ئەو دەتوانێت پرسەکانی سیاسەتی دەرەوە بەشێوەیەك روونبکاتەوە کە من لێی تێبگەم".

بەهرەی کۆندیو ئەو حەزەی بۆ روونکردنەوە هەیەتی، یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی بەهۆیانەوە بەرزترین پلەی رێزو پێزانینی لە واشنتۆن بەدەستهێناوە، جا ئەم بەهرەیە سروشتی بێت یان لە رێگەی چەندین ساڵ وتنەوەی وانەی زانستە سیاسییەکان بەخوێندکارانی زانکۆ، بەدەستیهێنابێت. یەکێك لە دیبلۆماتە ئەوروپییەکان لە وتارێکدا لە گۆڤاری ڤۆگ، سەبارەت بە ژیانی رایس دەڵێت: "رایس خاوەنی توانایەکی بێهاوتایە لە روونکردنەوەی بیرۆکەکانی. تواناکانیشی لەسەر پیشاندانی کۆمەڵێکی فراوان لە بابەتی ئاڵۆز زۆر بەهێزو کەم وێنەیە". فیلیپ زیلیکاویش کەهاوکارێکی پێشووی کۆندی بووەو لەماوەی حوکمی بوشی باوکدا کاری لەگەڵ کردووە، سەبارەت بەهەمان خاڵ قسەدەکاتو دەڵێت: "یەکێك لەو تایبەتمەندیانەی کۆندی کە جێسەرنجی بوشە ئەوەبوو کە دەیتوانی بەخێرایی بچێتە ناو کرۆکی بابەتەکانەوە. سەرنجی ئەوەمان داوە کە هەمیشە ئەوانەی کاروباری سیاسەت بەڕێوەدەبەن، لەم خاڵەدا باش نین".

بەوشێوەیە رایس پاش ئەوەی سەرکردایەتی تیمی راوێژکارانی بوشی بۆ سیاسەتی دەرەوە، گرتەدەست توانی سەرکردایەتی بوارێك بخاتە ئەستۆ کە وەك نەریتێك لە رابردوودا قۆرخکراوی پیاوان بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کۆندی هەستی بەترس نەکرد بەڵکو بەهەموو متمانەیەکەوە کارەکەی گرتەدەستو لەوەشدا پشتی بەتواناکانی لەسەر کۆنترۆڵکردنی کارەکانو ئەو شارەزاییانە دەبەست کە لەماوەی کارکردنیدا لە ئیدارەی بوشی باوك و وانەوتنەوەی لەستانفۆرددا، بەدەستیهێنابوو. ئیڤۆ دادەر کە ئەندامێکی پێشووی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بوو، پێی وایە کە کۆندی "ماددەیەکی خاوی نوێیە. ژنێکی ئەمەریکی بەرەگەز ئەفەریقی زۆر لێهاتووە... لەبەرئەوەی شوێنێکی لەبوارێکدا داگیرکردووە کە لە رابردوواو تائێستاش لەلایەن پیاوانەوە، قۆرخکراوە".

ئەرکی کۆندی لە گرووپی ڤولکان زیاتر لە بەرپرسیارێتییەکی لەخۆگرتبوو لەوانە کارکردن لەگەڵ پۆڵ ولفۆویتز بۆ دانانی پرۆگرامی چەند خولێکی راهێنانی چڕی نیمچەرۆژانە بۆ جۆرج بوشی کوڕ. ئەم خولانە پرسەکانی بەرگری، بڵاوبوونەوەی چەك، ئەورووپاو چەندین بابەتی تریان لەخۆ گرتبوو. ئەو سەرسامییە دوولایەنەی لەنێوان کۆندیو جۆرجی کوڕدا هەبوو، رێگەخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی ئەم پرسە بەئاسانی بەڕێوەبچێت. لەلایەن خۆیەوە کۆندیش سەرنجیدا کە هەردووکیان لە رووبەڕووبوونەوەی ئەم بابەتانەدا لەیەکەوە نزیکن. جارێك میدیاکان سەبارەت بەکەمی شارەزایی لە پرسەکانی دەرەوە، پرسیاریان لە حاکم کرد، لەوەڵامدا بوشی کوڕ دڵنیایکردنەوە کە سەرچاوەی بەهێزی هەیە لەوبارەیەوە یارمەتی بدات و وتی: "رەنگە نەتوانم دەربارەی بارودۆخی تەیموری رۆژهەڵات بەوردەکارییەوە بدوێم بەڵام لەوبارەیەوە پرسیار لە کەسانێك کە شارەزایی تەواویان هەیە، وەك کۆندی رایس، پۆڵ وۆلفۆویتز، دیك چینی، دەکەم. ئەوەندە زیرەکیم هەیە کە ئەو شتانەی نایانزانم، فێربېم، هەروەك توانای بڕیاردانێکی باشم هەیە لە جیاکردنەوەی ئەو کەسەی راستییەکانم پێ دەڵێتو لەوەی پرۆگرامێکی دیاریکراوی هەیە کە رەنگە راست نەبێت".

لە دیدارە رۆژنامەوانییەکانیدا، کۆندی بەهەموو توانایەکییەوە یارمەتی حاکمی دەدا. جارێکیان رایگەیاند، هەر بەرپرسێك لەنێویشیاندا خودی حاکم لەسەر ئەوە راهاتبوون لەهەر پرسێکدا کە کەمترین شارەزاییشیان تێدا هەبێت، رووبەرووی دەبنەوە. هەروەك ئاماژەی بەوەشدا کە کۆکردنەوەی زانیاریو بریاروەرگرتنی گرنگ لە پرسەکان لەکاتی دەرکەوتنیاندا کارێکی سروشتییە تەنانەت بۆ ئەو سەرۆکەی لە قۆناغی راهێنان لەسەر حوکمدایە. کۆندی شارەزایی جێبەجێکاریی لەوەوە پەیداکردبوو کە پێشتر بەڕێوەبەری زانکۆی ستانفۆرد بوو، کە ئەمەش گەورەترین پۆستەو دوای سەرۆکی زانکۆ، دێت. ئەو بەرپرسی بودجەیەك بوو کە دەگەیشتە ملیارونیوێك دۆلارو دەیتوانی بەپێی بڕیارە کارگێڕییەکان، خەرجی بکات، بەلام جۆرج شارەزاییە کارگێڕییەکەی لەو سالانەوە بەدەستهێنابوو کە لە پیشەسازیی نەوتدا لە تەکساسی خۆرئاوا بەسەریبردوو، هەروەها لە پێگەکەی وەك هاوبەش و بەڕێوەبەری یەکێك لە تیپە سەرکەوتووەکانی بەیسبۆڵ کە قازانجێکی باشی هەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە حاکمی تەکساس بوو. کۆندی دەڵێت: "کاتێك دەبیتە بەڕێوەبەری جێبەجێکار، هەمیشە داوات لێدەکرێت بڕیاری گرنگ سەبارەت بەو پرسانە بدەیت کە زانیاری کەمت لەبارەیانەوە هەیە. رەنگە یەکێکیان داوای پشتگیریم لێ بکەن بۆ پرۆژەیەکی تەلیسکۆبی فیزیایی کە تێچووەکەی ملیۆنێك دۆلار بێت، من بەش بەحاڵی خۆم زانیاری زۆرم نییە لەسەر ئەم بابەتە، بەلام دەتوانم پرسیاری گرنگ لەوبارەیەوە بکەم تا بۆم روونببێتەوە کە ئایا ئەم پرۆژەیە هێندە گرنگە تا بەبەراورد لەگەڵ پرسەکانی تردا، ئەولەویەتی پێبدەم".

کاتێك میدیاکان پرسیاریان سەبارەت بەوە وروژاند کە کاندیدەکە (بوشی کوڕ) توانای ئەوەی نییە ناوی سەرۆکەکانی ولاتان بهێنێتو ئاماژەیان بە هەلە زمانەوانییەکەیان دەدا، کۆندی ئەم هێرشانەی لە خانەی ئەو یارییانە دانا کە رۆشنبیرانی واشنتۆن شارەزایی تەواویان تێدا هەبوو. کۆندی لەبری ئەوە، زیاتر بایەخی بەو شارەزاییە دەدا کە کاندیدەکەی لە دنیای کارو سیاسەتدا بەدەستیهێنابوو و ئەوەی بەبیر رۆژنامەوانان هێنایەوە کە هەموو سەرۆکێك

پشت بەتیمێك راوێژكارو پسپۆڕ دەبەستێت. ئەو رۆژە وتیشی: " حاكم بوش ١٠ ساڵی كۆتایی ژیانی لە ئامادەبوون لە كۆبونەوەكانی ئەنجوومەنی پەیوەندییە دەرەكییەكاندا بەسەر نەبردووە، بەڵكو ئەو ١٠ ساڵەی لە دامەزراندنی كۆمپانیاو جێبەجێكردنی كار وەك حاكمی ویلایەت بەسەربردووە".

كۆندی دەبوو گفتوگۆ لەسەر سنووری زانیارییەكانی خۆشی بكات، هەروەك دانیشی بەوەدا نا كە كاندیدەكەی تەنها كەسێك نییە پێویستی بەزۆر شت هەبێت كە فێریان ببێت. كۆندی پسپۆڕی بواری كاروباری سۆڤیەت بوو و شارەزاییەكی قوڵی لەو بەشەی جیهاندا هەبوو بەڵام باگراوندی زانیاری سەبارەت بەمێژووی سیاسیی ناوچەكانی تری جیهان زۆر كەمبوو. تێگەیشتنی قوڵی سەبارەت بەسیاسەتی ئەمەریكا لە ئاسیا، ئەفریكا، ئەمەریكای لاتینیو ئەو وڵاتانەی تر كە سەر بە ئەورووپا نین، نەبوو هەربۆیە پێویستبوو چەند خولێكی چڕوپڕ لەم بوارانەدا ببینێت. لەمبارەیەوە دەڵێت: "پێویستبوو شارەزایی لەو ناوچانەی جیهان پەیدابكەم كە لە چوارچێوەی شارەزایی مندا نەبوون، لەڕاستیدا من پسپۆڕی كاروباری ئەورووپام".

جۆرجی كوڕیش حەزی لە خوێندنەوەی ئەو دەقە پێشتر ئامادەكراوانە نەدەكرد كە پەیوەندییان بە سیاسەتو ئاسایشی نەتەوەییەوە هەبوو، هەربۆیە كۆندی هەستیكرد ناچارە شێوازێكی كارلێككردنی تر بدۆزێتەوە كە لەگەڵ دانیشتنە راهێنانئامێزەكانی بوشدا بگونجێت بۆیە چەند خشتەیەكی لە شێوەی پرسیارو وەڵام بۆ جۆرجی كوڕو راوێژكارەكانی، ئامادەكرد. یەكێك لە ئەركە سەرەكییەكانی تری كۆندی ئامادەكردنی رەشنووسێكی زۆر روون بوو بۆ كاندیدەكە كە پەیوەندی بە سیاسەتی چەكی نەتۆمییەوە هەبوو. گرووپی ڤولكان ساڵێكی تەواو كاریان لەسەر ئەم بابەتە كرد. كارەكان بەسەر دانیشتنی سیاسیی داخراوو بەوردی ئامادەكراو دابەشكرابوون. ئەم هەوڵانە لەو وتارانەی بوشدا رەنگیاندایەوە كە لە ٢٣ی ئایاری ٢٠٠٠دا سەبارەت بەسیاسەتی ناوەوە پێشكەشی كرد.

کۆنـدۆلیزا بەرپرسـیارێتی تـەواوەتی ئـەم وتـارەی لەئەسـتۆگرت. سـەرباری ئـەوەی ئـەم وتـارە لەلایـەن گرووپـی ڤولکانـەوە پێداچـوونەوەی بـۆ کـرا، بـەڵام کۆندی هەوڵیشدا زانیاری زیاتر لە سەرۆکی پێشووی لە کۆشکی سپی واتە بێرنت سکۆکرۆفتو وەزیرانی پێشووی دەرەوە لەوانە هێنری کیسنجەرو جۆرج شۆڵتەرو ژەنـەراڵ کـۆڵن پـاوڵو چـەندین کەسـی تـر، وەربگرێـت. کۆنـدی بەبـەردەوامی پیاچوونەوەی بۆ ئەم وتـارە دەکرد تـا ئەوکاتـەی لـە ڕاسـتی زانیارییـەکانی نـاوی، بەتـەواوەتی دڵنیـادەبوو، دواتـریش لەگـەڵ بوشــدا پیاچـوونەوەی بەهـەموو دێڕێکیـدا کـرد، لەبەرئـەوەی دڵنیـابوون لـەوەی کـە بـوش لـە هـەموو رووە سیاسییەکانو باکگراوندی هەموو ئەو پرسانەی لـە وتارەکـەدا هـەبوون تێدەگات، بەشـێکی بنچـینەیی ئـەرکی کۆنـدی بـوو. کۆنـدی بـەیاوەری پـۆڵ وۆڵفیتـز پاشکۆیەکیان لەگەڵ وتارەکەدا ئامادەکرد کە چەندین پرسیارو وەڵامی سـەبارەت بەهەموو ئـەو بابەتانـە لـەخۆگرتبوو کـە لـە وتارەکـەدا هاتبوونو مەبەسـت لێـی ئەوەبوو کە بوش پێداچوونەوەی بۆ بکات.

پوختـەی وتارەکـە کـە سـەبارەت بەسیاسـەتی نـاوەکی بـوو، ئـەوەبوو کـە تەرسانەی ناوکیی ئەمەریکی کەمبکرێتـەوەو ژمارەیـەکی زۆرتـر لـە چەکی قـورس لـەناوببرێنو حاڵـەتێکی ئامـادەبوونی هەمیشـەیی بنیاتبنرێـتو سیسـتەمێکی بەرگریی موشەکی پێکبهێنرێت. ئەو رۆژە بوش رایگەیانـد: " پێویسـتە ئەمـەریکا لە خێراترین ماوەی گونجاودا سیستەمێکی بەرگری موشەکی کاریگەر بنیاتبنێتو لەوەشدا پشت بەباشترین ئەو بژاردانـە ببەسـتێت کـە لەبەردەسـتدان. پێویسـتە بەشێوەیەك نەخشە بۆ سیستمی بەرگریی موشـەکیمان بکێشـین کـە هـەر پـەنجا ویلایەتەکـەمانو وڵاتـە دۆسـتو هاوپەیمانـەکان و ئـەو هێزانـەمان کـە لەپشـت دەریاکانەوە بڵاوکراونەتەوە، لە هێرشە موشەکییەکانی وڵاتە خراپـەکان، پـارێزراو بـن". سیاسـەتی گرووپـی ڤولکـان پێداگری لەسـەر پێویسـتی سـڕینەوەی عـەقڵی شەڕی ساردو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو راستییانەی پەیوەندییان بەجۆرە نوێکانی هەڕەشـەوە هەیـە، دەکاتـەوە. بـوش لـە وتارەکـەی بـەردەوام دەبێـتو دەڵێـت: " شەڕی سارد بووەتـە بەشـێك لـە ڕابـردوو، پێویسـتە لەسـەر نەتەوەکـەمان لـەبری

بايەخدان بەهەرەشە كۆنەكان، شارەزاى هەرەشە نوێكان ببێت. سەبارەت بەچەكى ناوكيش، ويلايەتە يەكگرتووەكان هەلى گرتنەدەستى جلەوى سەركردايەتيكردنى لەبەردەستدايە بۆ ئەوەى جيهانێكى ئارامتر بهێنێتەدى ئەمەش لەپێناو دانانى سيستمێكى بەرگرى دژ بەهێرشە ناوكييەكان و كەمكردنەوەى بارگرژييە ناوكييەكانە"..

هاوكات لەگەڵ بەرەوپێشچوونى هەڵمەتى هەڵبژاردنەكەدا، ئەو شێوازە نەرمو كاريگەرەى كۆندىو جۆرجى كورِ پەيرەويان كرد، هاوڕێيەتىو رێزگرتنى نێوانيانى چرِتر دەكردەوە، بەهۆى ئەمەشەوە جۆرجى كورِ هەستيكرد كە متمانەيەكى تەواوى بە كۆندى هەيە تا لەبوارەكانى ترى هەڵمەتەكەدا بەشدارييان پىَ بكات. بەوشێوەيە هەروەك ديبۆراى هاورِێى پێشبينى كرد، كۆندى بانگهێشتى چەند كۆبوونەوەيەكى ئاشكرا كرا، كە بە هيچ شێوەيەك پێشبينى نەدەكرد. زۆربەى ئەم كۆبوونەوە ئاشكرايانە پرۆگرامى (W) لەپێناو ژنان-ى لەخۆدەگرت. ئامانجێكى بنچينەيى هەڵمەتەكەى بوش راكێشانى دەنگى ژنانى حيزبى ديموكراتەكان بوو. لەو گەشتەى بەرەوى بەم پرۆگرامە دەدا، هەريەكە لە باربێرا دايكى جۆرجى كورِ، هاوسەرەكەى لاورا، لين-ى هاوسەرى ريتچارد چينى، بەشداربوون، لە ئۆكتۆبەرى ساڵى ٢٠٠٠يشدا، لەكاتێكدا گەشتەكە گەيشتە ميشيگان، پنسلڤانياو وۆسكۆنسن، كۆنديش پەيوەندى كرد بەم گرووپەوە.

پرۆگرامى (W) لەپێناو ژنان بەشێك بوو لە هەنگاوێكى تايبەت بەراستكردنەوەى ئەو هەلەيەى لە هەڵمەتو كۆنگرە نەتەوەييەكانى حيزبى كۆمارى، روويدابوو كە ئەويش درووستبوونى بۆشاييەك بوو لەنێوان هەردوو رەگەزەكەدا. باربێرا بوشو گرووپەكەى هەوڵيانەدەدا جۆرجى كورِ وەك پێشنەگێكى نوێى حيزبى كۆمارىو چاكسازو پابەندى فێركردنو تەندروستى ژنان، بناسێنن. ئەم بۆچونە زۆر پێچەوانەى ئەو كۆنفرانسە حيزبييانەى پێشوو بوون كە سيماى تورەيىو شەرِخوازىو پشتگيريكردنى بوونى چەكو رووبەرووبوونەوەى لە باربردنو مۆركێكى نێرينەيىو دەمارگيرى بۆ سپى

پێستەکانیان، پێوە دیاربوو. باربێرا پێداگیریشی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بەهۆی ئەوەی جۆرجی کوڕ بە ژنانی بەهێزو بەتوانا ئاسودەیە، کاروبارەکان گوڕانکارییان بەسەردا دێتو لە وێستگەیەکی هەڵمەتی سەرۆکایەتیدا لە بلۆبڵ لە پنسلڤانیا رایگەیاند کە جۆرجی کوڕ: "هەمیشە ژنانێك دەورەیان داوە خاوەنی زیرەکیو هێزن، هەندێك جار بە هەڵبژاردنو هەندێك جاریش بەسروشت".

بابەتی پرۆگرامی (W) لەپێناو ژنان، لە کۆنگرەی نەتەوەیی پارتی کۆماری لە فیلادێلفیا بەهێزێکی تەواوەوە دەرکەوتو لیستی وتارخوێنە سەرەکییەکانی، لاورا بوش، ئەلیزابێز دوێڵ، لین چینیو کۆندۆلیزا رایسی لەخۆگرتبوو. کۆندی لەوتارەکەیدا کە چەندین رووداوێکی تایبەتی خۆی، لەخۆگرتبوو، قسەی لەسەر کلتورە رەسەنەکەی خێزانەکەی لەرووی خوێندنو بڕیاری باوکی بۆ پەیوەندیکردن بە پارتی کۆماریو بێگەردی ئەو کاندیدەی کە بەباشی دەیناسێت، کرد. لە بەشێکی وتارەکەیدا دەڵێت: " جۆرج بوشی کوڕ، ئەو جۆرج دەبلیو بوشەیە کە دەیناسم، پیاوێکە لە بڕیاردان لەسەر کارەکان، خاوەنی توانایەکی ناوازەیە. خاوەنی وردبینیو خۆڕاگرییە، پێشی وایە ئێمەی ئەمەریکی کاتێك دەسەڵاتو هێز بەبێ هیچ خۆبادانو لەخۆباییبوونێك، بەڕێوەدەبەین، دەگەینە باشترین حاڵمان. بەشێوەیەکی روونو بە گیانێکی پۆزەتیڤەوە قسە دەکات".

ئەو کۆمێنتکارانەی یاوەری هەڵمەتەکە بوون، دەستیان کرد بە گفتوگۆکردن لەسەر پێگەی کۆندۆلیزا رایس لە ئیدارەی نوێی بوشدا. هەردوو پۆستی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییو وەزیری دەرەوە زیاتر لە پۆستەکانی تر لەلایەن ئەم کۆمێنتکارانەوە باسدەکرا. لەلایەن خۆیەوە کۆندی وا راهاتبوو خۆی لە پرسیاری رۆژنامەنووسان لەم رووەوە، لادەداو تەنها دەیوت ئاواتی گرتنەدەستی پۆستی کۆمیسیاری یەکێتیی نیشتمانیی تۆپی پێیەو لەمەشدا مەبەستی گاڵتەکردن نەبوو. جارێکیان بەیەکێك لەوانەی دیداری لەگەڵدا ئەنجامدەدات دەڵێت: " هەرکەسێك بەڕاستی من بناسێت دەزانێت کە ئەوقسەیەم زۆر راستە،

ئـەوەش دەزانێت کـە ئەگـەر ئـەم پۆسـتەم بخرێتـە بـەردەم، دەسـت لـە کـارکردن لەگەڵ حاکمـدا دەهێـنم". بـاوکی کۆنـدی پێشـتر وەك راهێنـەری یـاری تـۆپی پـێ کاریکردووە بۆیە کۆندی بەهۆی ئەوەوە لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا شارەزایی زۆری لەو یارییەدا پەیداکردووەو رەنگە زۆر لەوە زیاتر بزانێت کە شـەیدایانی ئـەم یارییـە بەدرێژایی ژیانیان دەیزانن. کۆندی زۆر حەز لە قسەکردن لەسەر وەرزش‌و گرنگـی روونکردنەوەی ئەم یارییـە وەك بەشـێکی کارای کلتـوریی وڵات دەکات، هەربۆیـە دەڵێت: "لەگەڵ ئەوپەڕی رێزمدا بۆ یاری بەیسبۆڵ، پێموایـە تـۆپی پـێ بەڕاسـتی جۆرێکە لـە ناسـودەیی نەتـەوەیی کـە بەچاوپۆشـین لـە جیاوازییـە کۆمەڵایـەتی‌و نەژادییەکان، خەڵك بۆلای یەکتر رادەکێشێت. پێموایە دامەزراوەیەکی ئەمـەریکی گرنگیشـە". لەلایـەکی تریشـەوە کۆنـدی زۆر شـەیدای بـەراوردکردنی مێـژووی سەربازیی وڵاتە بەمێژووی تـۆپی پێوەو بـەم شـێوەیە روونیدەکاتـەوە: "مێـژووی سـەربازی لـەنێوان سـودەکانی هێـرش‌و سـودەکانی بـەرگری، ئەملاوئـەولا دەکـات. تۆپی پێش خاوەنی شێوازێکی لەم شێوەیە".

کۆنـدی خـاوەنی کەسـایەتییەکی هێنـدە بـەهێزە کـە بەهۆیـەوە دەتوانێـت لــەکاتی کــارکردن لەناوەندێکــدا کــەقۆرخکراوی پیاوانــە، پارێزگــاری لەســیماو تایبەتمەندییەکانی خۆی بکات، لەمەشدا لەچەند ژنێکی تر دەچوو کە کاریـان لـە بازنەی سیاسەتی ناوخۆی بوشدا دەکرد لەوانـە کارین هۆگەر کە ماوەیـەکی زۆر راوێژکاری بوو. هەرچەندە کۆڵن پاوڵ لەبارەی کۆندییەوە دەڵێت کۆنـدی: " پـێش هەموو شتێك بۆ ئەوە پەروەردە کراوە ببێتە ژنێـك" بـەڵام ناتوانێـت ببێتـە ئـەو شـۆخە باشـورییەی چوارچـێوەیەکی دیـاریکراوی هـەبێت‌و لـە زاڵبـوون بەسـەر هەڵوێستە سەختەکاندا، پشت بەناسکییە باشورییەکەی ببەسـتێت". لەوتارێکـدا کە ئیلاین سکیولینۆ لـە رۆژنامـەی نیـۆرك تـایمزدا نووسـیویەتی‌و لـە هەفتـەکانی کۆتـایی هەڵمەتەکـەدا بڵاوکرایـەوە، هـاتووە: " ئەنـدامانی سیاسـەتی دەرەوەی هەڵمەتەکە بەبێ وەرگرتنی مۆڵەتی پێشوەختی کۆندی، جورئەتی ئەوەیان نەبوو تەنها وشەیەك بە میدیاکان رابگەیەنن". سکیولینۆ بەردەوام دەبێت‌و دەڵێت: " نەڕانـدی بەسـەرمداو پێـی وتم:"تـۆ وام لـێ دەکـەیت وەك زۆردارێـك دەربکـەوم"

بەڵام بەزەردەخەنەیەکیشەوە وتیشی: " ئێمە کارەکان بەرێکوپێکی دەکەین، ئێمە بەرێکوپێکی کارەکان دەکەین"".

سەرۆکە کۆنەکەی کۆندی، بێرنت سکۆکرۆفت ئاماژە بەوە دەدات کە بەگشتی کەسێکی نەرمونیانە بەڵام لایەنێکی توندیشی لەکەسایەتیدا هەیەو دەڵێت: "خاوەن هەڵسوکەوتێکی نەرمە، بەڵام ئەگەر کەسێك پێی وابێت دەتوانێت سنوور ببەزێنێت ئەوا ئەو کەسە هەر زوو لەوە تێدەگات کە تەنها جارێك دەتوانێت ئەوە بکات. ئەو وەك بزمار بەهێزە". رۆبەرت گەیتس کە سەرۆکی پێشووی دەزگای هەواڵگری مەرکەزییە، باس لەساتێکی کاریگەر دەکات کەتێیدا کۆندی یەکەم پۆستی لە کۆشکی سپی وەك بەڕێوەبەری کارمەندانی ئاسایشی نەتەوەیی وەردەگرێت. گەیتس ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو رۆژە کارمەندێکی وەزارەتی گەنجینە هەوڵدەدات دەسەڵاتەکەی لاواز بکات، لەبەرامبەردا کۆندی "بەبێ ئەوەی زەردەخەنەی سەر روخساری لابدات، بەشێوەیەك پەراوێزی دەخات کەدوای ئەوە دەتووت ئەو کەسە پیاوێکی بێگیانە".

پۆڵ برست کە هاڕێی بووەو کاتێك کۆندی بەڕێوبەری زانکۆ بووە، ئەم راگری پەیمانگای ماف بووە لە ستانفۆرد، دەڵێت "کەسێکی زۆر گەشبینو پراکتیکییە، ئەگەر کەسانی دەوروبەری بەجوانی هەڵسوکەوت بکەن، هەستێکی وات لەلا دروست دەبێت کە چێژ لەکارکردن دەبینێت. بەوپێیەی کە بێئەندازە نەرمونیانە، تەنها جارێك بینیومە کە بەرەقی مامەلە بکات ئەویش کاتێکبوو کە پیاوێك بەخراپی مامەلەی لەگەڵدا کرد، یان بەلایەنی کەمەوە لای کۆندی وا روونبووەوە کە سنووری خۆی بەزاندووە. کاتێك کەسێك سنووری خۆی دەبەزێنێت کۆندی لە وەڵامدانەوەی هیچ دواناکەوێت".

بوونی کۆندی وەك ژنێك لەبەرزترین ئاستەکانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتدا، خۆی لەخۆیدا کارێکی نایابە، بەڵام بەوپێیەی کە کچبوو رەهەندێکی دەگمەنتری دابووە رۆلەکەی وەك یەکێك لە گەورەترین راهێنەرانی جۆرج بوشی کوڕ لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا. لەکاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا لە ئیدارەی

یەکەمی بوش، کۆندی چەندین داواکاری هاوسەرگیری پێگەیشت، هەر ئەوکاتەش دەنگۆیەك بڵاوبوویەوە کە گوایە بەنیازە بەهۆی حەزو خواستی بۆ جێگیربوون و هاوسەرگیری، دەیەوێت بگەڕێتەوە ستانفۆرد بەڵام تائێستاش خودی خۆی هەر دەڵێت نیوەکەی تری نەدۆزیوەتەوە.

بەهەرحاڵ رەنگە رۆژێك بێت کە داواکاری گونجاوی هاوسەرگیری بچێتە بەردەم کۆندی. هەروەك لەبەشی پێنجەمیشدا باسی دەکەین، پێشتر کۆندی جارێك گرێبەستی دەزگیرانداری ئەنجامداوەو پەیوەندی لەگەڵ هەندێك پیاوی بەناوبانگدا هەبووە لەوانە یاریزانانی یەکێتیی نیشتمانیی تۆپی پێ. هاوڕێ یاریزانەکانی لە تۆپی پێ کۆندییان خستبووە ناو بازنەیەکی تری بازنە نایابەکانی ناوخۆیی ئەمەریکاوە، ئەو بازنەیەی کە هاوسەرو کچە هاوڕێکانی ئەو یاریزانانەی لەخۆگرتبوو، ئەمەش گرووپێك بوون کە پێکەوە لەکاتی یارییەکاندا کۆدەبوونەوەو سەیریان دەکرد. کۆندی جگە لەو دەزگیرانداریيە هیچ پلانێکی درێژخایەنی بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ هاوڕێکانیدا ئەنجام نەداوە. لە ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠١دا رایگەیاند: " من کەسێکی زۆر دیندارم و پێموایە ئەگەر خوا هاوسەرگیری لە چارە نووسیبم ئەوا هەر ئەویش کەسێکم بۆ دەدۆزێتەوە کە دەتوانم لەگەڵیدا بژیم". بەوپێیەی کۆندی کچە، دەتوانێت هەموو وزەکانی بۆ کارەکەی تەرخانبکات، بێگومان ئەمەش ئەو شتەبوو کە لە ناوەراستی ٢٠٠٢دا بەخەیاڵی بوشدا هات کاتێك کارین هۆگز دەستی لەکارکێشایەوەو گەڕایەوە بۆ دالاس بۆ لای خێزانەکەی.

پاش ماوەیەکی کەم لە کۆتاییهاتنی ئەو ٣٣ رۆژەی کە سیمای شلەژانی پێوە دیاربوو و راستەوخۆ دوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٠ هات، بوش دەستیکرد بەراگەیاندنی بژاردەکانی بۆ پۆستە باڵاکان و لە ١٨ی کانونی دووەمدا کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی سەبارەت بەدیاریکردنی ناوی سێ پۆست ئەنجام دا کە ئەوانیش راوێژکاری کۆشکی سپی (ئال گۆنزالیس)، راوێژکاری سەرۆك (کارین هۆگز)، راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی (کۆندۆلیزا رایس) بوون. بوش بەئامادەبووانی کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەی راگەیاند: "دکتۆر رایس تەنها

کەسێکی جوان نییە، بەڵکو کەسێکە شارەزایشی هەیە. بەڕێوەبەرێکی باشەو متمانەم بە بڕیاردانی لەسەر کارەکان هەیە. ئەمەریکا بۆی دەردەکەوێت کە ئەو کەسێکی خاوەن حیکمەتەو شەرەفێکی گەورەیە بۆ من کە پەیوەندی بکات بەبەڕێوەبردنی وڵاتەوە". دواتر جۆرجی کوڕ داوای لە کۆندی کرد تێبینیەکانی بخاتەڕوو، لەبەشێکی تێبینییەکانیدا هاتووە:

**ئێستا ساتەوەختێکی ناوازەیە بۆ ئەمەریکا، لەبەرئەوەی کاتی ئەوە هاتووە بەهاکانمان جێگیر بکەین، زۆر گرنگیشە هەمیشە ئەوەمان لەیادبێت کە بزانین ئەو بەهایانە چین لەماڵەکانماندا. لە بیرمنگهامی سەر بە ئەلاباما گەورە بوومو تاپۆلی دەیەم کەتێیدا بارمان کرد بۆ دێنیڤەر لە کۆلاورادۆ، نەچوومەتە خوێندنگەی تێکەلەوە. زۆرجار قسەوباس لەسەر ئەو پێشکەوتنە دەکرێت کە بەئاراستەی بنیاتنانی ئەمەریکای یەکرتوو، تۆمارمانکردووە. پێموایە لەماوەی سەرۆکایەتی جۆرجی کوڕدا زیاتر بەرجەستەی گرنگی بەردەوامبوون لەو پێشکەوتنە دەکەن کە لەماوەی ٣٠ ساڵی رابردوودا لەم رووەوە بەدەستمان هێناوە، دەبینن بوش ئیدارەیەکی گشتگیر بنیاتدەنێت، ئیدارەیەك کە لە هەردوو حیزبەکە پێکهاتبێت، رەنگە لە هەموو ئەوەش گرنگتر ئەوە بێت کە دەبینن ئیدارەکە پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە یەککرتووبین، بەڵام ئەگەر کەرتوپەرت بووین دەڕوخێینو من زۆر شانازی بەوەوە دەکەم کە رۆڵێك لەم ئیدارەیەدا ببینم..**

بوش لە رۆژی یەکەمی کارکردنیدا لە کۆشکی سپی واتە ٢٢ی مانگی کانونی دووەمی ٢٠٠١، سەرۆکایەتی رێوڕەسمی سوێندخواردنی ئەندامە باڵاکانی تیمەکەی کرد. رێوڕەسمەکە لەبەشی رۆژهەڵاتی کۆشکی سپی بەڕێوەچوو. لەو رێوڕەسمەدا کارڵ رۆف راوێژکاری یەکەمی بوش کە جۆرجی کوڕ بەناوی منداڵە بلیمەتەکە بانگی دەکرد، لەلای راستی کۆندییەوە وەستابوو. کۆندی دەستی راستی بەرزکردەوەو وتی:

"من، کۆندۆلیزا رایس، بەفەرمی سوێندەخۆم کە پشتگیری دەستوری ویلایەتە یەکگرتووەکان بکەمو لە دژی هەموو دووژمنێکی دەرەکی یان ناوخۆیی،

بیپارێزم. سوێندیش دەخۆم پارێزگاری لە بڕواو هەواداریی راستەقینەم بکەم بۆ ئەوەی کە باسمکرد. سوێندیش دەخۆم ئەم پابەندبوونەم ویستێکی ئازادەو بەبێ هیچ دوودڵییەك وەرمگرتووە، بەبێ ئەوەی هیچ مەبەستێکم هەبێت لە بەرپرسیارێتی رابکەم، سوێندیش دەخۆم هەموو ئەو ئەرکانەی ئەو نووسینگە بگرمە ئەستۆ کە خەریکە دەچمەناوی. خوا یارمەتیم بدات".

یەکێك لە رۆژنامەکان ئەو کارەی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی لەپشت پەردەوە ئەنجامیدەدات، بە لەقاڵبدانی سەرۆك وەسفدەکات لەرووی دارشتنی سیاسەتی وڵاتەوە. وتارێك کە رۆژنامەی **نیوبزنس** بڵاویکردووەتەوە، دەڵێت: "راوێژکارانی وەك کیسنجەرو رایس نابێت تەنها کەسایەتییەکی سەرنجراکێش بن، بەڵکو پێویستە خاوەنی توانای پێکەوەگرێدانی بیروبۆچوونو پرۆگرامە جیاوازەکانیش بن لەکاتی پێویستداو جارجارەش پێویستە پێداچوونەوە بکەن بۆ ئەوەی بەرهەمی کارەکانیان ببێتە موڵکی ئەوانەی کاریان بۆ دەکەن. بەچەند وشەیەکی سادەتر دەتوانین بڵێین سەرۆکی ئەمەریکا بەرهەمی کارێکی بەکۆمەلە کە گرووپێك کەس بەشدارییان لە پێکهێنانیدا کردووە".

بەهۆی ئەو پرسە گرنگانەی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییو سەرۆك تاووتوێی دەکەن، پێویستە ئەو دوو کەسە پەیوەندییەکی پڕ لە متمانەیان هەبێت. سەرنجدەدەین سەرۆك کۆندی بە"کەسێکی زۆر باوەڕپێکراو" لەقەلەمداوەو ئەرکی راهێنانی خۆی لە چەندین پرسی جیهانیدا خۆستووەتە ئەستۆو بەبەردەوامی لە چەندین کاردا داوای رادەربڕینی لێکردووە، ئەمە سەرباری ئەو بیروڕایانەی کە خودی کۆندی کۆیکردوونەتەوە، هەروەك چەندین جار لە چەندین ئەرکی یەکلاکەرەوەدا رەوانەی دەرەوەی وڵاتی کردووە. لێرەوە بە روونی دەردەکەوێت کە هەروەك چۆن بوشی باوك متمانەی تەواوی بە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بێرنت سکۆکرۆفت هەبوو، بوشی کوڕیش هەمان متمانەی تەواوی بە رایس هەبوو.

بوشی باوك پاش کۆبوونەوەیەکی پەیمانی ناتۆ کە لە ئایاری ساڵی ١٩٨٩دا ئەنجامدرا، نامەیەك بۆ سکرۆکرۆفت دەنووسێتو تێیدا رادەی پشتبەستنی

بەراوێژو پشتگیریی ئەو، ڕووندەکاتەوە. لە نامەکەدا هاتووە: "هەمیشە ئەو ئامۆژگارییە راستو دروستەم لەبیرە کە پێشکەشت دەکردم. سوپاسی رۆلە گرنگەکەتو پارمەتیدانەکەت دەکەم. زۆر سوپاست دەکەم کە بوویتە ئەو هاوڕێیەم کە متمانەم پێیەتی". لە پەراوێزی یەکێك لە لاپەڕەکانی یاداشتەکانیدا، بوش ئاماژەی بەوە داوە کە پشتی بە سکۆکرۆفت بەستووە. لەم پەراوێزەدا هاتووە: "هەمیشە گومانم لەوەدا هەبوو کە باشتروایە بیرنت وەزیری بەرگری بێت، بەلام پێویستم بەوە بوو لە کۆشکی سپی لەتەنیشتمدا بێت". بوشی کوڕ لەبەرامبەر کۆندی رایسدا هەمان هەستی هەبوو.

ڕەنگە کۆندی ئەوەی بەلاوە باشتر بوایە کە دوای کۆتاییهاتنی هەڵمەتی سەرۆکایەتییەکە، بەڕێوەبردنی یەکێتیی نیشتمانیی تۆپی پێ بگرێتە ئەستۆ، بەلام لەبری ئەوە، مانەوەی لەتەنیشت جۆرجی کوڕدا قبوڵکرد. ئەم بژاردەیەی کۆندی لە بەرژەوەندی پۆڵ تالیبۆ سەرۆکی هەڵبژێردراوی یەکێتی نەتەوەیی تۆپی پێ بوو کە وەك کۆمیسیاری یەکێتییەکە مایەوەو پرسی گۆڕینی نەخرایە بەرباس. نووسینگەی یەکێتی نیشتمانیی تۆپی پێ کە دەکەوێتە پارکی ئەڤینۆ لە نیۆرك، تەنها وەك خەونێك بۆ کۆندی مایەوە. هاوکات پێویستبوو خۆی بۆ گرتنەدەستی رۆڵێك ئامادەبکات کە هەر لە زووەوە بەیەکێك لە "گرنگترین پۆستەکانی حکومەتی ئەمەریکا" ناودەبرێت.

# بەشی دووەم

## میراتی ئەمەریکا

**پێکهاتە نەژاد جیاوازەکانی کۆمەڵگەی ئەمەریکا بەبێ بەهایەکی گرنگی تر ناتوانن کاریکەن کە ئەویش بڕوابوونە بەتوانای جوڵان بەرەو پێشەوە. بنەمای ئەم توانایەش بەندە بەتوانای گەڵاڵەکردنی گۆڕەپانەکە لە ڕێی فێرکردنو رۆشنبیرکردنەوە، ئەگەر فێرکردن بۆ هەمووان دابین نەکرێت ئەوا ئەم بەشەی خەونەکان لەناو دەچێت.**

### کۆندۆلیزا رایس

دیمەن: ئێستا ئێمە لە کێڵگەیەکداین کە دەکەوێتە نزیك کلینتۆنەوە لە هەرێمی گرین لە ئەلاباماو لە سەردەمی شەڕی ناوخۆداین. لەپشت ماڵە سەرەکییەکەوە چەند رووبەرێکی فراوان هەن کە زەوی خۆڵاویی رەنگ تێرن‌و بە لۆکە چێنراون، بەهۆی ئەمەشەوە هەرێمەکە ناوێکی لێنراوە کە مانای پشتێنی رەش دەدات. لەگەڵ داهاتنی تاریکیدا کەشێکی نیگەرانی، باڵ بەسەر بالەخانەکاندا دەکێشێت. خزمەتکارە کۆیلەکانی سەر بەماڵە سەرەکییەکە بەدوای شوێنێکدا دەگەڕێن کە بتوانن تێیدا زیو و ئەو شتە بەنرخانەی تری

ماڵەکە، بشارنەوە. کۆیلە نێرینەکان لە دەرەوەی ماڵەکە خواردن دەشارنەوە. بەر لەهەفتەیەك چەند دەنگۆیەك وەك ئاگری پوشوپەڵاش لە هەرێمەکەدا بڵاوبوونەوە کە ئاماژەبوون بۆ نزیکبوونەوەی سەربازە فیدراڵییەکان لەو شوێنەدا. دەنگۆکان دەیانووت ئەو سەربازانە هەڵدەکوتنە سەر ماڵەکانو ئەوەی بەرچاویان بکەوێت بەتاڵانی دەیبەن. هێشتا توندی شەڕەکە لە دۆڵی رووباری تینیسی کە ١٥٠ میل لە باکورەوە دوورە، هێورنەبووبووەوەو ئامانجی شەڕەکەش کۆنترۆڵکردنی رێگای سەرەکی باشوور بوو. تاوناتاوێك چیرۆکی ئەو کارە درندەییانە بڵاودەبوونەوە کە خێزانو کۆیلەکانیان لەسەر دەستی ئەو هێزە فیدراڵییانە رووبەڕووی دەبوونەوە کە هەڵیاندەکوتایە سەر شوێنی نیشتەجێبوونی کۆیلەو ماڵە سەرەکییەکان. لەوێ کچێکی گەنج هەبوو کە ناوی جولیا بوو، کچی خاوەن کێڵگەیەکی سپیپێستو کۆیلەیەکی رەشپێستی ماڵەکە بوو. جولیا فەرمانەکانی باوکی وەك کۆکردنەوەی ئەسپەکانو گواستنەوەیان لە گەوڕەوە بۆ شوێنێکی شارەوە کە تەنها خۆی بیزانێت، جێبەجێدەکرد.

ئەم دیمەنەی باسمان کرد دەتوانرێت ببێتە سەرەتای فیلمێك کە باس لە چیرۆکی کۆندی بکات. ئەم دیمەنە دایکی داپیرەی کۆندی پیشاندەدات کەناوی جولیا هید رایسەو منداڵێك بوو لە کێڵگەیەکی هەرێمی گرین، لەناوجەرگەی کۆیلایەتیدا، چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. دەسکەوتەکانی لە شاردنەوەی ئەسپ لەچاوی سەربازە فیدراڵییەکان، هێندە زۆر بووە کە زۆرجار لە میراتی خێزانی رایسدا باسدەکرێت. یەکێك لە کەسە نزیکەکانی کۆندی بەناوی کۆنستانس (کۆنی) رایس، باس لەوە دەکات کەزۆربەی جار کۆیلە لەخێزانەکەیدا کۆیلەی ماڵ بوون نەك کۆیلەی کێڵگە کەئەمانەش رەوشیان باشتر بوو. دایکی جولیا یەکێك بوو لەم جۆرە هەریۆیە هەندێك ماف هەبووو ئەوەی لەتوانیایدا بوو لەو مافانە لەخزمەت مندالەکانیدا بەکاریدەهێنا. فێری خوێندنو نووسین بوو، ئەوەندەی پێنەچوو حەزو خواستی بۆ باشکردنی رەوشی خۆی، بووە سیمایەکی دیاری میراتی خێزانی رایس. بەوشێوەیە پەرۆشی توند بۆ فێربون، بووە سیمایەکی هەموو تاکێکی ئەم خانەوادەیە.

جـەنگى نـاوخۆ كۆتاييهـاتو جوليـا ژيـانى هاوسـەرگيرى لەگـەڵ جـۆن ويسـڵى رايـس پێكهێنـا كـە كۆيلەيـەكى پێشـووى كاليفۆرنيـاى باشـور بـوو و خـۆى فێـرى خوێندنەوەو نووسين كردبوو. ئەم ژنو مێردە وەك دوو جوتيارى نيشتەجێى شارى يوتـاو لەئـەلاباما، كەوتنـە كـاركردن. هەرچـەندە ئـەم دوانـە پەيوەنـديان بـەهيچ قوتابخانەيەكـەوە نـەكردووە، بـەڵام توانييـان خۆشەويسـتييەكى تونـدى فێربـون لەناخى نۆ منداڵەكەياندا بچێنن، هاوكات بەشێوەيەك پەروەردەيان كردن كە ببنـە مەسـيحى ميتـۆدى. ئەنـدامانى ئـەم خێزانـە ئـەو رێورەسمانـەيان جێبەجێـدەكرد كەزۆربـەى هـەرەزۆرى رەشپێسـتە ميتۆدييـەكان لـەو سـەردەمەدا، ئـەنجاميان دەدا، هەربۆيـە بوونـە ئەنـدامى كڵێسـەيەكى ميتـۆدى سـەربە رەشپێسـتەكان. لـەماوەى دواى شـەڕى نـاوخۆدا، ئـەم گردبوونـەوە ئاينييانـە گـەورەترين كۆبوونـەوەى ئـاينى رەشپێستەكان بـوو لـە باشـوردا. ئـەم گردبوونـەوە ئاينيانـە سيسـتمێكى پوختـەو تەرخانكردووى پەرستگايى مەسيحييەكانى پێشكەش دەكرد كە پێشتر لـە باكوردا بـەزەبرى هێـز پـەيرەو دەكرا. لەسـەرەتاى سـاڵى ١٨١٦ەوە ئاينزاكانى وەك كڵێسـەى ميتـۆدى ئيبيسـكۆبى ئەفـەريقى چـەند كڵێسـەيەكى نوێيـان لەسـەراپاى ويلايەتـە يەكگرتووەكانى ئەمەريكا دروستكرد، شـوێنكەوتووانى كڵێسـەى سـەهيۆنى ميتـۆدى ئيبيسكۆبى ئەفەريكيش، لەلايەن خۆيانەوە هەمان كاريان ئەنجام دا. زانـا وتاريێـژە ئەفەريكييـەكانيش لـە باشـور ئـاينزاى تايبـەت بـەخۆيان دامەزرانـدو ناويـان نـا كڵێسـەى ميتـۆدى ئيبيسـكۆبى رەنگـاوڕەنگ، بـەڵام دواتـر ناوەكـەى بـۆ كڵێسـەى ميتـۆدى ئيبيسـكۆبى مەسيحى، گـۆڕا. شـوێنكەوتووانى ئـەم كڵێسـانە هەسـتيانكرد بەرپرسـياريتييەكى گـەورەيان لەسـەر شـانە ئـەويش يارمەتيـدانى كۆيلـە ئازادكراوەكانـە بـۆ ئـەوەى لەگـەڵ ژيـانى نـوێى ئەمـەريكادا بگـونجێن، هەربۆيـە فێركردنيـان كـردە درووشمـى سـەرەكى. سـيۆفيلۆس گۆڵـد سـتيوارد كـە يەكێكـە لەشوێنكەوتووانى كڵێسەى ميتۆدى ئيبيسـكۆبى ئەفـەريكىو لـەنێوان ١٨٦٤و ١٩١٤دا وەك وتاربێـژى مەسـيحى كـاريكردووە، كتێبێكـى بـەناوى **پـەنجا سـاڵ بانگـەواز** نووسـيوە كـە تێيـدا بـە چـڕوپڕى بـاس لـە بـەهاى فێركـردن بـۆ ئەمەريكييـە رەشپێستەكان دەكات، لەبەشێكى كتێبەكەدا هاتووە:

"زانیاری بەدەست دەهێنرێت، ئەم زانیارییەش زانینی وشەو شتەکانیش دەگرێتەوە. هەموو راستییەکی بەدەستهاتووش، چەندین بیرۆکەی نوێ دەوروژێنێتو دەبێتە هۆی فراوانبوونی مێشکی مرۆڤو تواناکانی بەهێزدەکات، بەو شێوەیە پێشکەوتن بەناڕاستەی پیاوەتی راستەقینە بەدیدێت. پێغەمبەر سلێمان دەفەرمێت: "دانایی هێزە" بایکۆنیش دەڵێت: "زانیاری دەسەڵاتە"... لە رێگەی چاندنی هێزی خوێندنەوە بەربەرییەکان گەیشتنە شارستانیەتو زەوییە لێکترازاوەکانیش بوونە لانکەی نەتەوەیەکی بەهێزو چەوساوەکانیش پێشکەوتن. ئینگلتەرا کاتێك فێرکردنی لەناو دانیشتووانەکەیدا بڵاوکردەوە گەیشتە ئەم ئاستە بەرزەی سامانو دەسەڵات. ئەمەریکاش لە رێگەی خوێندنگاکانەوە گەیشتە ئەم رەوشەی ئێستا لەرووی دەولەمەندی بێشومارو مەزنییەوە. بڵاوبوونەوەی فێرکردن لەناو خەڵکی ئەم ویلایەتو ئەو ویلایەتدا مەرجێکی پێویستی گۆڕینی بارودۆخیانە".

جۆنی کورِ کە یەکێك بوو لە کوڕەکانی جولیاو جۆن، ئەم بانگەوازەی بیستووە هەربۆیە بڕیاری دا دەست لە کێڵگە هەڵگرێتو پەیوەندی بکات بە زانکۆوە. جارێك گۆندی لەوتارێکدا لە یەکێك لە کۆنگرە نیشتمانییەکانی پارتی کۆماری، قسە لەسەر جۆنی کوڕ دەکاتو بە "باپیرە گەورەم رایس" ناوی دەباتو دەڵێت: "لە دەوروبەری ساڵی ١٩١٨دا لە رێگەی خوێندنەوە هەوڵدەدات زانیاری بەدەستبهێنێتو دەچێتە دەرەوەو بەزمانی ئەو سەردەمە پرسیاردەکاتو دەڵێت پیاوێکی رەنگاوڕەنگ، زانکۆیەکی لەکوێ دەستدەکەوێت تا پەیوەندی پێوە بکات؟. لە وەڵامدا زانکۆیەکی بچوکی پێ دەڵێن بەناوی ستیلمان کەپەیمانگایەك بوو لەدووری ٥٠ میلەوە. باپیرە گەورەم لە قازانجی لۆکە ئەوەندەی پاشەکەوت دەکرد کە قیستی فێرکردنەکەی پێ بداتو باریکرد بۆ توسکالۆزا"

پەیمانگەی ستیلمان بۆ فێرکردن لە ساڵی ١٨٧٤دا لەسەردەستی کۆمەڵێك بانگخوازی کڵێسەی مەشیەخە دامەزرا تا ببێتە خوێندنگەیەك بۆ راهێنانی بانگخوازە رەشپێستەکانی ئەم کڵێسەیە. ئەم خوێندنگەیە بەناوی دکتۆر چارلز ئەلین ستیلمانەوە ناونراوە کە سەرۆکی بۆردی دامەزرێنەرانی بوو. دوای

تێپەڕبوونی ٢٥ ساڵ بەسەر دامەزراندنیداو ماوەیەكی زۆر پێش ئەوەی جۆن رایس پەیوەندی پێوەبكات، خوێندنگەكە بوارەكانی فراوان كردو چەند بابەتێكی خوێندنی گرنگی تری لەخۆگرت. تا ساڵی ١٩٤٩ ئەم پەیمانگایە نەگەیشتە ئاستێك كەبتوانێت بڕوانامەی زانكۆ بدات بەوانەی پەیوەندی پێوە دەكەن، هەروەها نەشبووە زانكۆیەك كە خاوەنی پرۆگرامی خوێندنی چوارساڵە بێت، بەڵام یەكێك بوو لەو دامەزراوە فێركارییە كەمانەی ئەلاباما كە دەرگایان بەڕووی ڕەشپێستەكاندا دەكردەوە.

پاش تێپەڕبوونی ساڵی یەكەمی خوێندن، پارەی لۆكەكان تەواوبوون و جۆن پارەی تری پێ نەما تا قیستی خوێندنەكەی پێ بدات، لۆكەی زیاتریشی نەمابوو تا بیفرۆشێت. كۆندی باس لەو ڕووداوانە دەكات كە بوونە هۆی ئەوەی لە خوێندن بەردەوامبێت و دەڵێت: "باپیرم پرسیاری لە قوتابییەكان كرد كەچی دەكەن تا لە خوێندنگەكەدا بمێننەوە. هەندێكیان پێی دەڵێن ئەو پارەیەیان دەست دەكەوێت كە پێی دەوترێت هاریكاری خوێندن. پێشی دەڵێن ئەگەر دەیەوێت ببێتە بانگخواز ئەوا ئەویش دەتوانێت هاریكاری وەربگرێت". جۆن زۆر بەپەرۆشەوە ئەم بیرۆكەیە پەسەند دەكات.وەك ئەوەی بڵێی هەر لەسەرەتاوە خواستی ئەوەی هەبووە، بە بەڕێوەبەران دەڵێت، بیر لەوە دەكاتەوە كە ببێتە بانگخواز.

بەو شێوەیە باپیری كۆندی پرۆگرامی خوێندنی تەواوكردو بووە بانگخوازێكی مەشیەخەی. كۆندی دەڵێت: "لەو كاتەوە خانەوادەكەم بوونە شوێنكەوتووانی كڵێسەی مەشیەخەو بەشێكی زۆر خوێندیان لەوەوە وەرگرت"

لەناو خانەوادەكەدا جۆن ـی بە مام دۆك ناسراو، بانگخوازیی كردە پیشە، هاوكات لەسەر یارمەتیدانی ئەو نەوجەوانە ڕەشپێستانە بەردەوامبوو كە دەیانوویست خوێندنی زانكۆ بەدەستبهێنن. جۆن یەكەم گردبوونەوەی ئاینی لە باتۆن رۆج كە سەربە ویلایەتی لویزیان بوو، كۆتایی پێهێنا، دواتر كڵێسە ناردییە بیرمنگهام كە نزیك زێدەكەی بوو، تا لەوێ سەرپەرشتی بەشی پەیامبەرانی كڵێسەی مەشیەخەی بكات. دواجار بەهۆی هەولەكانی قەشە رایسەوە، ئەو

کلێیسە بچوکەی بیرمنگهام ناوبانگی دەرکردو بووە کلێیسەی مەشیەخەی وێستمینستەر. ئەم قەشەیە هاندانی کچ و کورە گەنجە فێرخوازەکانی بۆ پەیوەندیکردن بە زانکۆوە لەوانەش زانکۆی ستیلمان کەپێشتر خۆی لەوێ دەرچووبوو، خستبووە ریزی هەرەپێشەوەی کارەکانی. جۆن پەرۆشییەکی زۆری بۆ ئەرکەکانی هەبوو لە سوربوون لەسەر تەواوکردنی پرۆگرامەکانی خوێندن لەلایەن خوێندکارانەوە، کەسێکی بوێر بوو. سیاسەتی زانکۆی ستیلمان وابوو کە ئەگەر خوێندکارێك هەموو فیستەکانی خوێندنی نەدایە، رێگەی پێ نەدەدا تاقیکردنەوەی کۆتایی ئەنجامبدات. جۆن سەرنجی دا کە چەند خوێندکارێکی خانەوادەی رایس توانای پێدانی فیستەکانیان نییە، هەربۆیە دەستی یارمەتی بۆ درێژکردن. جۆن سالی جارێك بە پاسێکەوە ٦٠ میلی دەبڕی تا دەگەیشتە ناو حەوشەی زانکۆکە لە توسکالۆزا. نیڤلین گلۆڤەر کە یەکێکە لەو کچە خوێندکارانەی جۆن یارمەتیداون، ئەم گەشتە سالانەیە بۆ ناو زانکۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "تائێستاش لەبەرچاومە، بالابەرزێکی رێکبوو، دەموچاوێکی توندوتۆلی هەبوو، راستەوخۆ دەچووە نووسینگەی سەرۆکەوە. ئەو کاتە نەمدەزانی چی روودەدات، پیاوێکی رەشپێستبوو لەبەردەم پیاوێکی سپیپێستدا. ئەوان وا راهاتبوون کە دەیانکردە ژوورەوەو هەرچییەکی بوتایە جێبەجێیان دەکرد، لە بیرم نییە هیچ خوێندکارێك کە هاوکاری لەو وەرگرتبێت، هەلی بەشداریکردنی ئەو تاقیکردنەوانەی پێ نەدرابێت. من خۆم دەزانم کە سوکارەکانمان پارەیان ئەوەندە نەبوو کە بەشی فیستی خوێندنەکان بکات"

باپیری کۆندی هاوکات لەگەڵ ئەوەی هاوسەری هەبوو، لەشاری باتۆن رۆج دەستیکرد بەبانگخوازیی و ئامۆژگاریکردن، هەر لەو شارەش کوڕێکی بوو و ناوی نا جۆن ویسلی رایس. جۆن کار لەسەر بەهێزکردنی بڕوای کوڕەکەی دەکات و پالنەری بەهێزی سەرکەوتنی تێدا دەچێنێت، ئەم هەولانەشی بوونە هۆی ئەوەی کوڕەکەی بڕوانامەی بەرز بەدەستبهێنێت و چەندین پۆستی بالای زانکۆیی بگرێتەدەست. بەو شێوەیە ئەم پیاوەش لە بیرمنگهام بووە هێزێکی کارای تر لە رەوەندی رەشپێستەکانداو هانی نەوجەوانانی دەدا ئەو سنوورانە ببەزێنن کە

جیاوازی نەژادی بەسەریاندا سەپاندوویەتی. کۆندی لەبارەیەوە دەڵێت:"بەڕاستی بڕوای وابوو هەرچەندە بیرمنگهام شوێنێکی ئاسۆ سنووردارە بۆ منداڵە ڕەشپێستەکانی ئەو سەردەمە، دەتوانرێت بکرێتە شوێنێك بۆ خەونە بێسنوورەکان. منداڵانی بیرمنگهام بەهۆی پیاوانی وەك باوکمەوە بوو کەنەبوونە قوربانی ئاسۆ سنووردارەکان"

باووباپیری کۆندی لە هەردوو پشتی دایكو باوکییەوە لە چەندین شتدا لەیەك دەچن لەوانە، هەردوولایان پابەندبوون بەپشتبەخۆبەستنو فێربوونەوە. باپیرە گەورەی لەدایکییەوە، کۆیلەی پیاوێکی سپیپێست بووەو لە کچێکی کۆیلە کە لەماڵەکەیدا کاریکردووە، کوڕێكو دوو کچی بووە. هەمان شتیش بۆ نەنکی باپیری کۆندی لەباوکییەوە ڕاستە. نەنکی باپیری دەچێتەوە سەر خێزانێکی خوێندەوارو کچە خزمەتکارێکی خۆشەویستی ماڵێك بووە. ئەم ژنە خاوەنی خەونێکی باڵا بووە بۆ منداڵەکانیو دوو کچەکەی کەدەکاتە پوری دایکی کۆندی، بڕوانامەی پەرستیارییان لە پەیمانگای پۆکەرتی واشنتۆن توسکیجی، کە یەکێکە لە پەیمانگا پێشکەوتووەکانی باشور، بەدەستهێناوە.

واشنتۆن فەلسەفەی فێربوونەکەی لەو ئەزموونانەوە وەرگرتبوو کە مامۆستاو خوێندکاری پەیمانگای هامپتۆن بوو لە ڤێرجینیا، بەدەستیهێنابوو و لە ساڵی ١٨٨١دا پەیمانگاکەی بە پێشکەشکردنی چەند خولێکی ڕاهێنانو فێرکاری بۆ ڕەشپێستەکان، دەستپێکرد. ئەو ئەرکەی واشنتۆن لەسەر شانی دانابوو، پەرەپێدانی کەسایەتی ئەخلاقیو پێودانگە باڵاکانی جوانیی هەڵسوکەوتو پاکیزەیی بوو لەناو خوێندکارەکانیدا. واشنتۆن پێیوابوو ئەم هۆکارە شارستانییە فێرکردنێکی تەواوی ڕەشپێستەکان لەخۆدەگرێتو دەبێتە هۆی یارمەتیدانیان بۆ ئەوەی پاش دەستکەوتنی لێهاتوویی کردەییو بێگەردیی کۆمەڵایەتی، بۆ کۆمەڵگاکانیان بگەڕێنەوە. واشنتۆن ئەو فێرکردنەی خوێندکار لە پۆلەکاندا لەگەڵ ئەو ڕاهێنانی پراکتیکی خوێندکار لەناو پەیمانگا بۆدابینکردنی قیستی خوێندنەکەی ئەنجامی دەدات پێکەوە دەبەستەوە، زۆرجار لە ڕێگەی ئەو کارانەوە دەستیان دەکەوێت، کە بەئامانجی دابینکردنی قیستی خوێندنەکەی.

بەم شێوازە واشنتۆن دەیویست بەشداری لە چەسپاندنی "نەریتی پاشەکەوتکردن‌و کارکردن‌و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی موڵك‌و ماڵی تایبەتی‌و کردنەوەی ژمارەی بانکی لەلایەن خوێندکارە رەشپێستەکانەوە،دروست بکات".

کۆندی باس لەوە دەکات کە هەردوو پورەکەی دایکی، لەدەرچووە پێشەنگەکانی پەیمانگای تۆسکیجین بوون کەبەوەش بوونەتە یەکەم دوو پەرستیار لە خێزانی رایدا. براکەیان کە ناوی ئەلبێرت رۆبنسۆن رای سێیەم بوو (واتە باپیری کۆندی)، بەوە ناسراو بوو کە پیاوێکبوو زۆر شانازی بەخۆیەوە کردووە، هاوکات پیاوێك بوو کە زۆر پابەندبوو بە ئەرکەکانییەوە. ئەلبێرت لەتەمەنی ١٣ ساڵییەوە ماڵەکەی جێدەهێڵێت‌و دەستدەکات بە کارکردن لە کانەکانداو کاتێکیش خۆی‌و خێزانەکەی گەورە بوون، دەستیکرد بەبنیاتنانی ماڵ‌و کارکردنی شێلگیرانە تابووە یەکێك لە رەشپێستە دەولەمەندەکان. کۆندی دەڵێت: "ئەلبێرت رای لە سێ پیشەدا کاری دەکرد، بەڵێندەری کان بوو، ئاسنگەریش بوو، رۆژانی شەممەش بینای دروستدەکرد". یەکێکی تر لە سیماکانی بنەماڵەی رای ئەوەبوو کە ئەوان لە ریزی پێشەوەی ئەو خێزانە رەشپێستانە بوون، کە توانیان ببنە خاوەنی ئۆتۆمبێل. ئەلبێرت سووربوو لەسەرئەوەی کە هیچ یەکێك لە منداڵەکانی وەك خۆی لە کانەکاندا کارنەکەن، هەربۆیە لەگەڵ هاوسەرەکەی بەناوی ماتی لولا هەموو هەوڵێکیان خستەگەڕ تا بتوانن پێنج منداڵەکەیان بگەیەننە زانکۆ. کۆندی دەڵێت: "کاتێك هەلاوسانی ئابوریە گەورەکە رووی کردە ناوچەکە، خێزانەکەمان توانی لە رێگەی ئەو پارەیەی پاشەکەوتیان کردبوو و لەناو جێگەی خەوتندا شاردبوویانەوە، ماڵ بکرن"

باپیرو نەنکی کۆندی منداڵەکانیان لەو سیاسەتی جیاکارییە نەژادییە دەپاراست کە لە ناوچەی بیرمنگهام گەیشتبووە لوتکەو لە هەموو شوێنێکدا جێبەجێ دەکرا بەو دەستشۆرانەشەوە کە بۆ رەنگاورەنگەکان دابین کرابوون، هەروەها لەسەرچاوەکانی ئاوو ئەو پاسانەی لە شارەکەدا دەرۆیشتن. ئاڵتۆ کە یەکێکبوو لە کورەکانی رای‌و خاڵی کۆندی بوو، ئەوەی لەبیرە کە باوکی داوای

لەخۆی‌و براكانی دەكرد تا دەگەڕێنەوە ماڵەوە دەست بەئاو نەگەیەنن، هەروەها داواشی لێدەكردن كە لەبری ئەوەی بڕۆنە ئەو شوێنە گشتییانەی جیاكاری نەژادیان تێدا جێبەجێ دەكرێت، خواردنەوە لەماڵەوە بخۆنەوە. ئالتۆ دەڵێت: "لەڕاستیدا من بەدرێژایی ژیانم نەچوومەتە پاسەوە، یان بەلایەنی كەمەوە پاسێك كەجیاكاری نەژادی جێبەجێكردبێت".

ئەلاباما بە یاسا تایبەتەكانی بەڕەشپێستەكان، بەناوبانگ بوو، ئەو یاسایانەی لەویلایەتەكەو شارەكەش جێبەجێ دەكران‌و بەو یاسایانەی جیاكاری نەژادی ناسرابوون كە لەسەردەمی جیم كرۆ-دا باوبوون. دەستەواژەی جیم كرۆ كە گوزارشت لە سیاسەتی جیاكاری نەژادی دەكات، لە یەكێك لەو كەسایەتییانە وەرگیراوە كە نمایشی ئەو نەكتەرە كۆمیدییانەی دەكرد دەمامكی رەشیان بەكاردەهێنا، ئەم كەسایەتیە ئەكتەرێكی سپیپێست كەپێی دەووترا توماس دادی رایس، دایهێنابوو. سیاسەتی جیاكاریی نەژادیی جیم كرۆ تەنها كۆمەڵە یاسایەك نەبوو، بەڵكو زیاتر شێوازێكی ژیان بوو كە چەندین پێودانگی هەڵسوكەوتی نەنووسراوی نێوان سپیپێست‌و رەشپێستی لەخۆگرتبوو. ئەم پێودانگانە پشتی بە بیروباوەڕێك بەستبوو كە دەیوت رەشپێستەكان لەڕووی ئایدۆلۆژیاو شارستانییەوە پلەیان لە سپیپێستەكان نزمترە، ئەمەش ئەو بیروباوەڕەبوو كە لە كۆمەڵگەی باشوردا باوبوو، لەلایەن كڵێسەو زانكۆكانیشەوە، بانگەشەی بۆ دەكرا. یاساكانی جیاكاری نەژادی كۆمەڵێك قەدەغەكراوی كۆمەڵایەتی لەخۆگرتبوو، لەوانە پیاوی رەشپێست بۆی نییە تەوقە لەگەڵ پیاوی سپیپێستدا بكات، هەروەك ناشتوانێت دەست بەڕووی ژنێكی سپیپێستدا درێژبكات بۆ ئەوەی تەوقەی لەگەڵدا بكات، بەپێچەوانەوە ئەگەر شتی وا بكات ئەوا ڕووبەڕووی تۆمەتی هەوڵدان بۆ لاقەكردن دەبێتەوە. یەكێكی تر لەو یاسایانە ئەوەبوو ئەگەر كۆمەڵێك رەشپێست‌و سپیپێست لەسەر خوانێك كۆبوونەوە، پێویستە سەرەتا خواردن پێشكەش بەسپیپێستەكان بكرێت. هەر بەپێی ئەم یاسایانە ژن‌و مێردی رەشپێست بۆیان نەبوو بە ئاشكرا یەكتر ماچ بكەن یان وەسفی یەكتر بكەن. هەروەك شۆفێرەكانیان مافی ئەوەیان هەبوو لەكاتی رۆشتن لە فولكەكاندا

پێش رەشپێستەکان بکەون، هەروەها سپیپێستەکان پابەندنین بەوەی رەشپێستەکان بەنازناوی بەرێز، خاتوون، یان خان بانگ بکەن بەڵکو تەنها بەناوی یەکەمیانەوە بانگیان دەکەن. لەبەرامبەردا رەشپێستەکان پابەندن بە بەکارهێنانی ئەو نازناوانەی کە گوزارشت لە رێز دەکەن لەکاتی قسەکردن لەگەڵیاندا. هەر بەپێی ئەو یاسایانە رەشپێستەکان لەکاتێکدا کە سواری ئۆتۆمبێلێك دەبوون کە شۆفێرەکەی سپیپێست بێت، دەبوایە لەسەر کورسییەکانی دواوە دابنیشن، ئەم یاسایەش بۆ بارهەڵگرەکانیش راست بوو... و چەندین یاسای تری لەو بابەتە. ئەم یاسایانە لەشێوەی بلاوکراوەو پۆستەردا لە هەموو شوێنە گشتییەکانی سەرجەم شارەکانی باشووردا لەوانەش شاری بیرمنگهام بلاودەکرانەوە. ئەم بلاوکراوانە لەریستورانتو وێستگەکانی شەمەندۆفێردا بلاودەکرانەوەو ئاماژەیان بەجیاکردنەوەی ئەو خزمەتگوزارییانە دەکرد کە بۆ رەشپێستەکان تەرخان کرابوون لەوانەی کە تایبەتبوون بە سپیپێستەکان .

بەهاتنی ساڵی ١٩١٤، سەرجەم ویلایەتەکانی باشوور دەستیانکرد بە پەیرەوکردنی ئەو یاسایانەی بەیاسا رەشەکان ناسراون، ئەمانەی خوارەوەش ئەو یاسایانەن کە تایبەتبوون بەویلایەتی ئەلاباما:

پەرستیار: هیچ کەسێك یان دامەزراوەیەك بۆی نییە هیچ پەرستارێك ناچار بکات کاری پەرستاری لەو ژوورو هۆڵی نەخۆشخانانەدا بکات کە پیاوی رەشپێستی لێیە، جا ئەو نەخۆشخانانە گشتی بن یان تایبەت.

پاسەکان: داوا لە هەموو وێستگەکانی گواستنەوەی نەفەری سەربە هەموو کۆمپانیایەکی گواستنەوەی میکانیکی دەکرێت، ژووری چاوەڕوانی جیاجیا ئامادەبکات، پێویستیشە لەسەریان پەنجەرەی بلیتبڕینی سپیپێستەکان لە هی نەژادەکانی تر جیاواز بێت.

هێلە ئاسنینەکان: ئەو کەسانەی بلیتی گواستنەوە دەدەن بەگەشتیارەکان دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە شوێنی گەشتیارەکە کنتۆنەکان یان شوێنی گەشتیارەکە لەناو کانتۆنێکی دیاریکراو دیاری بکاتو پێویستە ئەم کارە ئەنجام بدات

بەتايبەت ئەگەر گاليسكەكان جياكرابنەوە، ئەوا شوێنی گەشتيارەكان بە جۆرێك جيا بكەنەوە كەهەر نەژادێك شوێنی جيای خۆی هەبێت.

چێشـــتخانەكان: لەكاتێكـــدا خـــوانی سپيپێســـتەكانو ئـــەوانی تـــر بەجياكەرەوەيـەكی پتـەو جيانەكرابنـەوە، ئيـدارەی چێشـتخانەكان يـان هـەر شـوێنێكی تـری تايبـەت بـە پێشكەشـكردنی خـواردن لەشـارەكە، بۆيـان نييـە لەهەمان ژووردا خواردن پێشكەش بە سپيپێستو نـەژادەكانی تـر بكـەنو ئەگـەر شـتی وا بكـەن ئـەوا كـارێكی ناياسـاييان كـردووە. پێويسـتە جياكەرەوەكـەش لـە زەوييـەوە تـا بـەرزی حـەوت پـێ يـان زيـاتريش بێت، هـەروەها پێويسـتە بـۆ هـەر بەشێكی چێشتخانەكە دەروازەيەك لە شەقامەكەوە تا ناو بەشەكە هەبێت.

يانـەو ژوورەكـانی يـاری بليـارد: كۆيلـەی رەشپێسـتو سپيپێسـت بۆيـان نييـە پێكەوە يـاری بكـەن، ناشـتوانن لـە چوارچێوەی تيمێكی يـەك ياريـدا ياريبكـەن، هـەروەك بۆشـيان نييـە پێكـەوە لـە يانەيەكـدا بـن يـان لـە ژوورەكـانی بليـارددا پێكەوە ياری بكەن.

دەستشـۆری پيـاوان: پێويسـتە لەسـەر هـەموو خاوەنكارێـك كـە كارمەنـدی سپيپێسـت يـان رەشپێسـتی هـەبێت، دەستشـۆری جيـای هـەبێت بـۆ كارمەنـدە سپيپێستو رەشپێستەكان.

باپيرو نەنكی كۆندی بە گوێرەی توانای خۆيان كاريـان لەسـەر ئـەوە كـردووە كـە منداڵـەكانيان لـەو دياردانـەی كۆمەڵگـە بپـارێزن. بـۆ نموونـە رێگـەيان بەمنداڵـەكانيان نـەدەدا كـار لـە مـاڵی سپيپێسـتەكاندا بكـەن تـەنها لەبەرئـەوەی داهاتی خێزانەكە زياتربكەن. شايانی باسە منداڵـە رەشپێسـتەكانی بيرمنگهـام لـە ســاڵەكانی ســیو چــلەكانی ســەدەی رابــردوودا بەشــێوەيەكی گشــتی وەك پاككـەرەوەی ماڵـەكانی سپيپێسـتەكان كاريـان دەكـردو ئەمـەش شـتێكی بـاوبوو، بـەڵام ئـەم نەريتـە بەسـەر ئەنـدامانی خێزانـی رايـدا جێبـەجێ نابێت. كۆنـدیو كچــەكانی پــوری، هەميشــە لەســەر ئــەوە راهــاتبوون كــە گوێيــان بــۆ ئاگاداركردنەوەكانی باپيرە دەگرت كە يەكەم ياسای رێنـوێنيكردنی بـۆ هـەموويان ئەمەبوو: "هەميشە ئەوەتان لەياد بێت كە ئێوە سەربە خێزانی راين".

کۆنـدی لەمیانـەی سـەرنجدانی لـە هەڵسـوکەوتی ئەنـدامانی باپیرەیـەوە لـە هـەردوو پشـتەوە، گەیشـتووەتە ئـەو بڕوایـەی کـە خـودی خۆیـان، خۆیـان لـە کۆمەڵگەکـەی دەوروبـەریان رزگـار کـردووە. دەڵێـت: "سـەرەڕای ئـەو رەوشـەی لـەو سەردەمەدا باوبوو، ئەوان توانییان یاسا باوەکان بشـکێنن‌و چۆنیەتی چێژوەرگرتن لـە ژیـانێکی ئاسـودەی لێوانلێـو لـە دەسـکەوت، بدۆزنـەوە. هـەرگیز هەسـتیان بـەوە نەکردووە کە کۆتوبەندکراو بن" لە وتارێکدا کە بۆ خوێنـەرە تازەپێگەیشـتووەکانی بیرمنگهام نووسـیویەتی‌و لـە رۆژنامـەی بیرمنگهـام نیـوزدا بڵاوکراوەتـەوە، دەڵێـت:" ئەگەر کاتی تەواو بـۆ فێربـوون لـەم کەسـە ئاساییانە تـەرخان بکـەن، ئـەوا زۆرتـرین بیرۆکە خراپەکانی ئەم سەردەمەمان رەتدەکەنـەوە، ئـەو بیرۆکانـەی کـە پێیـان وایـە گوزەرانی هاوچەرخی من‌و ئێوە لـە ژیـانی باووباپیرانمـان قورسـترە ...ئـەوان کۆمـەڵە ژن‌و پیـاوێکبوون کـە دیاردەکـانی بێبەشـکردنیان لـە دەوربەرەکـە رەتـدەکردەوە، بەشـێوازێکی زۆر سەرسـوڕهێن توانیویانـە بـە درێـژایی مێـژوو جـار لـەدوای جـار رەوشی ژیانیـان بگـۆڕن. ئەوانـەن کەسـەرکەوتنە تایبەتـەکانیان بوونـە هـۆی ئـەوەی وڵات بخەنە سەر رێگـەی پێشـکەوتن". یـەکێکیش لـەخزمانی کۆنـدی بـەناوی کـۆنی رایس دەڵێت:" باووباپیرانمـان خـاوەنی ئـەو بیروبۆچوونە مەزنـە بـوون کـە دەڵێـت: "رەگەزپەرستی شێوازێکە جیهان هەڵیبـژاردووە، بـەڵام هـیچ پەیوەندییـەکی بـەوەوە نییـە کـە تـۆ بتوانیـت هەمیشـە لەهـەر کارێـك کـە هەڵیدەبـژێریت لـە ژیانتـدا، سـەرکەوتوو بیـت". باوباپیرانمـان پێیان‌وابوو کـە ژیـان سیسـتەمێکە داوات لێـدەکات هەموو رۆژێك کتێبێك بخوێنیتەوە، هاوشانی ئاین، ئاین، ئاین".

ئەنجێلینا کە یـەکێکبوو لـە کچەکانی ئـەلبێرت‌و مـاتی رای، وەك خوێنـدکارێکی لێهاتووی ژەنینی پیانۆ دەرکەوت‌و بەمەبەسـتی بەدەسـتهێنانی مۆڵـەتی فێرکردنـەوە، پەیوەندی کرد بە زانکۆوە. ئـەنجێلینا لـە خوێندنگـەی بـاڵای پیشـەسـازی فایەرفایڵد دەسـتیکرد بـە وانـە وتنـەوەی موزیـك‌و زانسـتەکان، زۆربـەی خوێنـدکارەکانی ئـەم خوێندنگایـــە کـــە دەکەوێتـــە کـــەناری باشـــوری خۆرئـــاوای بیرمنگهـــام‌و لەســـەر تەپۆلکەیـەکی بـەرز کـە بەسـەر چـەند کارگەیـەکی پـۆڵادا دەڕوانێـت، دروسـتکراوە، رەشپێستبوون.

ئەنجێلینا لەماوەی وانە وتنەوەیدا لە خوێندنگەی پیشەسازی فایەرفێڵد، لەگەڵ بانگخوازێکی لاوی کڵێسەی مەشیەخیەی بەناوی جۆن ویسلی رایس یەکتر دەناسن کە ئەمیش بەمەبەستی بەدەستهێنانی داهاتێک کە ببێتە تەواوکەری ئەو موچەیەی وەك بانگخواز وەریدەگرت، لەهەمان خوێندنگەدا وانەی دەووتەوە، ئەمەش پیشەی زۆربەی بانگخوازەکانی ئەو سەردەمەبوو. جۆن ویسلی رایس هاوکات وەك یاریدەدەری راهێنەری تیپێکی تۆپی پێش کاریدەکردو لە دەرەوەی کڵێسەو خوێندنگەی بالای فایەرفێڵدیش وەك راوێژکارێکی رێبەر لە خوێندنگەی دواناوەندی ئۆڵمان کە دەکەوێتە ناوەڕاستی بیرمنگهامەوە، کاریدەکرد.

جۆن لە ٣ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢٣ لە شاری باتۆن رۆج لەدایکبووە. جۆنو خوشکەکەی بەناوی ئەنجێلا تێرێزا لە ئامێزی دایكوباوکیان بەناوەکانی جۆن ویسلی رایسو تیریزا هاردنت پەروەردەکراونو هەر لەو شارە هەردووکیان پەیوەندییان کردووە بەیەکێك لە خوێندنگە فەرمییەکانەوە. پاش ئەوەی خوێندنی دواناوەندی تەواودەکات، جۆن پەیوەندی دەکات بەو زانکۆیەی پێشتر باوکی تێدا فێربووە واتە زانکۆی ستیلمان لە تۆسکالۆزا، بەلام ئەوەندەی پێناچێت لەوێ دەڕواو پەیوەندی دەکات بە زانکۆیەکی تری سەر بە کڵێسەی مەشیەخیەی کە زۆربەی خوێندکارەکانی رەشپێستن ئەویش زانکۆی جۆنسۆن س. سمیس ـە کە دەکەوێتە شاری شارلۆتی سەر بەکارۆلینای باکورەوە. ئەم خوێندنگا مێژووییە لە ساڵی ١٨٦٧دا لەسەر دەستی چەند بانگخوازێکی سەر بە کڵێسەی مەشیەخیەی دامەزراوەو وەك خوێندنگەیەکی دواناوەندی بالای بچوكو پەیمانگایەکی ئینجیلی، دەستیکردووە بەکارکردن. لە بیستەکانی سەدەی رابردوودا ئەم خوێندنگایە فراوانبوو و بووە کۆلێژێکی خاوەن پرۆگرامی چوارسالەو هونەرە ئازادەکانی تێدا دەخوێندرا، هەر لەو ماوەیەشدا ناوەکەی گۆڕاو ناوی یەکێك لەو خۆبەخشە بەسالاچوانەی لێنرا کە پشتگیرییان دەکرد.

پاش ئەوەی بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زانکۆی سمیس بەدەستهێنا، جۆن دوو ساڵی تری خوێندو لە ساڵی ١٩٤٨دا کە هێشتا تەمەنی ٢٤ ساڵ بوو، بڕوانامەی

ماستەری لە زانستی ئایندا بەدەستهێنا. هەر لە باتۆن رۆج، سەرۆکایەتی یەکەم کۆمەڵگەی ئاینی کردووە، دواتر لە ساڵی ١٩٥١دا رۆشتووەتە بیرمنگهام تا لەوێستمنستەر سەرپەرشتی مەترانیەتی کڵێسەی مەشیەخیەی بکات کە مەترانیەتێك بوو لەلایەن باوکییەوە چاودێری دەکرا. کاتێك جۆن گەیشتە باڵەخانە نوێکە کە لەبەردی سوور دروستکرابوو و دەکەوێتە شەقامی شەشەمی باشورەوە، دەبینێت بەتەواوەتی بۆ کارکردن، ئامادەکراوە.

ئەنجێلا تێریزا رایس لۆف کە خوشکی جۆن‌و پوری کۆندی بوو، بەمەبەستی پەیوەندیکردن بە زانکۆی ویسکۆنسنەوە، لویزانا بەجێدەهێڵێت‌و لەوێ بڕوانامەی دکتۆرا لە ئەدەبی ئینگلیزی بەدەستدەهێنێت. ئەنجێلا پسپۆڕی لە ئەدەبی ڤیکتۆریدا بەدەستدەهێنێت‌و وەك پرۆفیسۆرێك لە زانکۆی ئیدواردسڤیل لە ئیلینۆی باشور، دەستدەکات بە وانە وتنەوەو هەرلەوێ لە ساڵی ١٩٨٩دا خەڵاتی باشترین مامۆستای ئەو زانکۆیە بەدەستدەهێنێت. ئەنجێلا کتێبێکیشی بەناوی چارلز دیکنزو حەوت هەڵە کوشندەکە بڵاوکردووەتەوە، کە لێکۆڵینەوەیەکە سەبارەت بە دیکنزو لە ساڵی ١٩٧٩دا چاپخانەی ئینتەرستایت بڵاویکردووەتەوە. یەکێك لە کچە هاوکارەکانی کە پرۆفیسۆر بیتی ریتچاردسۆنە- ە ئەوەی لە بیرە کە تیریزا پێش ئەوەی بچێتە ئیلینۆی، بەشێکی زۆری کاتەکانی لە ئامادەکردنی پرۆگرامی خوێندن بۆ خوێندنگەی رەشپێستەکان لە باشور، تەرخانکردووە. بیتی بەتوندی لەپێناو تەرخانکردنی بودجەی دابینکردنی دارایی بۆ پرۆگرامەکانی خوێندن، تێکۆشاوەو بەوەش لەو ماوەیەدا پێشکەوتنی ئەکادیمی تایبەتی خۆی پشتگوێخستووە. بیتی دەڵێت: "دکتۆر لۆف زۆر بەتوندی پابەندی خوێندنە ئەفەریقی-ئەمەریکییەکانی بووەو خۆشی بۆ خوێندکارەکانی تەرخانکردبوو. ژنێك بوو هەولە پیشەییەکانی جگە لە بڵندترین رێز، شیاوی هیچ شتێکی تر نەبوو. زۆرێك لەکاتەکانی لەباشور بەئامانجی ئامادەکردنی پرۆگرامی تایبەت بەخوێندنگەی رەشپێستەکان، تەرخان کردبوو، ئەمەش کارێك بوو لەو سەردەمەدا باو نەبوو".

کاتێك جۆنو ئەنجێلینا بەیەك گەیشتن بۆیان دەرکەوت لە باوەڕی قوڵو خۆشەویستی بۆ فێرکردنو پابەندبوون بەتوانا پیشەییەکانیان، هاوبەشن. هەردووکیان خاوەنی هیواو تموح بوون بۆ فێرکردنی زانکۆییو پارمەتیدانی تازەپێگەیشتوانی تیتۆسڤیل، هەردووکیشیان دەیانوویست خێزانێك پێکەوە بنێن. ئەوەبوو لەسەرەتاکانی پەنجاکانی سەدەی رابردوودا چوونە ژیانی هاوسەرگیرییەوە. ئەنجێلینا بە کچێکی قەدو باڵاڕێكو خاوەن پێستێکی رەنگکراوە وەسفدەکرێت، کچێك کە زۆر زەحمەتبوو بەلایەوە لە ماتی-ی خوشکی جیاببێتەوە (کە بەناوی دایکیشیەوە ناودەبرا). هاوڕێکانیان هەمیشە بەدوانە بانگیان دەکردن لەبەرئەوەی جلوبەرگی هاوشێوەیان لەبەردەکردو زۆر شتیان پێکەوە ئەنجامدەدا. کۆنی رای کە هاوسەری براکەی بوو، دەڵێت: " ئەنجێلینا زۆر جوان بوو، زۆر رێکپۆش بوو". کۆندیش لەبارەی دایکیەوە دەڵێت هەمیشە جلی زۆر جوانی لەبەردەکرد.

هاوسەرگیری جۆنو ئەنجێلینا بنەچەی دوو خێزانی پێکەوە گرێدا کە زۆر بڕوایان بەئاینو ئەو سەرکەوتنەوە هەبوو کە لەڕێگەی فێربوونەوە بەدیدێت. یەکێك لە ڕۆژنامە سیاسییەکان کۆندی بە "وێنەیەکی نموونەیی بۆ بەرزترین پلەی سەرکەوتن لە ئەمەریکا"وەسفکردووەو دانیشی بەوەدا ناوە کە کۆندی بەرهەمی میراتی خێزانێکە کە رۆشنبیریو فێربوونی لە ڕیزی پێشەوەی کارەکانیدا داناوە. هێڵی سەرکەوتن لەم خانەوادەیەدا لەماوەی سێ نەوەدا لە ئاستی بەرزدا ماوەتەوە، ئەو نەوانەی هەموویان خوێندنێکی باشی زانکۆییان تەواوکردووەو چەندین بانگخوازو پرۆفیسۆرو پارێزەریان تێدا هەڵکەوتووە. کۆندی لە لێدوانێکدا بۆ ڕۆژنامەی فاینانشەڵ تایمز دەڵێت: "بەم شێوەیە هیچ گومانی تێدا نییە کەدەبوو من بگەمە ئەو ئاستەی ئێستا پێی گەیشتووم".

کویت بلاکەر کە پرۆفیسۆرێکی زانکۆی ستانفۆردەو هاوڕێی کۆندییە دەڵێت:"زۆر خێزانی ئەمەریکی ناناسم کە دەتوانن بڵێن تەنها باوکیان نییە کە زانستیان لە زانکۆکانەوە وەرگرتووە، بەڵکو باوو باپیرانیشیان وان، ئەمە سەرەڕای هەموو خزمەکانیان بەپورو خالەکانیشیانەوە". زۆرێك کاتێك دەزانن

کە کۆندی لە بیرمنگهام گەورە بووە، پێیان وایە لەکاتی منداڵیدا لە زۆر شت بێبەش بووە. ئەم کەسانە لەو بڕوایەشدان کۆندی کاتێك توانیویەتی بەچانسی خۆی بگات کە بزوتنەوەی مافە مەدەنییەکان، بەرهەمی کەوتەبەرچاو، بەڵام ئەمە بەسەر کۆندیدا جێبەجێ نابێت، بەڵکو وەك خودی کۆندی هەمیشە دوپاتیدەکاتەوە، هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ میراتی خێزانەکەی نەك خەباتی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان.

هەر لەکاتی لەدایکبونی کۆندییەوە، جۆن و ئەنجێلینا بەبایەخەوە کاریان لەسەر چەسپاندنی هەموو پشتگیرییەکی خێزانیی و هێزو سەربەرزی و بڕوابوون بەخواو هەستکردن بەبەرپرسیارێتی لە کچەکەیاندا کردووە، ئەمەش سیمای دیاری ئەم ژن و مێردەبوو. کۆندی لەوبارەیەوە دەڵێت: " دەیانوویست هەموو ئەو شتانەی دەستبکەوێت کە لە جیهاندا هەن، دەیانوویست رایس لەهەر جۆرە کۆت و بەندێکی ئایدۆلۆجی یان ماددی رزگاری ببێت، دەشیانوویست ببێتە خاوەنی جیهان. ئەگەر دەتەوێت هەموو ئەمانە بدەیتە کچەکەت دەبێت تامردن خۆشت بوێت و وای لێ بکەیت بڕوا بەوە بکات دەتوانێت بفڕێت".

# بەشی سێیەم

## سەرکەوتنی چەندجارە

**دایك‌وباوکم وایان لێکردم بڕوایەکی چەسپاوم هەبێت لەوەی ڕەنگە نەتوانم لەفەیەك هەمبەرگرم لە چێشتخانەکانی وڵۆرس دەستبکەوێت، بەڵام دەتوانم ببمە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان.**

### کۆندۆلیزا رایس

کۆنـدی لەبەیانییـەکی یەکشـەممەدا لەکاتێکـدا بـاوکی لەوێستمینسـتەر سـەرۆکایەتی کۆنوێـژی سـەعات ١١ی دەکـرد، لـەدایکبووە. ئـەم سـاتەوەختە زۆر گونجاوبوو بۆ چاوهەڵهێنانی منداڵی دایك‌وباوکێکی زۆر ئیماندار لە جیهانـدا. ئـەو بەیانییە ئامادەبووانی کڵێسەکە سەیری کورسییە بەتاڵەکەی ئەنجێلینایان دەکرد کـە لەپشـتی ئـامێری ئۆرگـەوەبوو و لـەنێوان خۆیانـدا پرسـیاریان سـەبارەت بەڕەوشی دەکردو بەبێدەنگی سروتیان دەخوێند لەپێناو ئەوەی ڕەوشی باشبێت. ئـەمان دەیـانزانی قەشـە رایـس دەیوویسـت کـوڕێکی ببێـت یـاری تـۆپی پـێ یـان بەیسبۆڵ یان تۆپی باسکە، بکات. کوڕێك بتوانێت بەشداری لەهـەموو جۆرەکـانی وەرزشدا بکات. بەڵام ئەگەر منداڵەکە کچبوو ئـەوە ئـەویش زۆر بـاش دەبێـت....، چونکە هەرچییەك لەلای خـواوە بێـت کـاری بـەخێرە. لـە ١٤ی نۆڤەمبـەری سـاڵی ١٩٥٤ ئەنجێلینا کچێکی بوو کە ناوینا کۆندۆلیزا.

جۆن رایس ماوەی ١١ ساڵ لە کڵێسەی مەشیەخیەی وێستمینستەر، لە بانگخوازیی بەردەوامبوو و بەهۆی ئەمەشەوە ئەو کڵێسەیە ببووە ماڵی دووەمی کۆندی. لەکاتی لەدایکبونی کۆندیدا، خێزانەکەی لەشوێنی تایبەت بەچاودێری کڵێسەدا دەژیان کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك ژوورو بەبینای کڵێسەکەوە لکابوون. دواتر کڵێسەکە ماڵێکی نوێی بۆ قەشە دروستکرد کە ئەوەندەی هەشت بالەخانەی نیشتەجێبوون لە باشوری کڵێسەکەوە دووربوو ئەویش پێی دەوترا ماڵی ژمارە ٩٢٩ی سەنتەر وای، بەم جۆرەش خێزانی رایس تیایدا نیشتەجێ بوون. ماڵە بەردینە بچوکەکە کەوتبووە گۆشەی کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبوونی دڵگیرو نوێی ناوچەی تیتۆسفیل کە ناوچەیەکبوو تازە پەرەی پێدرابوو و یەکێك بوو لەو گەڕەکانەی بیرمنگهام کە رەشپێستەکانی چینی مامناوەندی تێدا دەژیان. دواتر پاش ئەوەی چەند کۆمەڵگەیەکی نوێی نیشتەجێبوونی دڵگیری تێدا دروستکرا، ئەم شوێنە لەسەر حسابی دارستانە سەوزەکەی ناوچەکەدا، زۆر فراوانبوو. کۆندی زۆربەی کاتەکانی لەم ناوچە بچووکەدا لەنێو هاورێکانیو ئەندامانی خێزانەکەیدا، بەسەربردووە.

بەهۆی کۆمەڵگەیەکی توندوتۆڵو پێکەوەگرێدراوەوە کە پێکهاتبوو لە چەندین پرۆفیسیۆرو بانگخوازو ئەو هاووڵاتییە رەشپێستانەی سەربە چینی ناوەندی بوون، خێزانی کۆندی توانیان کچەکەیان لەو راستییە تاڵانەی ژیان بپارێزن کە لە شاری بیرمنگهامی رەگەزپەرست چەسپابوو. هەموو خەڵکی ئەو گەڕەکە خۆیان بۆ پەروەردەکردنێکی بەهێزی منداڵەکانیان تەرخانکردبوو بەشێوەیەك متمانەیان بەخۆیان هەبێت. کۆنی رایس کە خزمی کۆندییە لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئەمانە بەمانای وشە دابونەریتە باوەکانی دەرەوەی گەڕەکەکەیان پشتگوێ خستبوو، ئەو دابونەریتانەی ئەمانی بەچینێکی دینداری رەشپێستو بێبەها لەقەلەمدەداو بەهۆی ئەوەشەوە هیچ دەسەڵاتێکیان پێ نەدەدرا". بێگومان ئەمەش یەکێکە لەو رووانەی کۆندی لەسەر پەروەردەکراوە. جۆنو ئەنجێلینا کچەکەیان نوقمی خۆشەویستیو گرنگیپێدانو ستایشکردن، کردبوو، هەموو پێکهاتەکانی شارستانیەتی رۆژئاواشیان لە موزیكو بالیەو زمانی

بیانیو جۆرەکانی وەرزشو چەندین کتێبی گرنگەوە بۆ تەرخان کردبوو. کۆندی بەمشێوەیە باسی دایكوباوکی دەکات: "من دایكوباوکێکم هەبوو هەر هەلێك لەبەردەستدا بووبێت، پێیان داوم، بڕواشیان بەسەرکەوتن هەبوو". هەر لە لەدایکبوونی کۆندییەوە، ئەنجێلینا خۆی بۆ پەرەپێدانی توانا فیکریو هونەرییەکانی کچەکەی تەرخانکرد. کۆندی ماوەیەکی زۆر پێش پەیوەندیکردنی بەقوتابخانەوە، ئامادەگییەکی باشی پەیداکردبوو ئەویش پاش ئەوەی چەندین وانەی پیانۆژەنینی پێ وتراو پرۆگرامێکی تێروتەسەلی لەسەر راهێنان لەسەر ماددەکانی تری خوێندن، فێرکرا. کۆندی دەڵێت: "هەستمکرد لەناو ژینگەیەکی زۆر رێکخراودام، ژینگەیەکی پڕ لەیانەی تایبەت بەمنداڵانی بچوك، ئەم ژینگەیە چەندین وانەی بالیەو گرووپێکی نەوجەوانانو رۆیشتنی یەکشەممان بۆ کڵێسەی لەخۆگرتبوو. پێموایە رێکخستنی کارەکان لەم جۆرە شتانەوە دروستدەبێت"

لەبەرئەوەی موزیك خاڵێکی جێی گرنگیو بایەخپێدانێکی باشبوو لە ژیانی ئەنجێلینادا، ئەم ژنە سووربوو لەسەرئەوەی هەموو هەلێك بداتە کچەکەی بۆ ئەوەی ببێتە پیانۆژەنێکی دانپیانراو. هەر لەیەکەم رۆژی لەدایکبونییەوە، کۆندی نوقمی کەشی کڵێسەو موزیکی کلاسیکی بوو، گوێی لە پیانۆو ئۆرگو ئاوازەکان دەگرت. کەسوکارەکەی ئەوەیان لەبیرە کە کۆندی هەر لە منداڵییەوە دەستکیردووە بەخوێندنەوە، بەلام خودی خۆی دەڵێت پێش فێربوونی خوێندنەوەی کتێب، فێری خوێندنەوەی نۆتەی موزیك بووە.

کۆندی بەچوارەم موزیکژەنی نەوەی دایکی، دادەنرێتو لەمبارەیەوە دەڵێت: "دایکم پیانۆژەنبوو، هەروەها نەنکمو دایکی نەنکیشم پیانۆژەن بوون". کاتێك ئەنجێلینا دووبارە دەگەڕێتەوە سەر کارەکەی، کۆندی هەموو رۆژەکانی هەفتە لەماڵی ماتی رای کە نەنکیبوو، بەسەردەبات. سەعات دوای سەعات، خوێندکارانی ژەنینی پیانۆ بەلێشاو دەڕژانە ئەو ماڵەو کۆندیش بووە شەیدایەکی ئەو ئاوازانەی لە ژەنینەکەیانەوە دەردەچوو، هەروەك زۆریش بەو گرنگییە زۆرە سەرسامبوو کە نەنکی دەیدا بەو خوێندکارانە. هەر لەسەردەمی منداڵییەوە کۆندی واڕاهاتبوو خۆی دەستیدەنا بە کلیلەکانی پیانۆکەداو بەو شێوەیە

هەوڵیدەدا لە ژەنینی ئەو ئامێرەدا لاسایی نەنکی بکاتەوە. ماتی هەستیکرد ئەو گرنگیپێدانەی لەناخی کۆندیدا هەیە لەوە زیاترە کە تەنها فزول بێت هەربۆیە هەوڵدەدات خووە زگماکەکانی بدۆزێتەوە. لەمبارەیەوە کۆندی دەڵێت:" بەوشێوەیە نەنکم بەدایکمی وت باشتروایە ئەم کچە فێری پیانۆژەنین بکرێت. ئەوکاتە من کە تەمەنم سێ ساڵانبوو، دایکم پێیوابوو رەنگە زۆر بچوکبم بۆ فێربوون بەڵام نەنکم ویستی کارەکە تاقیبکاتەوە، ئەنجامەکەی ئەوەبوو کە لە تەمەنێکی زۆر کەمەوە فێری موزیکژەنین بووم"

ئەنجێلینا هەستی بەخۆشییەکی بێئەندازە کرد، پلانەکەی بۆ وروژاندنی گرنگیپێدانی کچەکەی بەموزیك سەری گرت، ئەمەش هاوشێوەی پلانەکەی دایکیو نەنکی بوو لەگەڵ ئەمدا. کاتێك دایکی کۆندی بەتەواوەتی گەیشتە ئەو بڕوایەی کە کچەکەی لەلایەن خۆیەوە شەیدای موزیکە، زۆر سەرسامبوو. جنوا رای ماکفاتەر کە پوری کۆندییەو بەڕێوەبەری خوێندنگایەك بوو لە ڤیرجینیا، دەڵێت: "کۆندی بەوە جیادەکرایەوە کە تەنانەت کاتێك منداڵێکی بچوکیش بوو، توانایەکی بێشوماری تەرکیزخستنەسەری هەبوو، لەکاتی دیاریکراودا بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك بیربیخاتەوە، راهێنانی لەسەر پیانۆ دەکرد" ئەنجێلینا هەرزوو ریتمە خێراکانی فێری کۆندی کرد، نەك تەنها لەوانەکانی پیانۆدا بەڵکو لەبواری فێرکردنو رۆشنبیرکردنیشدا.

کۆندی لەتەمەنی پێنج ساڵیدا بەتەواوەتی فێری خوێندنەوە بوو، لەبەرئەوە ئەنجێلینا هەر ئەو ساڵە ویستی کچەکەی پەیوەندی بکات بە قوتابخانەوە، بەڵام بەڕێوەبەری خوێندنگە سەرەتاییە ناوخۆییەکەی تایبەت بەرەشپێستەکان پێی دەڵێت کچەکەی زۆر بچووکە. ئەنجێلینا مۆڵەتی ساڵێك لە قوتابخانەی دواناوەندی فایەرفێلد وەردەگرێتو بەدرێژایی ئەو ماوەیە، لە ماڵەوە دەمێنێتەوە چونکە نەیدەتووانی کچەکەی کە بەتەواوەتی توانای وەرگرتنی زانستی هەبوو، لە ساڵێکی خوێندن بێبەش بێت. ئەم کارەی دایکی بەرهەمێکی باشی هەبوو لەبەرئەوەی کۆندی بەهۆیەوە گەیشتە قۆناغێکی پێشکەوتوو و توانی پۆلی یەکەمو حەوتەم بپەڕێنێت.

ئەو ساڵەی فێربوونی کۆندی کە لە ماڵەوە وەریگرت، بەوە جیادەکرایەوە کە چڕوپڕو توند بوو. جولیما سمیس کە هاوڕێیەکی دێرینی ئەو خێزانەیە، دەڵێت ئەنجێلینا بەشێوەیەك ڕۆژەکانی کۆندی ڕێکخستبوو، وەك ئەوەی بڵێی بەڕاستی لە پۆلی خوێندندایە، بەڵام وانەکان چڕوپڕتربوون. جولیما دەشڵێت: "لەو کاتانەدا یارییان پێکەوە نەدەکرد بەڵکو وەك ئەوەی بڵێی لە پۆلێکی قوتابخانەدان، هەڵسوکەوتیان دەکرد، مۆڵەتیان بۆ کاتی خواردنی نیوەڕۆ وەردەگرت، پاشان دەگەڕانەوە سەر خوێندن". جۆلیما کە لە قوتابخانەی سەرەتایی داڤیس وانەی دەوتەوەو لە ڕێکخستنی نەوجەوانانی کڵێسەکەشدا، یارمەتی جۆنی دەدا، ئەوەی لەبیرە کە ئامێرێکی خوێندنەوەی لە ماڵی رایسدا بینیوە. دەڵێت: "کۆندی بەیارمەتی ئامێرێکی خوێندنەوەی خێراوە، فێری چۆنیەتی خوێندنەوەی کتێب بووە. پێشتر بیستبووم کە سەرۆك کینیدی ئامێرێکی لەوشێوەی بەکارهێناوە، بەڵام پێش ئەو ئامێرە هیچ یەکێکی ترم نەبینیوە، هەروەك ئەوە یەکەمجاریشم بوو کە شتێك بەناوی وانە وتنەوە لە ماڵەوە ببیستم. پێموایە ئەنجێلیناو جۆن گرنگییەکی زۆریان بەپێگەیشتنی کچەکەیان داوەو ویستوویانە باشترین شتی پێشکەشبکەن، بێگومان لەوەشدا سەرکەوتوو بوون"

ئەنجێلینا دەیویست کچەکەی هەموو ئەو هەلانەی دەستبکەوێت کە دەبنە هۆی پێشکەوتن‌و بوون بە پیانۆژەنێکی پلەیەك، ئەمەش پێویستی بەبیرێکی تیژو تەکنیکێکی نایاب هەیە لەیەك کاتدا. ئەم دایك‌و کچە لەپێناو دۆزینەوەی جیهانەکانی موزیك‌و زمان‌و هونەردا، چەندین سەعاتیان پێکەوە بەسەردەبرد. هەموو ئەمانەش لەماڵ یان لە ڕێگەی ئەو گەشتانەی لە شارەکەدا ئەنجامیان دەدا، رووی ان دەدا. کۆندی دایکی زۆر خۆشدەویست، تەنانەت پەرستنیش لە پێناو ئەودا دەکات‌و لەبارەیەوە دەڵێت: "دایکم بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێن جوانبوو، زۆر بەهرمەندبوو... لەیادمە چۆن دەرگاکانی هونەری لەبەردەممدا دەکردەوە. ئەوەشم لەیادە کەکاتێك تەمەنم شەش ساڵانبوو، کاسێتێکی ئۆپرای(عایدە)ی بۆ کڕیم"

ئـــەم ڕێنوێنییـــە بەردەوامـــەی ئـــەنجێلینا بـــۆ ڕاهێنـــانی کۆنـــدی لەســـەر مۆزیکـژەنین، لـە منداڵییـەوە پـەیڕەوی دەکـرد، لـەناو ئـەو خێزانانـەی ژەنیـاری بەناوبانگیان لەسەر ئاستی جیهانی پێشکەش کردووە، شـتێکی بـاوبوو. چـەندین مۆزیکـژەنی مـەزن هـەن بەلایـەنی کەمـەوە یـەکێك لـەدایكوباوکیان شـارەزایی تـەواویان لـە ژەنـینی مۆزیکـدا هـەبووە، هەربۆیـە وەك کۆنـدی، لـە منداڵییـەوە چاودێری بەهرەی منداڵەکانیان کردووەو خۆیان بۆ ڕاهێنانیانیـان تـەرخانکردووە. بۆ نموونە ڤان کلیبێـرن لـە تەمـەنی سـێ ساڵییەوە وانـەی پیـانۆژەنینی لەلایـەن دایکییەوە پێوتراوەو تـا پەیوەندیکردنیشی بـە پـەیمانگای جۆلیـارد لـە تەمـەنی حەڤدە ساڵیدا، لەوانەوەرگرتن لەدایکی، بـەردەوامبووە. ئێرڵوایڵد ـ یش هـەر لە ڕۆژی لەدایکبونیەوە، لە ماڵەوەیاندا گوێی لە مۆزیکی کلاسـیکی گرتـووەو لـە سـێ ساڵیشەوە دایکی وانەی پێ وتووەتـەوە. کلۆدیـۆ ئـاراو ـ یش هـەر لـە منداڵییـەوە لەسەر دەستی دایکـی، وانـەی پێوتراوەتـەوەو پـێش ئـەوەی فێـری خوێندنـەوەی وشـە ببێـت، فێـری خوێندنـەوەی نۆتـەی مۆزیـك بـووە. هەریـەکێکیش لـە کـلارا هاســکڵ، ئەلیســا دی لارۆشــا، گلـین گۆڵـد، ئارســەر ڕۆبنشــتاین (کـە یەکێکـە لـە پیانۆژەنە پەسەندکراوەکانی کۆندی) هـەر لـە تەمـەنی منداڵییـەوە هانـدراون بـۆ ئـەوەی وانـەی مۆزیـك بخـوێنن. دیـۆك ئیلـنگتـۆن ـ یـش لەسـەردەمی منداڵییـەوە وانەی پیانۆی پێوتراوە، هەرچـەندە خـۆی هەمیشـە لێـی بێـزار بـوو و دەیویسـت لـــەبری ئـــەوە لەگـــەڵ هاوڕێکانیـــدا لـــەدەرەوە یاریبکـــات بـــەڵام دایكوبـــاوکی وایانلێکردووە لە خوێندن بەردەوامبێت.

بوونی خێزانێکی خاوەن باکگراوەندێکی مـۆزیکی، دایكوباوکێـك کـە خۆیـان بـۆ منداڵـەکانیان تـەرخان بکـەن، دەرکـەوتنی ئامادەییـەکی نـاوازە بـۆ فێربـوونی مۆزیك لە تەمەنی منداڵییەوە (کە زیاتر لە تەمەنی سێ ساڵییەوە دەردەکەوێت)، هەستێکی قوڵ بەرامبەر بەمۆزیك، ئەمانە سەرباری بەهرەیەکی پـاكو نائاسـایی، ئـەو پێشـمەرجانەن کـە زۆربـەی مۆزیکژەنـە مەزنـەکانی پـێ جیادەکرێتـەوە. کۆندی خاوەنی هەموو ئەم سیمایانە بوو.

ئەنجێلینا هەستی بەوە کرد کە کچەکەی لە چەندین بواردا خاوەنی بەهرەی بێهاوتایەو ئەندامانی تری خێزانەکەش هەمان هەستیان هەبوو. جنوا رای دەڵێت: "خوشکەکەم هەمیشە هەستی بەوە دەکرد کە کۆندۆلیزا منداڵێکە لە منداڵەکانی تر جیاوازە". شایانی باسە دایكوباوکی کۆندی حەزیانکرد لەو بڕوایەیان دڵنیابن کە کچەکەیان بەهرەمەندە هەربۆیە پێکەوە بردیان بۆ زانکۆی باشور بۆ ئەوەی بیخەنە ژێر تاقیکردنەوەی دەروونییەوە. بێگومان ئەنجامەکە سەرسوڕهێن بوو، چونکە ئەنجێلینا بەخێزانەکەی وتبوو:"خۆم دەمزانی کچەکەم بلیمەتە!"

یەکەم گۆرانی کە کۆندی لەسەر پیانۆکەی فێریبوو، ناوی چ هاوڕێیەك لە عیسادا دەدۆزینەوە، بوو. ماوەیەکی کەم پاش ئەوە کۆندی دەستیکرد بەڕۆشتن بۆ کڵێسە لەگەڵ دایکیداو لەسەر کورسی ئۆرگ، لە نزیك دایکییەوە، دادەنیشت. لە تەمەنی چوارساڵیدا توانی زۆر بەباشی فێری کۆمەڵێك پارچەموزیك ببێتو یەکەم ئەدای بەتەنها پێشکەش کرد. ئەو بایەخپێدانە چڕوپڕەی کۆندی دابوویە پیانۆ بووە هۆی ئەوەی کاتەکانی تایبەت بەیاریو ئەو پرۆژانەی تر کە ئەنجێلینا بۆی رێکخستبوو، کەمببێتەوە. کۆندی زۆربەی کاتەکانی لەماڵەوە بەڕاهێنان لەسەر پیانۆو زمانی فەرەنسی بەسەردەبرد، بەهۆی ئەمەشەوە لە زۆربەی کچەکانی گەڕەکەکەی سەرکەوتووتر بوو. دوو کچ کە لەبەرامبەر ئەو شەقامەدا نیشتەجێبوون کە کۆندی تێیدا دەژیا ئەوەیان لەبیرە کە چەند سەعاتێك چاوەڕێیان دەکرد تا کۆندی لە کۆتا پارچەموزیکی بتهۆڤن یان مۆزارت، دەبوویەوە، چونکە دوای ئەوە لە ماڵ دەچووە دەرەوە. کۆندی کاتێکی زۆری لە دەرەوە بەسەر نەدەبرد تا لەگەڵ کچانی تردا یاریی خەتخەتێن یان پەتپەتێن لەسەر پەت یان یارییەکانی مامۆستا، بکات. ئان داونێنگ کە یەکێکبوو لە دراوسێکانی ئەنجێلیناو چاودێرێکی هەمان کڵێسە بوو، باس لەوە دەکات کە کۆندی لەو جۆرە منداڵانە نەبووە کاتێکی زۆر لە دەرەوەی ماڵ بەڕاکردن لەمسەرو ئەوسەری گەڕەکەکە بەسەرببەن. ئان دەشڵێت: "لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر یاری لەگەڵ دایكوباوکیو خزمەکانیدا دەکرد". ئەنجێلیناو جۆن ژیانی خۆیان

بــۆ بەرهــەمهێنانی کاتــەکانی کۆنــدی بەتاقیکردنــەوەی بەســوودو بەرهەمــدارو دەولەمەندکردنی عەقلە لاوە سەرسـورهێنەکەی بـە زانیـاری‌و رۆشـنبیری، تـەرخان دەکـرد. ئـەم پابەندبوونـەش لەسـەر بنچینەی خۆشەویسـتی‌و ئـەو پێودانگانـەی سەرکەوتنەوە بوو کە هەر لە زووەوە لە خێزانی کۆندیدا بە بۆماوەیی مابووەوە.

ئەم بەسەرهاتە بەڵگەی پابەندبوونی قوڵی ئەنجێلینایە بەخۆتـەرخانکردنی بۆ کچەکەی: جارێك خـاتوو داونـنگ دەچێتەماڵیان دەبینێت ئـەنجێلینا لێواری گۆرەوییەکانی کۆندی ئوتودەکات. داونـنگ پێی دەڵێت: "بۆ خاتری خوا ئەوە چی دەکـەیت؟". ئـەنجێلیناش لـە وەڵامـدا دەڵێـت: "مـن زۆرم خۆشـدەوێت". خـاتوو داوننگیش پێی دەڵێت ئەگەر تا ئەو رادەیە خۆشیبووێت ئەوا پێویستە نەیـەڵێت منـداڵی تـرت ببێـت. ئـەنجێلیناش دەڵێـت: "نـاتوانم کۆنـدی لـەم خۆشەویسـتییە بێبـەش بکـەم". جـۆن رایسـیش ئەوەنـدەی ئـەنجێلینا کۆنـدی خۆشدەویسـت‌و هەستی بەهەمان پابەندبوون دەکرد بـۆ ئـەوەی هـەموو هـەلێکی سـەرکەوتنی بـۆ دابینبکـات. یــەکێك لــە ئەنــدامانی گرووپەکــەی جــۆن، لــە زمــانی جۆنــەوە دەگێرێتــەوە کــەپاش ماوەیــەك کۆنــدی پەیوەنــدی دەکــات بــە قوتابخانــەی سـەرەتاییەوەو دەبێتـە قوتابییـەك کـە بەبـەراورد لەگـەڵ هاورێکانی پۆلەکەیـدا، زیـاتر ئامـادەیی بـۆ خوێنـدنی شـێلگیرانە تێـدا دەردەکـەوێت، چـونکە پێشـتریش قوتابییـەکی شـێلگیر بـووە لـە موزیکـدا. رۆژێکیـان لەکاتێکـدا هاورێکـانی قویـان بـەزورنا پلاسـتیکییەکانیاندا دەکـردو بـەهۆی ئـەوەوە ژاوەژاوێکیـان لـە پۆلەکـەدا دروستکردبوو، کۆندی دەنگ بەسەر ژاوەژاوەکەدا بەرزدەکاتەوەو بە مامۆسـتاکەی دەڵێـت: "مـن چـاوەرێی فـەرمانم، رێـم پـێ دەدەیـت ئـەو موزیکـە بنووسـم کـە پێویستە بیژەنم؟". کۆندی خۆی لەسـەر گـوێگرتن‌و پـەیرەوکردنی هەڵسـوکەوتی جوان راهاتبوو، ئەمەش ببووە رۆتینێکی جێگیر لە ژیانیدا. کۆندی هەمیشە وەك کەسـێکی پێگەیشـتوو هەڵسـوکەوتی دەکـرد، ئـەوەش بـەهۆی ئـەوەوەبوو کـە لـە ماڵـەوە وەك کەسـێکی پێگەیشـتوو مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـرا. موسـا برۆیـر کـە لەوکاتەی کۆنی پەیوەندی کـردووە بـە زانکـۆی دێنیڤـەرەوە، هاورێیـەتی، دەڵێـت: "جۆن‌و ئەنجێلینا دایك‌وباوکێکی نموونەیی بوون، هـەرگیز وەك ئـەوە مامەڵـەیان

لەگەڵدا نەكردووە كە تەنها منداڵێك بێت، ئەمەشە هۆی ئەوەی كە كۆندی بەشێوەیەك پێگەیشتووە زۆر لەسەرووی تەمەنییەوە بێت". هەندێك لەهاوڕێیانی پۆلەكەی، پێگەیشتن و نموونەییبوون و هەڵسوكەوتی بەرزی و شێوازی رۆشتنەكەی كە بەشێوەیەك بوو وا دەردەكەوت لەسەر سەری پەنجە دەڕوات، وەك بەڵگەیەكیان دەبینی لەسەرئەوەی كچێكە بەئاسانی رازی ناكرێت. كۆندی كە كچێك بوو لەكاتی بەفێرۆچوونی كاتەكانیدا هەستی بەبێزاری دەكرد، پاش بەسەربردنی حەوت ساڵ لە فێربوونی پیانۆش هەستیكرد لەمەیش بێزاربووە. كۆندی دەڵێت: "لەبیرمە، كاتێك تەمەنم نزیكەی ١٠ ساڵان بوو، ویستم بەتەواوەتی دەست لەپیانۆژەنین بهێنم. هەرچەندە من لە منداڵیدا بلیمەت بووم بەڵام كاتێك تەمەنم گەیشتە ١٠ ساڵان بینیم چەندین منداڵی بچووك هەن كە لە تەمەنی ١٠ ساڵیدان و بەباشی پیانۆ دەژەنن". لەوكاتەدا كۆندی پێیوابوو كە ناوازەییەكەی لەوەی كە منداڵێكی بچووكی موعجیزە بوو و بەباشی پیانۆی دەژەنی، كۆتاییهات و خۆی ئامادەكردووە بۆ ئەوەی بچێتە سەر شتێكی تر. كۆندی دەشڵێت: "بەڵام دایكم پێی وتم ئەوەندە پێگەیشتوو و لێهاتوو نیم تاوەكو ئەو بڕیارە بدەم، قسەكەشی راست بوو".

لەبری ئەوە كۆندی پەیوەندی كرد بە پەیمانگایەكی موزیكی ناوخۆییەوەو ئاستی ژەنینی موزیكی گەیاندە ئاسۆیەكی نوێ. لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا پەیوەندی كرد بە پەیمانگای موزیكی بیرمنگهامی باشور كە ئەوكاتە تازە دەرگای بەڕووی قوتابییە رەشپێستەكاندا، واڵا كردبوو. كۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "پێموایە من یەكەم كچەخوێندكاری رەشپێست بووم لەو پەیمانگا موزیكییە كە تازە ببووە تێكەڵاو. لەوێوە دەستمكرد بە كێبەركێ لە پیانۆژەنیندا".هەر لەو پەیمانگایە كۆندی فێری یاساكانی ژەنینی زوڕناو كەمانچە بوو ئەمەش هاوكاتبوو لەگەڵ وانە تایبەتییەكانی لە بالیەو زمانی فەرەنسیدا. لەكاتی بێكاریشدا كۆمەڵێك كتێبی لەتەنیشدا دانرابوو كە بەتایبەت بۆی دیاریكرابوون و پێكهاتبوون لە باشترین كۆمەڵە كتێبی ئەدەبی كە بۆ تەمەنەكەی گونجاوبوون. شایانی باسە یەكێك لەو گلەییانەی ناڕاستەی دایكی دەكران ئەوەبوو كە خوێندنەوەی ئەو كتێبانەی

وەك ئـەرکێك خسـتبووە سەرشـانی کۆنـدیو وەك هۆکـارێکی کـات بەسـەربردن نەبوون بۆی. کۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "لە خێزانێك پەروەردەبووم کە لەسـەر ئـەوە راهـاتبوون لـە هـەموو یانـەکانی کتێبـدا بەشـدارییان پێدەکردم، هەربۆیـە هـەرگیز نەمـدەتووانی خوێندنـەوەی کتێـب بـەجۆرێك لـە جۆرەکـانی سـەرگەرمی دابنێم"

هـەر بـە مەبەسـتی فراوانکردنـی ئاسـۆی کۆنـدی، ئـەنجێلینا رێگایـەکی تـری گرتەبەر ئەویش پەیوەندیپێکردنی بوو بـە چـەندین خوێندنگـەی حکومییـەوەو خسـتیە بـەر کۆمـەڵێکی زۆر لـە تاقیکردنـەوەی کۆمەڵایـەتیو فێرکـاری. لـەکاتی پەیوەنـدیکردنی بەهـەر خوێندنگەیەکـەوە، هـەروەك لـە هـەموو چـالاکییە ناپرۆگرامەکانی تری، پێویستبوو لەسەری لـەوە سـەرکەوتووتر بێت کـە پێشـبینی دەکراو رووبەڕووی ئەو کارانە ببێتەوە کـە لەسـەرووی ئاسـتی تەمەنییـەوە بـوو و هەمیشـە بگاتـە لوتکـە. لـەو سـەردەمەدا یاسـایەکی تونـدی نەنووسـراو لـەناو خێزانـەکانی تیتوسـڤیلدا بـاوبوو ئـەویش ئـەوەبوو کـە پێویسـتە منداڵـە رەشپێستەکان بەشێوەیەك هانبدرێن بۆ سەرکەوتن کە چەندجارەی سـەرکەوتنی منداڵـە سپیپێسـتەکان بێـت تـا بگانـە ئاسـتێکی هاوتـا لەگەڵیانـدا. دوای ئـەوەش پێویسـتبوو لەسـەریان کـە سـێ ئەوەنـدەی سپیپێسـتەکان سـەرکەوتوو بـن تـا وادابنرێن لەوان سەرکەوتووترن. بنەماڵەی رایو رایس پێیـان وابـوو ئـەم یاسـایە بووەتە ئەو هێزە پاڵنەرەی کە هۆکاری ئەو سەرکەوتنانە بوو کە لە منداڵـەکانیان چاوەڕوانیان دەکرد. منداڵـە رەشپێسـتەکان لەرێگـەی هاندانیانـەوە بـۆ بەزانـدنی پلـە داواکراوەکـان، توانییـان هـەر دەسـتبەجێ پـاش دەرچـوونیان لەژێرسـایەی خێزانەکانیان لە تیتۆسڤیل، توانای کێبەرکێ بەدەستبهێنن. کۆنـدی لەمبارەیـەوە دەڵێـت: "کارەکــە وا نــەبوو وەك ئــەوەی کەســێکیان بڵــێن: "پێویســتە سەرکەوتنەکەت چـەندجارە بێـت، یـان ئایـا ئـەوە نیگـەرانی نـەکردیت؟ یـان ئایـا ئـەوە خــراپ نــەبوو؟" بــەڵام بەوپــەڕی روونییــەوە پێویســتبوو لەســەرت سەرکەوتنەکەت چەندجارە بێت"

کۆنـدی لەروونکردنەوەکـە بەردەوامـدەبێتو دەڵێـت: " بەوپێیـەی دایـكو بـاوکم دوو پلاندانـەری سـتراتیژی بـوون، پێویسـتبوو لەسـەرم بەباشـی خـۆم ئامادەبکەمو هەموو ئەو شتانە بکەم کە کۆمەڵگەی سپیپێسـت وەك پێزانینێکی گەورە سەیری دەکەنو لە دژی رەگەزپەرستیش قەڵایەك بم بۆ خۆم. پێویسـتیش بـوو لەسـەرم ئـەو توانایـەم هـەبێت بـەزمانی خۆیـان رووبـەڕووی کۆمەڵگـەی سپیپێست ببمەوە". کاتێك منداڵان سەبارەت بـەو قسـانەی لـەملاولا دەیانبیسـت یـان یاسـاکانی جیم کـرۆ کـە لەمیانـەی یـەکێك لـە گەشـتە دەگمەنەکانیانـدا بـۆ چـەند شـوێنێکی تـری بیرمنگهام بینیبوویـان، پرسـیاریان لـە خزمو کەسـوکاریان دەکرد، کەسوکاریان داوایان لێدەکردن خۆیان لەوبارەیەوە نیگەران نەکەنو پێیان دەوتن: "ئەوە کێشەی ئێوە نییە"

دایکـی کۆنـدی هەمیشـە بەرپەرچـی یاسـاکانی رەگەزپەرسـتی دەدایـەوە، کچەکەی چـەندین روداوی بەسـەرداهات کـە زۆربـەیان لەمیانـەی گەشـتکردنیاندا بوو بۆ بازاڕ، بەڵام ئەنجێلینا تووانی لە هەموویاندا پارێزگاری لە هەڵوێستی خۆی بکات. یەکێك لەم روداوانە لە بازاڕێکی گەورەی ناوەڕاستی شاردا روویـدا کەتێیـدا ئـەنجێلیناو کۆنـدی سـەیری جلـی کچـانەیان دەکـرد. کۆنـدی عەزییـەك هەڵدەبـژێرێتو دەیـەوێت تاقیبکاتـەوە هەربۆیـە ئـەم دایـكو کچـە روودەکەنـە ژوورێکـی جلوبـەرگ تاقیکردنـەوە کـە لەسـەر دەرگاکـەی نووسـراوە "تـەنها بـۆ سپیپێسـتەکان". یـەکێك لـە ژنـە فرۆشـیارە سپیپێسـتەکان رێگـەیان پێـدەگرێتو عەزییەکە لەدەستی کۆندی دەردەهێنێتو لەگەڵ ئاماژەکردن بـەژوورێکی تایبـەت بـەکۆگای جلوبـەرگ، بـە ئـەنجێلینا دەڵێـت: "پێویسـتە لـەوێ ئـەو عەزییـە تاقیبکاتەوە"، ئەنجێلینا لـە وەڵامـدا بـەبێ هـیچ ترسـێك بـە فرۆشـیارەکە دەڵێت کچەکەی یان عەزییەکە لـەو ژوورە تاقیدەکاتـەوە کـە بەڕاسـتی بـۆ تاقیـکردنـەوەی جلوبەرگ تەرخانکراوە یان پارەکەی لەشـوێنێکی تـر خەرجـدەکات. ئـەنجێلینا زۆر متمانەی بەخۆی هەبوو و کەسـێکی زۆر سـوورو تونـدبوو لەسـەر هەڵوێسـتەکانی هەربۆیە ژنەفرۆشیارەکە گەیشتە ئەو ئەنجامەی ئەو ژنە رەشپێستە شیکپۆشـەی لەبەردەمیـدا وەسـتاوە، کەسـێك نییـە لـە قسـەکانی پاشـگەزببێتەوە هەربۆیـە

بڕیاریدا پارەی عەزییەکە لەم دەمەقالە ئاشکرایە گرنگترە، بۆیە رێگەی پێدان بچنە ژورێکی جلگۆڕینەوەو عەزییەکە تاقیبکەنەوە، بەڵام ژورەکە تارادەیەك لەبەرچاو دووریبوو. کۆندی لەبارەی ئەم روداوەوە دەڵێت: "بیرمە ئەو ژنە لەبەردەم دەرگاکەدا پاسەوانی دەکردین، دیاربوو زۆر نیگەرانی ئەوەبوو کە رەنگە کارەکەی لەدەست بدات".

مندالە رەشپێستەکانی بیرمنگهام بە ئەزموونێکی تاڵدا تێپەڕیون کە هەمیشە لەبیریانە، ئەویش ئەوەیە کاتێك یاری سێرك دەهاتە شارەکە، نەیاندەتوانی سەیریبکەن، هەروەها نەشیان دەتوانی بچنە کیدیلاند کە شوێنێکی سەرگەرمیو گەشتیاری ناوخۆیی بووە. یەکێك لە پورەکانی کۆندی ئەوەی لەبیرە کە خوشکەزاکەی چەندە بێتاقەت بووە کاتێك زانیویەتی بۆی نییە سەردانی پیشانگای ویلایەتی ئەلەباما بکات کە پیشانگایەك بوو لە وێستگەکانی رادیۆو تەلەفزیۆن ریکلامی زۆری بۆ دەکراو ساڵانە یەکجار دەکرایەوە. ئەم پیشانگایە منداڵێکی زۆری بۆلای خۆی رادەکێشا لەبەرئەوەی بەهۆی گیاندارە ماڵییەکانییەوە، هۆکارێکبوو بۆ ورووژاندنی ئاسۆی خەیاڵیانو مندالەکان دەیانتوانی خواردن بدەنە ئەو گیاندارانەو سواری هەندێکیشیان ببن. کۆنی رای لەمبارەیەوە دەڵێت: "کۆندی نەیدەتوانی لەوە تێبگات کە بۆچی هەرکاتێك بیەوێت رووبکاتە ئەو پیشانگایە، نایەڵن". دایكوباوکی کۆندی توانییان لەو شێوە نائومێدبوونە کچەکەیان بپارێزن بەتایبەت لەوەی کە پەیوەندی بە کیدیلاندەوە هەبوو. ئەو شوێنە گەشتیارییە بە دۆڵابە گەورەو جۆلانەو شوێنەکانی ترییەوە تەنها وەك شوێنێك نەبوو بۆ سپیپێستەکان بەڵکو ببووە بەڵگەیەکی نەگۆڕ لەسەر دابەشکردنی شارەکە بۆ دوو بەش. ئەم شوێنە گەشتیارییە ساڵانە یەك رۆژ بەڕووی رەشپێستەکاندا دەکرایەوە بەڵام، خێزانی رایس هەرگیز سەردانیان نەدەکرد. جۆنو ئەنجیلینا هەوڵیاندەدا ئەو پارکە بەتەواوەتی لە مێشکی کۆندی دووربخەنەوەو دیارە لەوەشدا توانیویانە سەرکەوتن بەدەستبهێنن. کۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "لەبیرم نایە هەستم بەنائومێدی کردبێت". هاوینێك لەکاتێکدا جۆن پەیوەندی دەکات بە چەند

خولێکی هاوینەی زانکۆییەوە، لەگەڵ ئەنجێلینا کۆندی دەبەن بۆ دورگەی کۆنی لە بڕۆکلین. جۆن هەوڵدەدات لەبەردەم ئەو منداڵانەی بەهۆی ئەوەی نەیاندەتووانی بچنە ناوییەوە، لە گرنگی کیدیلاند کەمبکاتەوە. کۆندی لەبیریەتی کە باوکی بەیەکێك لە مندالەکانی وتووە: "تۆ ناتەوێت بڕۆیتە کیدیلاند چونکە هەمووماں پێکەوە دەڕۆینە دیزنی لاند".

دایكوباوکی کۆندی ئەو هەلە مەزنانەی دەرەوەی سنوورەکانی بیرمنگهام کە لەبەردەستدابوون و ئەو پاداشتانەی لە ئەنجامی کارکردنی قورسدا، چاوەڕێیان دەکردو ئامانجە باڵاکانیان، بە کچەکەیان دەناساند. کۆندی لەمبارەیەوە قسەدەکات و دەڵێت: "دایكوباوکم دەبوو هەوڵبدەن ئەو هۆکارە روونبکەنەوە کە ڕێی لەمن دەگرت بچم بۆ سێرك و بۆچی پێویستە لەسەرمان بە ئۆتۆمبێل بگەینە واشنتۆن کە شوێنێکی دووربوو تا بچینە ناو میوانخانەیەکەوە. پێویستبوو ئەوەم بۆ روونبکەنەوە کە بۆچی ناتوانم لە چێشتخانەیەك پارچە هەمبەرگرێکم دەستبکەوێت لەکاتێکدا دەتوانم ببمە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەم رستەیەی کۆتایی ئەو شێوازە بوو کە دایكوباوکم هەڵیانبژارد تا بەهۆیەوە رووبەڕووی هەڵوێستە هاوشێوەکان ببنەوە".

جۆن رایس رۆڵێکی دیاری لە ژیانی چەندین تازەلاوانی نیشتەجێی تیتۆسڤیل دەبینی کە بەپێکەنینێکی هەڵقوڵاو لەناخ و تێڕوانینی گەشبینانە جیادەکرایەوە، لەوەش زیاتر خاوەنی پابەندبوونێکی توندبوو بەرامبەر بەکۆمەڵگە. کۆنی رایس کە یەکێکە لە خزمانی کۆندی پێی وایە جۆن خاوەنی توانایەکی بەرزی نائاسایی بووە لەسەر نارامگرتن و دانبەخۆداگرتن و دەڵێت: "بنەماڵەی رایس بە کارکردنی شێلگیرانە جیادەکرانەوە، بەڵام باوکی کۆندی لەناو ئەوانیشدا جیاواز بوو". بەهۆی ئەو تێڕوانینە راشکاوو پۆزەتیڤەی هەیبوو، ببووە کەسێکی خۆشەویست لە دڵی ئەو نەوجەوانانەی بۆ ئامۆژگاری دەهاتنە لای لە خوێندنگەو کڵێسەو ئەو سەنتەری گردبوونەوە نەوجەوانییەی دایمەزراندبوو. ئەو سەنتەرە لەکاتەکانی دوای خوێندن و پشووی کۆتایی هەفتەدا ببووە ئەکادیمیایەکی بچووکی راستەقینەو ببووە ئەو شوێنەی، قوتابیان پاش

خوێندنی فەرمییان، دەیانتوانی تێیدا لەسەر دەستی ئەو پرۆفیسۆرانەی کە جۆن لە خوێندنگە دواناوەندییە تایبەت بەرەشپێستەکان هێنابوونی، وانە بخوێنن. هەر لەویٚ خوێندکارەکان فێری یاری شەترەنجو شیکردنەوەی کارە هونەرییە بەناوبانگەکان دەبوون ئەویش لە ڕێگەی ڕێکخستنی گەشتی مەیدانییەوە بوو بۆ مۆزەخانەکان. جۆن بەرەزامەندی کەسوکارەکانیان، لە پشووی هەفتانەدا تیپی وەرزشیو ئاهەنگی سەمائامێزیشی ڕێکدەخست. مارگرێت شیتهام کە یەکێکە لەو کچەمامۆستایانەی وانەی ماتماتیكو جەبرو ئەندازەیان بەو نەوجەوانانە دەووتەوە، دەڵێت: "پیاوێکی مەزن بوو، کاتێك مندالەکان دەیانبینی یاری تۆپی باسکە دەکات، زۆر پێی سەرسام دەبوون".

بابەویلیام جۆنز، کە قەشەی ئێستای کڵێسەی مەشیەجیەی وێستمینستەرە لە بیرمنگهام سەرنجی ئەوەی دا کە جۆن سەرکردایەتی ڕێکخستنێکی گرنگی تری کردووە لەناو کڵێسەکەدا ئەویش تیمێکی دیدەوانیی نەوجەوانان بوو. جۆن توانی وزەو سەرکردایەتییەکی کەموێنەو لێهاتووییانە لەم تیمەدا دەربخات، بەرهەمەکەشی بەڕوونی کاتێك دەرکەوت کە دوان لەدیدەوانەکان توانییان بگەنە بەرزترین پلە. بابە جۆنز دەڵێت: "تیمی دیدەوانی جۆنز ئەگەر بەهێزترین تیمەکانی بیرمنگهام نەبووبێت، ئەوا یەکێك بوو لەبەهێزترینەکان. ئەم تیمە توانی چەندین دەسکەوت بەدەستبهێنێت لەوانە دوو ئەندامیان گەیشتنە پلەی دەیدەوانە هەڵۆکان. شایانی باسە هەندێك لەتیمەکان بەدرێژایی مێژوویان نەیانتوانیوە هیچ ئەندامێکیان بگەنە ئەم پلەیە بەڵام، تیمی جۆن تووانی دوو ئەندامی بگەیەنێتە ئەو پلەیە. گەیشتن بەم پلەیە پێویستی بەچەند ساڵێك فێربوونو پابەندبوون هەیە لەلایەن نەوجەوانانو سەرکردایەتیشەوە". تەنها چوار لەسەدی ئەندامانی دیدەوانی دەتوانن بگەنە پلەی دیدەوانیی هەڵۆکان، ئەمەش کارێکە پێویستی بەچەندین سەعات خزمەتکردنی کۆمەڵگاو فێربونی ئەو کارانە هەیە کەدەبنەهۆی بەدەستهێنانی باجی دیدەوانە هەڵۆکان.

ئەگەر تەنها بووترێت جۆن رایس فەرماندەیەكی ماندونەناسی گرووپێك لاو بووە، ئەوا نەتوانراوە مافی تەواوەتی پێ بدرێت. سەرباری ئامۆژگاریكردنی لەكلێسەو فێركردنو پێشكەشكردنی رێنوێنیو ئەركەكانی وەك راهێنەرو چالاكییەكانی لەو كۆمەڵەی نەوجەوانانەی كەدایمەزراندبوو، جۆن لەكۆمەڵگە گەورەكەشدا كەسێكی تەواو چالاك بوو. پاش ماوەیەكی كەم لەدامەزراندنی سەنتەری یارمەتیدانی لاوان لەواشنتۆن لەساڵی ١٩٦٥دا، جۆن بەشداری لەدامەزراندنی یەكەم سەنتەری هاوشێوە لە بیرمنگهامدا كرد، ئەمەش لەپێناو دۆزینەوەی كاردا بوو بۆ لاوانی ناوچەكە. جۆن وەك ئەندامێكی سەنتەری هەلی كار بۆ نەوجەوانانی بیرمنگهام كەبارەگاكەی دەكەوێتە ناوەڕاستی شارەكەوە، یارمەتی نەوجەوانە رەشپێستەكانی دەدا بۆ دۆزینەوەی كار بەشێوەی بەشەدەوام كاری هاوینە. جۆن بەیەكەم كەسی رەشپێستیش دادەنرێت كە وەك فەرمانبەر لە ئاژانسێكی حكومی سەربە ویلایەتەكە كاری كردبێت.

بەوپێیەی وەك رێبەری راوێژكاری لە قوتابخانەیەكی دواناوەندیدا كاری كردبوو، جۆن چەندین هەلی قسەكردن لەگەڵ تازەلاوانی سەبارەت بەزانكۆو هەنگاوە پێویستەكانی تایبەت بەوەرگرتن لە زانكۆكانی، بۆ رەخسا، كاریشی لەسەر راهێنانی خوێندكاران لەسەر تاقیكردنەوە پێودانگییەكانو هاندانیان بۆ گۆڕینی خەونەكانیان بۆ راستییەكی بەرچاو، دەكردو خاوەنی بەهرەیەكی پێویستیش بوو بۆ پێشكەشكردنی راوێژی زانستیو پشتگیریكردنی سۆزدارییو هەموو خوێندكارێكیشی هاندەدا كە بیرۆكەی گەورەو خەونی گەورەیان هەبێتو كار بۆ بەدیهێنانیان بكەن. ئەڵما پاوڵ، هاوسەری كۆڵن پاوڵ وەزیری دەرەوەی پێشووتر، بەڕێوەبەری دواناوەندی ئۆڵمان بوو كە جۆن تێیدا رێبەری راوێژكاری بوو. باوكی ئەڵماش بەڕێوەبەری قوتابخانەیەكی تربوو. ئەڵما ئەوەی لەبیرە كە ئەو دوانە زۆرجار باسی قەشە جۆن ویسلی رایسیان دەكرد كە گەنجێكی شیكپۆش بووەو بیرمنگهام بەختی هەبووە كە جۆن بووەتە نیشتەجێیەكی ئەوێ. تازەلاوان واڕاهاتوون كە بە ریف (كورتەی وشەی قەشە بە ئینگلیزی) بانگیان دەكرد، كچەكەشی تاڕادەی شێتبوون خۆشیدەویستو هەردووكیان زۆر لەیەكەوە نزیك بوون.

کۆندی فێری ئەوەبوو کەحەز لە تۆپی پێ بکات لەکاتێکدا کچانی تر حەزیان لە ئەسپسواری‌و کتێب خوێندنەوە دەکرد. کۆندی لەوبارەیەوە دەڵێت: "کاتێک لەدایکبووم باوکم ڕاهێنەری تۆپی پێبوو. دەیویست بەهەموو شێوازێك کوڕێکی ببێت، بەڵام کاتێك من لەدایکبووم بڕیاریدا هەموو شتێکم لەبارەی تۆپی پێوە فێربکات". لەتەمەنی چوار ساڵییەوە، کۆندی واڕاهات کە پاشنیوەڕوانی هەموو ڕۆژانێکی یەکشەممە لەگەڵ باوکیدا لە تەلەفزیۆنەوە سەیری یاری تۆپی پێیان دەکرد، هاوکات باوکی کۆمێنتی دوورودرێژی لەسەر یاساکانی یارییەکەو شێوازی یاریکردن‌و ستراتیژەکان‌و کۆبوونەکان، دەدا. ئەم باوك‌و کچەش واڕاهاتبوون کە ڕۆژی پاش جەژنی سوپاسگوزاریی هەموو ساڵێك وازیان لەقسەکردن دەهێناو لەحەوشەی پشتەوەی ماڵەوەیان، یاری فوتبۆڵیان دەکرد. جارێکیش کاتێک لەخوێندنگەی سەرەتاییدا بووە، بەدایکی یەکێك لە هاوڕێکانی وتووە "کاتێك گەورە بووم شووەکەم بەیاریزانێکی تۆپی پێی بەتوانا!". هاوکات کۆندی حەزیشی لەپێشبڕکێی ئەسپسواری‌و شانۆ بوو.

جۆن لەگەڵ کۆندیدا چەندین کاتی بەسودی بەسەربردووەو ڕوداوە هەنوکەییەکانی پیشاندەداو پێگەی ئەم ڕوداوانەی لەمێژوودا بۆ ڕووندەکردەوە. کۆندی دەڵێت: "موزیك لەگەڵ دایکم فێربووم‌و وەرزش‌و مێژووش لەگەڵ باوکم". کۆندی واڕاهاتبوو کە لەساڵەکانی پێش پەیوەندیکردنی بەخوێندنگەوە، بەدراوسێیەکی بەناوی جولیا سمیس دەوت کە لەتازەترین هەواڵەکانی ڕۆژنامەکان ئاگاداری بکاتەوە. جولیما دەڵێت: "هەر لەمنداڵییەوە لەڕادەی گرنگیپێدانی کۆندی بۆ سیاسەت تێگەیشتم، بانگی دەکردم‌و چەند شتێکی دەوت لەوانە: "ئەرێ زانیوتە ئەمڕۆ پۆڵ کۆنەر چی کردووە؟ "ئەو کاتە هێشتا کچێکی بچوك بوو و ئەم شتانەی بەبەردەوامی دەوتەوە. دەبوو ڕۆژنامەکە بەوردی بخوێنمەوە، چونکە نەمدەزانی بەدیاریکراوی چ پرسیارێکم لێ دەکات" شایانی باسە یوجسن پۆڵ کۆنەر کۆمیسیاری حکومەت بوو لەشارەکەو بەسیاسەتە ڕەگەزپەرستییە توندڕەوەکانی جیادەکرایەوە.

جـۆن‌و ئـەنجێلینا واڕاهـاتبوون کـە مۆڵـەتی هاوینـەیان لـە پیشـەکەیان وەردەگـرت‌و زۆرجـار ئۆتۆمبێلەکـەیان کـە لـەجۆری دۆج بـوو، ئامـادەدەکرد تـا گەشـتێکی درێژخایـەن ئـەنجام بـدەن. ئـەم گەشـتانە لادان بـۆ سـەردانکردنی زانکۆیەك یان دوو زانکۆی لەخۆگرتبوو. خێزانی رایس نەیاندەتووانی رێگری لەو ئارەزووەیان بکەن کەبەناو زانکۆیەك یان کۆلیژێکی بەناوبانگدا بگەڕێن. شایانی باسە وەك هەمیشە زانکۆکانی ئەمەریکا لەو شوێنە پیرۆزانە نزیکن کە لەمبـەرو ئەوبـەری رێڕەوەکانیـان درەخـت هەیـە، ئەمـەش یەکێکـە لەسیماکانی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان. کۆنـدی دەڵێـت: "ئێمـە هەمیشـە لـەلای بالەخانـەی زانکۆکـان دەوەستاین... لەکاتێکدا منداڵانی تر سەردانی پـارکی نیشـتمانی یەلۆسـتۆن-یـان دەکـرد، مـن سـەردانی بالەخانـەی زانکۆکـانم دەکـرد. لەبیرمـە کـە بـە ئۆتۆمبێـل ماوەی ۱۰۰ میـل لـەڕێڕەوی خۆمـان دوورکەوتینـەوە تـابتوانین لەشـاری کۆلۆمبس، سەردانی زانکۆی ئۆهایۆ بکەین".

جـۆن‌و ئـەنجێلینا چـەند وەرزێکـی هاوینـەیان لەپەیوەنـدیکردن بـەخولی زانکـۆیی لـە زانکـۆی دێنیڤـەر بەسـەربردو لـە سـاڵی ۱۹٦۹دا جـۆن لـەو زانکۆیـە، تووانی بڕوانامەی ماستەر لە فێرکردندا بەدەستبهێنێت، بەڵام ئەنجێلینا لەماوەی بیسـت سـاڵدا واتــە لـەنێوان ۱۹٦۱ تـا ۱۹۸۲ بەشـێوەیەکی پچڕپچـڕ پەیوەنـدی بەپۆلەکانـەوە دەکـردو دواجـاریش لەسـاڵی ۱۹۸۲دا تـوانی بڕوانامـەی ماسـتەر لـە هونــەری فێرکردنــدا بەدەســتبهێنێت. ئــەم ژن‌و مێــردە ویســـتیان لــەکاتی سەرقاڵبوونی رۆژانەیان بەخوێندن لە زانکۆی دێنیڤەر، کۆندی لەژێر سەرپەرشـتی پسپۆڕێکدا، شـتێك بکـات کـە بەرهـەمی هـەبێت. چارەسـەری ئەمـە سـەمای سـەر سەهۆڵ بوو. کۆندی دەڵێت: "سەمای ئیقاعی سەرسەهۆڵ شێوازێکی گران بوو لـە شێوازەکانی یاریکردنی منداڵان"، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا حـەزی لێدەکرد. کۆنـدی واڕاهـات کـە رۆژانـە چـەند سـەعاتێکی لـە پەرەپێـدانی تواناکـانی بەسـەردەبردو هاوشێوەی پیانۆژەنینەکەشی، گرنگیپێدانی بەم یارییە بەرهەمێکی باشی هەبوو. سـاڵەکانی راهێنـان لەسـەر باڵیـە، لەشـجوانی‌و ئـەو هێـزەی دابـووە کۆنـدی کـە یاریزانێکی لێهاتووی سـەما لەسـەر سـەهۆڵ پێویسـتی بـوو، هـەروەك لەشـولارێکی

هـەبوو کـە لەئـەنجامی راهێنـانی بەردەوامـەوە دروسـتدەبێت. دواتـر کۆنـدی هەولـەکانی چڕکردەوەو چـووە نـاو چـەندین پرۆگرامـی کێبڕکێـوە. هەرچـەندە راهێنانـەکانی لەسـەر خلیسـکانی ئیقـاعی، نـەیان گەیانـدە ئـەو ئاسـتەی کەهیواخوازبوو پێی بگات، بەڵام ئەم راهێنانانـە چـەند ئـەنجامێکی پۆزەتیڤی پێدان کە بەدرێژایی ژیانی لەگەڵیدا مایەوە.

بەهۆی گەرمی کەشوهەوای ئەلاباماوەو ئەو توندوتیژییەی زێدی کۆنـدی کـردە شـاری تەقینـەوەکان، وەرزەکـانی هاوینـەی دێنیڤـەر وەك کـاتو شـوێنێکی نموونـەیی دەرکـەوت لـەڕووی راکردنـی خـەڵك لێیـەوە. هەرکـە ڕەشپێسـتەکان بەشێوەیەکی پلەپـەل چوونە نـاو ئـەو گەڕەکانـەی بیرمنگهام کـە سپیپێسـتەکان تێیـدا نیشـتەجێبوون، گرووپـی کلۆکلـۆکس کـلان لـە ڕێگـەی تەقاندنـەوەی ماڵەکانیانـەوە، دەسـتیانکرد بـە تۆڵەسـەندنەوە لێیـان. یـەکێك لـە هاوڕێکـانی خێزانـی رایـس پـارێزەر ئارسـەر شـۆرز؛ بـوو کـە یـەکێکبوو لـەو کەسـانەی مـاڵی گواسـتبووەوەو لـە یـەکێك لـەو گەڕەکانـە نیشـتەجێ ببـوو کـە زۆربـەی دانیشـتوانەکەی سپیپێسـتبوون، ئـەوەبوو بـاجی ئـەم ماڵگواسـتنەوەیەی دا. هەندێك لە ئەندامانی ئەم گرووپە کەپێیان دەوتـن گـردی دینامیـت، ماڵەکـەیان تەقانـدەوەو خـەریکبوو بەتـەواوەتی بیرووخێـنن. ئەمـە لـە ٢١ی ئـابو ٤ی سێپتەمبەری ساڵی ١٩٦٣دا روویدا. پاش ئەم تەقینەوەیە کۆنـدیو خێزانەکـەی بەپەلە خۆراكو جلوبەرگیان بۆ خێزانی شۆرز پەیداکرد.

ئەو بڕیارەی دادگای فیدراڵی دای بۆ ئەوەی قوتابخانەکانی بیرمنگهام بکرێنە تێکەڵاو هۆکارێك بوو بۆ هاندانی ئەو تەقینەوانەی لەم شارەدا روویانـدا. شـایانی باسە خودی حاکم جۆرج والاس لەمیانـەی دروشمـەی هەڵبژاردنـە بەناوبانگەکـەی کـە بەناونیشـانی لەبـەردەم دەرگاکـانی قوتابخانەکانـدا بووەسـتن بـوو، سـوێندی خـوارد کـە لـەدژی ئـەو تێکەڵکردنـە بجـەنگێتو لـە بارەگاکـەی خۆیـەوە لـە مۆنتگـۆمری هـانی هاوڵاتییـەکانی دا رووبـەڕووی تێکـەڵکردنی ڕەشپێسـتو سپیپێستەکان ببنەوە، ئـەوەبوو ئـەم وتارانـەی بوونـە هۆکارێـك بـۆ هەڵگیرسـانی کاری توندوتیـژی. بەبیسـتنی هـەواڵی تەقینـەوەکان، کۆنـدیو سـەرجەم منـداڵانی

تری گەڕەك‌و كلێسەكە، هەستیان بەترس‌و تۆقین كرد. كۆندی ١٩٦٣وەك سالی تەقینەوەكان ناودەبات‌و دەلێت: "ئارسەر شۆرز هاوڕێ بوو... ئەو كاتە ئەو ساتەبوو كە جموجولێ بۆ توندوتیژی گۆڕا" بەدرێژایی چەند دەیەیەك شۆرز ئامانجی ئەم توندوتیژییە بوو، چونكە بەرگریكارێكی مافەكانی رەشپێستەكان بوو لە بیرمنگهام. شۆرز بۆ ماوەی چەندین سال تەنها پارێزەر بوو لە ئەلاباما. شایانی باسە لە سالی ١٩٤٩دا پاش كەیسێك، كە ئەم لەبەرژەوەندی خێزانێكی رەشپێست كە دەیویست مال بگوازێتەوە گەڕەكێك كە وەك نەریت شوێنی نیشتەجێبوونی سپیپێستەكان بوو، نووسینگەو مالەكەی رووبەرووی هەولی تەقاندنەوە بووەوەوە. پێش ئەوەی مادده تەقەمەنییەكان بتەقنەوە، شۆرز پێیزانی، بەلام كاتێك تەقەمەنییەكانی بردە نووسینگەكانی پۆلیس‌و نووسینگەی لێكۆلینەوەی فیدرالی هیچ كەسێك یارمەتی نەدا.

شۆرزو ئەوانی تریش چاك دەیانزانی كە پەنابردنەبەر نووسینگەی پۆلیس هیچ سودێكی نییە لەبەرئەوەی فەرمانگەی پۆلیس بەشێوەیەك لەشێوەكان دەستیان لەتەقینەوەكاندا هەبوو. مێژوونووسی بیرمنگهام بام كینگ دەلێت: " كارمەندانی پۆلیس واڕاهاتبوون كە دەچوونە شوێنەكەو بەخەلكەكەیان دەووت ناوچەكە چۆل بكەن‌و بەو شێوەیە شەقامەكان كەسی تێدا نەدەما، ئەو كاتە گرووپی كلۆكلۆكس كلان دەهاتن‌و بۆمبەكانیان هەلدەدایە شوێنەكە. پۆلیس گوێی بەئاسایشی هاولاتیان نەدەدا بەلكو رێگەخۆشكەربوون لەبەردەم كلۆكلۆكس كلان تا بێن‌و بۆمبەكان هەلبدەن". جارێك بۆمبێك هەلدرایە نزیك مالی خێزانی رایسەوە بەلام نەتەقییەوە، جۆن بۆمبەكەی هەلگرت‌و بردیە نووسینگەی پۆلیس‌و داوای لێكۆلینەوەی كرد بەلام پۆلیس هیچ لێكۆلینەوەیەكی ئەنجام نەدا.

تەقینەوەكانی ئەو هاوینە هاوكاتبوون لەگەل دەركەوتنی چەندین گرووپی گەڕۆك كە لەپیاوانی سپیپێست پێكهاتبوون‌و پێیان دەووترا پیاوانی شەو. ئەم گرووپانە بەو گەڕەكانەدا دەگەڕان كە رەشپێستەكانی تێدا نیشتەجێبون‌و تەقەیان دەكردو ئاگریان بەردەدایە شوێنەكانەوە. لەبەرامبەردا باوكی كۆندی‌و

هەندێکی تر لەپیاوانی گەڕەك ناچاربوون بکەونە پاراستنی شەقامەکانیان لەشەودا تا رووبەڕووی دەستدرێژییەکانی پیاوانی شەو بۆ سەرماڵەکانیان ببنەوە. ئەمانە تفەنگیان هەڵگرتو چەند نۆبەتێکیان دروستکرد کە بەدرێژایی شەو دەسوڕانەوە. تائێستاش یادەوەری بەشداریکردنی باوکی کۆندی لەو نۆبەتانە هۆکارێکە بۆ ئەوەی ئەم خانمە بەرهەڵستی سنووردارکردنی چەك هەڵگرتن دەکات. لەدیدی کۆندییەوە، ئەگەر ئەم تفەنگانە بەفەرمی تۆماربکرانایە ئەوا پۆڵ کۆنەر دەیتوانی دەستیان بەسەردا بگرێتو ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی ڕەشپێستەکان لە تەنها هۆکاری بەرگری لەخۆکردن، بێبەش بن. کۆندی لە ساڵی ٢٠٠١دا دەڵێت: "سەبارەت بەمادەی دووەمی هەموارکردنی دەستور کە پەیوەندی بەمافی چەك هەڵگرتنەوە هەیە، بیروبۆچوونی تایبەتی خۆمم هەیە".

ڕەشپێستەکان بەتایبەت منداڵەکانیان، ساڵی ١٩٦٣یان وەك ساڵێکی ترسناك لەبیرە. کۆندی سەبارەت بەوە دەڵێت: "ئەم روداوە تۆقێنەرانە چەند یادەوەرییەکیان لەلام چاندووە کە هەرگیز لەمێشکم ناسڕێنەوە. بەهۆی هەڕەشەی بەردەوامی بۆمبەوە ناچاربووم چەندین رۆژ نەچمەوە ئەو قوتابخانەیەم کە یاساکانی جیاکاری نەژادی پەیڕەو دەکرد. دیاربوو پیانۆ دڵنەوایی بوو بۆ من، تائێستاش ئەو جیهانی بەختەوەرییەم لەبیرە کە ئەو بۆی بەدیهێناوم". کۆندی دەشڵێت ڕەشپێستەکان سەرباری جیاوازییەکانیان یەکتریان بانگدەکرد تا بەهانای یەکەوە بچن، ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی پرسەکەیان بەهێزبێت. کۆندی بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی نێوان ڕەشپێستەکان کارێکی سروشبەخش بوو. لەو سەردەمەدا هەموومان یارمەتی یەکترمان دەداو جیاوازییە چینایەتییەکانی کۆمەڵگە ڕەشپێستەکان نەمابوونو هەستمان دەکرد کەپەیوەندییەکی بەهێز کۆماندەکاتەوە". شایانی باسە جیاوازییە چینایەتییەکانی شارەکە کە دروستبووبوو لەناو شاری ڕەشی بیرمنگهامدا، زۆر بەتوندی چەسپاو بوو. ئەو خێزانە ڕەشپێستانەی سەربە چینی ناوەندبوون چەند بەربەستێکی کۆمەڵایەتی توندیان دانابوو لەپێناو پاراستنی

ئـەو پلەوپایەیـەی لـەپێناو پێگەیشـتنیاندا، ماندونەناسـانە كاریـان بـۆ كردبـوو. مێژوونووس بام كینگ دەڵێت: "گەیشـتن بـەو پلەوپایەیـە ئاسـان نییـە، هاوكات ئەگەر خێزانێكیش لەدەستیدا ئەوا بۆ ماوەیەكی زۆر لەئاستی خـواری خـوارەوەدا دەمێنێتەوە. سـەركەوتن بەپەیـژەی كۆمەڵایەتیـدا زۆری تێدەچێتو زۆر سـەختە بەڵام، هاتنەخوارەوە زۆر ئاسانە". ژمارەیەكی زۆر لەخێزانـەكان كچـەكانیان پـێش كوڕەكانیان دەنارده زانكۆ، ئـەویش لەبەرئـەوەی دەیـانزانی كـە ژنـانی ڕەشپێسـت بەختێكی باشتریان هەیـە كـە بگەنـە ئـەوێ لەبەرئـەوەی مەترسـی نـین بـۆ سـەر كۆمەڵگـەی سپیپێسـت. ئـەم خێزانانـە بەدەسـتی ئەنقەسـتیش ئـەو گەڕەكانـەی بیرمنگهامیــان چــۆڵدەكرد كــە ڕەشپێســتەكانی تێــدا نیشــتەجێبونو مــاڵو موڵكەكانیشـان دەبـردو لەدەوروبـەری گەڕەكەكانـدا نیشـتەجێ دەبـوون، ئەمـەش كارێـك بـوو كـە سپیپێسـتەكانیش لەسەرتاسـەری وڵاتـدا دەیـانكرد. بـام كینـگ دەڵێـت: "كاتێـك تێكـەڵاوبوونی دانیشـتووان دەسـتیپێكرد، شـوێنەكانی وەك شــەقامی چــوار لــە بیرمنگهــام كــە مۆڵگــەی بازرگــانیو شــوێنی رابــواردنی ڕەشپێسـتەكان بـوو، چۆڵبوو. بـەهۆی چۆڵكردنیان لەلایـەن ڕەشپێسـتەكانەوەو گواستنەوەیان بۆ شوێنی تر، چەندین گەڕەك بەتەواوەتی چۆڵبوون".

پێش چەند هەفتەیـەكی كـەم لەدەسـتپێكی ساڵی تەقینـەوە كـەم وێنـەكان، كۆنـدی كەوتـە سـەرقاڵبوون بەبیركردنـەوە لـە جـۆرێكی تـر لـە هەڕەشـەكردن بـەبۆمب، ئـەوەش پـاش ئـەوە هـات كـە ڕۆژنامـەو هەواڵـەكانی ئێـوارە چـەند ڕاپۆرتێكیـان لەسـەر دواپەرەسـەندنەكانی قـەیرانی موشـەكی كـوبی، گواسـتەوە. كۆندی ئەو كاتە لە تەمەنی حەوت ساڵیدابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسـەر ئـەم پرسـە، لەگـەڵ دایكوباوكیـدا كەوتـە مشـتومڕ. بەرەوچاوكردنی ئـەو ڕاپۆرتـە هەواڵانـەی لەژورەكەیـدا دەیبیـنین لەگـەڵ ئـەو نەخشـانەی پێگـەو ڕێـڕەوی موشەكەكانیان دیاریدەكرد، كۆندی بەشێوەیەك لەشێوەكان هەستیكرد كـە ئـەم موشــەكانە زیـاتر لـەو تەقینەوانـەی لـە شـارەكەیدا ڕوودەدەن، هەڕەشـەیەكی ڕاسـتەوخۆیە بۆسـەر ئـەو. بـاوكی تـوانی لەمەترسـییە بـەربڵاوەكانی بیرمنگهامی گـەورە بیپارێزێـت بـەڵام ئایـا دەتوانێـت لـە فیـدل كاسـترۆو كـڵاوە ناوكییـەكانی

بپارێزێت؟ کۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "هەمووومان لە سنووری مەودای ئەو موشەکانەدا دەژیاین. بەشی باشوری رۆژهەڵات بەمشێوەیە بوو.... وەك ئەوە وایە موشەك ببینیت ئاراستەی بیرمنگهام کرابێت. لەبیرمە کە بیرم لەوە دەکردەوە باوکم ناتوانێت کێشەی ئەم موشەکانە چارەسەر بکات".

خێزانی رایس توانییان هاوڕێیەتی لەگەڵ قەشە فرید شتلزۆرس دروستبکەن کە یەکێکبوو لە کۆلەکەکانی بزووتنەوەی رەش لە بیرمنگهامو کاتێك مارتن لۆسەر کینگ ـی کوڕ لەشارەکەدا چالاکی دەکرد، ئەم قەشەیە هاوکاری کردبوو. جێی باسە کاتێك ویلایەتی ئەلاباما چالاکییەکانی **یەکێتیی نیشتمانی بۆ پێشکەوتنی فرەڕەنگەکان** لە ویلایەتەکە قەدەغەکرد، شتلزۆرس بزووتنەوەیەکی مەسیحی بۆ مافەکانی مرۆڤ دامەزراند. ئەو چالاکییانەی شتلزۆرس بەهاوکاری سەرکردەکانی تری بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان رێکیدەخستن، رێکخستنی رێپێوان بۆ منداڵانی لەخۆگرتبوو، هەروەك بەشداری لە پڕکردنەوەی ئەو شوێنانەدا دەکرد کە بەهۆی دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆر لەخۆپیشاندەرە بەتەمەنەکانەوە، چۆڵ ببوو. ئەم نارەزاییانە بەشێك بوون لەپلانێك کەپێی دەووترا پرۆژەی C. مەبەستم لەم Cیە یەکەم پیتی وشەی رووبەڕوبوونەوە بوو بەزمانی ئینگلیزی. ئامانجی ئەم پرۆژەیە رووبەڕوبوونەوەی جیاوازی نەژادی بوو لە رێگەی ئەنجامدانی مانگرتنو بایکۆتکردنی بازاڕە بەکۆفرۆشەکانی رەشپێستەکانو رێکخستنی رێپێوانی قەلەباڵغو ئەوەی کەپێی دەوترا گەشتەکانی ئازادی. ئەم گەشتانە پێکهاتبوون لە چەندین گەشتی تێکەڵاو لە رەشپێستو سپیپێست بەپاس کە بەویلایەتی ئەلاباماو ویلایەتەکانی تری باشوردا دەرۆشتن.

لە ساڵی ١٩٦٠دا گرووپێك لە خوێندکارانی زانکۆی مایەلز (ئەو زانکۆیەی کەدایکی کۆندی بڕوانامەی تێدا بەدەستهێناوە) چەند مانگرتنێکی هێمنانەی نارەزاییان لەو ریستۆرانتانەی بیرمنگهام رێکخست کە جیاکاری نەژادییان پەیڕەو دەکرد، بەڵام ئەم هەوڵانە دەرەنجامی خێرایان لێنەکەوتەوە. جاك داڤیس، کە پرۆفیسۆری یاریدەدەری مێژووە لە زانکۆی ئەلەباما، هۆکارەکە بەمشێوەیە روونکردەکاتەوە: "سپیپێستە خاوەندەسەڵاتەکان فشاریان خستە سەر زانکۆی

مایەلْز لەپێناو هاندانی خوێندکارەکان تا جموجۆڵەکەیان بوەستێنن. پۆڵ کۆنەر واڕاهاتبوو هەرکاتێك خۆپیشاندان روویبدایە، توندڕەوی بەکاردەهێناو ئەوەی لەتوانایدا بوایە بۆ وەستاندنو پوچەڵکردنەوەی خۆپیشاندانەکان، بەکاریدەهێنا، ئەمەشی لەپێناو پاراستنی جیاکاری نەژادیدا ئەنجام دەدا. ئەم پیاوە بەرهەڵستی هەموو ئەو هەوڵانەشی دەکرد کە ئامانجیان قایلکردنی خاوەن بازاڕە بەکۆفرۆشەکانی ناوەندی شارەکەبوو کەدەستبەرداری ئەو جیاکارییە نەژادییە بن کە پەیڕەوییان دەکرد"

جاك، کە پیاوێکی سپیپێستە، باس لە نیگەرانییەکانی باوکی دەکات سەبارەت بەکاردانەوەی بازرگانەکان لە بیرمنگهام لەکاتی ئەو ناڕەزاییانەی هاوکات بوون لەگەڵ پرۆژەی C لەشەستەکانداو دەڵێت: "باوکم لە ناوەندی شارەکەدا کاریدەکرد کە چەقی هەموو روداوەکان بوو، ئەو زۆرێك لەو ناڕەزاییو گردبوونەوەو رێپوانانەی لەبیرە کە روویانداوە، ئەوەی لەبیرە کە چۆن بەهۆی ئەم خۆپیشاندانانەوە سپیپێستەکان توشی ترسو تۆقین دەبوونو چۆن زۆربەیان سوربوون لەسەر پارستنی ئەو ئەمری واقیعەی کە هەبوو، هاوکات چەندین کەسی تر گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە ئەنجامدانی گۆڕانکاری کارێکە رزگاربوون لێی مەحاڵە"

لە ئایاری ساڵی ١٩٦٣دا هەزاران قوتابی خوێندنگاکان بەشدارییان لە چەند رێپێوانێکی هێمنانەدا کردو لەپێناو ناڕەزایی دەربڕین لە دژی یاساکانی جیاکاری نەژادی لەشارەکە، بۆ ماوەی چەند رۆژێك نەچوونە قوتابخانە، بەڵام ئەم قوتابییانە نەیاندەتوانی پێشبینی مەودای ئەو مەترسییە بکەن کە لە ئەنجامی ئەو جموجۆڵەیاندا رووبەڕوویان دەبێتەوە.

پۆڵ کۆنەر کە جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستبوو و فەرمانگەی پۆلیسو تیمەکانی ئاگرکوژێنەوەی لەژێردەستدابوو، هەوڵیدا خۆپیشاندانەکان بوەستێنێت. بەوپێیەی رێپێدراوی حکومەت بوو ئەوەی لەتوانایدابوو بۆ زیادکردنی هەستی رەگەزپەرستی لەناو کرێکارە سپیپێستەکانو پاراستنی سیاسەتی جیاکاریی نەژادی لە بیرمنگهام، خستییەگەڕ. لە هەوڵێکدا بۆ وەستاندنی بزووتنەوەی مافە

مەدەنییەکان لە ئەلاباما، چەندین یاسای لە ویلایەتەکەدا دەرکرد لەوانە قەدەغەکردنی بزووتنەوەی گەشتەکانی ئازادی، سەبارەت بە بەشداربووەکانی ئەو گەشتانە دەیوت چەند گێرەشێوێنێکن کە رووبەرووی شێوازی ژیانمان دەبنەوە.

لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٦٣دا هیچ ئاماژەیەك نەما کە بەڵگە بێت بۆئەوەی ئەم خۆپیشاندانانە بەرەو دامرکان ملدەنێن، هەربۆیە پۆڵ کۆنەر ناچاربوو فەرمان بەپۆلیس بکات لەپێناو بڵاوەپێکردنی خۆپیشاندەراندا، هێز بەکاربهێنن. پۆلیس سەگو سۆندەی ئاویان بۆ بڵاوەپێکردنی خۆپیشاندەران بەکارهێنا، ئەمانەش دوو هۆکاربوون کە پێشتر لە رووبەروبوونەوەی گردبوونەوەدا، دورخرابوونەوەو بەکارنەدەهێنران. بەهۆی ئاوی بەهێزی سۆندەکانەوە چەندین منداڵ لەسەر شەقامەکە کەوتن بەزەویداو سەگەکانیش کە لەجۆری شیفرد-ی ئەڵمانی بوو گازیان لە چەندین کەس گرت. یەکێك لە وتارەکان بەناوی **بەکارهێنانی سەگو ئاو بۆ وەستاندنی بەرەوپێشچوونی رێپێوانی کۆیلە رەشەکان** کە لە سەرەتاکانی مانگی ئایار لە رۆژنامەی **مۆنتگۆمری ئەڤەرتایزەردا** بڵاوکراوەتەوە، دیمەنێك لەو خۆپیشاندانانەی باسکردووەو نووسیویەتی:

"پیاوانی ئاگرکوژێنەوە ئامادەیان بەسۆندەی ئاوەکان دەکردو پۆلیسێکیش بەهۆی بڵندگۆوە هۆشداری دەداتە خۆپیشاندەرانو دەڵێت: بڵاوەبکەن ئەگینا تەڕدەبن، بەڵام ئەو هەرزەکارانەی تەمەنیان لەنێوان ١٣و ١٦ ساڵدابوو، لەبەرەوپێشچوون، بەردەوامبوون. ئاو بەلێزمە دابارییە سەر خۆپیشاندەرانو کەوتنە لەرزین، دەستیان خستە سەر سەریانو چەمانەوە، دواتر لە هەوڵێکدا بۆ مانەوەیان لە شوێنەکانیاندا، قۆڵی یەکیان گرت. ژنێك بەناوی ڤیڤیان لۆی، خوێنی لوتی بەربوو. ئەو ژنە دەڵێت بەهۆی فشاری ئاوی سۆندەکانەوە برینداربووە. کچێکیش کە ناوەکەی نەزانراوە هەربەهۆی فشاری ئاوەوە، برینداربوو.... کۆیلەیەکی رەشتپێستی تریش کە هێنری لی شامپری-یان پێ دەوتو تەمەنی ٢٤ ساڵان بوو، دەڵێت دوو سەگی سەربە پۆلیس گازیان لێگرتووە. ئەو دوو سەگە زۆربەی هەرەزۆری یەکێك لە قاچی پانتۆلەکەیان دڕیبوو و جلوبەرگی ژێرەوەشی بەخوێن پیس ببوو"

هەرچەندە پشتگیری ئامانجەکانی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکانیان دەکرد، بەڵام جۆن و ئەنجێلینا هەرگیز بەو شێوازە نارەزاییە دەربڕینە رازی نەبوون کە لە بیرمنگهامدا بەکارهێنرا. بەلای ئەوانەوە دیاربوو بایکۆتکردنی بازاڕە کۆفرۆشەکان شتێکەو منداڵ خستنەبەر مەترسی ئازاردان شتێکی ترە هەربۆیە ئەو شێوازەیان بەدڵ نەبوو. جۆن پشتگیری رێپێوانە نارەزاییەکانی قوتابیانی خوێندنگەکانی نەکرد لەبەرئەوەی بڕوای وابوو کە هەڕەشەکردن لە ئاسایشی منداڵ هەنگاوێکە بەرەو ئاراستەیەکی هەڵە. رێپێوانی قوتابییەکان بووە جێگرنگیی وڵات و خوێندکارانی جۆن دەیانویست هەڵوێستی لەبارەی ئەو رێپێوانانەوە بزانن. جۆن هانیدان لە قوتابخانەکەدا بمێننەوەو بەعەقڵ خەبات بکەن.

کۆندی دەڵێت: "باوکم ئەو ئامۆژگارکارە نەبوو کە ئامۆژگاری بکات بۆ رێپێوان بەسەر شەقامەکانداو هیچ هۆکارێکی نەدەبینی بۆ ئەوەی منداڵان بخاتە مەترسییەوە. هەرگیز کچەکەی نەخستۆتە مەترسییەوە". جۆن کاتێک گردبوونەوە لەسەر گردبوونەوەی منداڵان و هەرزەکارانی دەبینی کە شەقامەکانیان دەبڕی، لەوە تێگەیشت کە مێژوو لە بەرژەوەندی ئەواندایە، هەربۆیە ویستی بیرۆکەیەك سەبارەت بەوەی کە روودەدات، بداتە کۆندی کە ئەوکاتە تەمەنی هەشت ساڵان بوو. بەهۆی بەشداریکردنیان لە چەند رێپێوانێك لە ئایاری ساڵی ١٩٦٣دا، رۆژێك چەند منداڵێك لەوانەی لەنزیك ماڵی خێزانی رایس نیشتەجێبون، دەستگیرکران، هەربۆیە جۆن، کۆندی بردە شوێنێکی تر لە خۆرئاوای شارەکە کەتێیدا چەندین نەوجەوان دەستگیرکرابوون و لە خێوەتگادا کۆکرابوونەوە. جۆن سەرنجیدا هەندێك لە قوتابی و دراوسێکانی لەناو دەستگیرکراوەکاندان، هەربۆیە ویستی لە ئاسایشیان دڵنیابێت. جۆن کۆندی خستەسەر شانی و بەناو قەلەبالغییەکەدا رۆیشت. پێشتریش هەر ئەو رۆژە جۆن و کچەکەی پێکەوە خۆپیشاندانەکانی ناوچەی ناوەندی بازرگانی شارەکەیان بینیبوو، بەڵام ماوەی نێوانیان لەگەڵ خۆپیشاندانەکان هێندە بوو کە زیانیان بەرنەکەوت.

وێستگەی تەلەفزیۆنە نیشتمانییەکان رومالی ئەو دیمەنانەیان دەکرد کەتێیدا پیاوانی پوڵ کۆنەر لەو هاوینەدا سەگو سۆندەی ئاویان لە دژی مندالان بەکاردەهێناو کێشە پەرەسەندووەکانی بیرمنگهام بووە جێی گرنگیی ملیۆنەها ئەمەریکی. لە ئایاری سالی ۱۹٦۳ سەرۆك کینیدی رایگەیاند کاتی ئەوە هاتووە کۆنگرێس "بجولێتو ئەو پابەندبوونە رابگەیەنێت کە لەماوەی ئەم سەدەیەدا لە پابەندبوون پێیەوە دواکەوتووەو پەیوەندی بەو بیرۆکەیەوە هەیە کەدەلێت نەژاد لە ژیان یان یاسای ئەمەریکادا جێگەی نابێتەوە". هەر ئەو مانگە ئیدارەی سەرۆك دەستیکرد بەئامادەکردنی پرۆژەیاسای مافە مەدەنییەکان.

لە پایزی سالی ۱۹٦۳دا تراژیدیایەك روویدا کە شەرەکانی بیرمنگهامی گەیاندە ئاستێکی مەترسیداری نوێوە. بەرەبەیانی ۱٥ی سێپتەمبەر کۆمەلێك نوێژخوێن لەحەوشەی کلێسەی مەعمەدانی کە دەکەوێتە شەقامی ۱٦هەمەوە کۆدەبنەوە کە چەند خێزانێکی دیاری رەشپێستەکانی تێدابوو. قاتی خوارەوەی کلێسەکە پۆلەکانی قوتابخانەی یەکشەممەبوون کە پرِبوون لەو مندالانەی تازە خەریکبوو دەستیان دەکرد بەخوێندن. لەیەکێك لە ژووره پرِ لە مندالەکاندا چوار کچ هەبوون کەئەوانیش دینیز ماك نایەری تەمەن ۱۱ سالانو کارۆل رۆبەرتسۆنو سینیساویسلیو ئەدی مای کۆلنز بوون کەئەم سیانەی دواییان لە تەمەنی ١٤ سالاندا بوون. لەسەعات ۱۰.و بیست خولەکدا بۆمبێکی دینامیت دای لە بالەخانەکەو چالێکی لە دیواری ئەو ژورەدا دروستکرد کە مندالەکان تێیدا کۆبوونەتەوە. بەهۆی ئەوەوە ئەو چوار کچە گیانیان لەدەستداو کەوتنە ژێر دیوارە روخاوەکانو دەیان مندالو کەسی پێگەیشتووی تریش برینداربوون.

دەنگدانەوەی ئەو تەقینەوەیە لە هەموو شوێنێکی شارەکەدا بیسترا بەکلێسەی مەشیەخیەشەوە لە بیرمنگهام کە دوو میل لە شوێنەکەوە دووربوو، کۆندیش بەهۆی ئەوەوە هەستیکرد کە زەوی لەژێر پێیدا دەلەرزێت. کۆندی لەبارەی ئەم روداوەوە قسەدەکاتو دەلێت: "لەبیرمە کە هەستمکرد شتێك دەلەرێتەوە، بەلام لەرینەوەیەکی هێواش بوو. دواتر خەلکی ناوی ئەوانەیان زانی کە لە کلێسەکەدا کوژران" کۆندی زانی کە یەکێك لە کچەهاورێکانی لە پۆلەکانی

دايەنگەدا كە دينيز ماك نايەر بوو و لەناو چوار كچەكەدا بچوكترينيان بوو، يەكێكە لە قوربانييەكان.

خێزانى رايس ئامادەى ئەو ماتەمينييە بوو، كە وێنەكەى لە مێشكى كۆنديدا ئێستاش ماوەتەوە. سەبارەت بەم يادەوەرييە دەڵێت: "ئەوەندەى كفنەكانم لەبيرە هيچ شتێكى ترم لەبير نايەت... كفنە بچووكەكان. ئەو هەستەم لەبيرە كەپێموابوو بيرمنگهام ئەو شوێنە نييە كە ئاسايشى رەهاى تێدا هەبێت".

پێش دوو مانگ لە نۆيەمين جەژنى لەدايكبونى، كۆندى لەوە تێگەيشت كە رقو كينەو خوێنرشتن لەپشتى ئەو بەهەشتەوە خۆيان حەشارداوە كە دايكو باوكىو كۆمەڵگەكەى بەوردبينييەوە، دروستيانكردووە. ئەو تێگەيشتنە بۆ ئەو زۆر تاڵبوو.

لە كەيسى ئەو چوار تاوانبارەدا، دادگا رێژەوێكى زۆر سستى گرتەبەر تا دواجار لە ساڵى ٢٠٠٢دا حوكمى كۆتايى دا. تيمێك كە لە نۆ سوێندخۆرى سپيپێستو سيانى رەشپێست پێكهاتبوون، بوبى شيرى ـ يان بەتاوانى كوشتن ئيدانە كرد كە لە تەمەنى ٧١ ساڵاندابوو. لە ساڵى ٢٠٠١يشدا دادگا تۆماس پلانتۆنو لە ١٩٧٧يشدا رۆبەرت شامپليس ـ ى ئيدانە كرد، بەڵام پياوى چوارەمى باندەكەى كلان كە تۆمەتبار هێرمان كاشبوو، پێش ئەوەى بەفەرمى ئيدانە بكرێت، كۆچى دواييكرد.

جۆن رايس هەوڵيدا كچەكەىو نەوجەوانانى ترى بيرمنگهام لە ڤێزەونيى جياكارى نەژادى لابدات، بەڵام نەيتوانى بەبەردەوامى خۆى لە كاريگەرييەكانى ڤێزەونييەكە، لابدات. جۆنو ئەنجيلينا نەياندەتوانى پەيوەندى بەپۆلەكانى زانكۆى ئەلاباماوە بكەن كە چەند باڵەخانەيەكى نيشتەجێبوون لە ماڵەكەيانەوە لە تيتۆسڤيل، دووربوو، لەبەرئەوەى زانكۆكە خوێندكارى رەشپێستى وەرنەدەگرت. لەلايەكى تريشەوە مەحاڵبوو كە ئەم ژنو مێردە دەنگ لەبەرژەوەندى حيزبى ديموكرات بدەن كە پشتگيرى مافە مەدەنييەكانى دەكرد، لەبەرئەوەى نوێنەرانى ويلايەتەكانى باشور يان ئەوەى بە بەديكسيرات ناسرابوون، بەدەستێكى پۆڵايين حوكمى ئەو حيزبەيان دەكردو سووربوون

لەسەرئەوەی کە ڕەشپێستەکان وەك خۆیان بمێننەوە. شایانی باسە لە ساڵی ١٩٤٨دا کاتێك گرووپێك لە دیموکراتەکان بەسەرکردایەتی ستروٚم سێرمۆند لە کارۆلینای باشور کەوتنە بەرهەڵستیکردنی ئەو سیاسەتانەی ترومان کە پەیوەندییان بەتێکەڵکردنی سپێست و ڕەشپێستەکانەوە هەبوو، بالی دیکسیکرات دامەزرا. دیکسیکرات جڵەوی دەستپێشخەرییان لە حکومەتی بیرمنگهامدا وەرگرت و ئەمەش پێویستی بەپرۆسەی دەنگدانی ناوخۆی حیزبی دیموکراتەکان لە شارەکەدا هەبوو.

پاش بڕیاردانی هەمواركردنی ١٥هەم لە ساڵی ١٨٦٩دا، ڕەشپێستەکان مافی دەنگدانیان بەدەستهێنابوو بەڵام ویلایەتەکانی باشور چەند شێوازێکیان دۆزیبووەوە کەبەهۆیەوە ئەم یاسایەیان پێشێل دەکرد. جێی باسە ویلایەتی ئەلاباما تا پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، یاسای سەپاندنی باج لەسەر دەنگدانی پەیڕەو دەکرد، بەهۆی ئەمەشەوە زۆرێك لە ڕەشپێستەکان لەم پرۆسەیە بێبەشبوون. لە ساڵی ١٩٥٢دا کاتێك جۆن رایس رووی کردە سندوقەکانی دەنگدان، ویلایەتەکە چەند کۆتوبەندێکی تری توندی دەسەپاند. ڕۆژنامەنووس ویلێ های گۆد لەوتارێکدا کە لە ڕۆژنامەی بۆستن گلۆب بڵاویکردووەتەوە، دیمەنی ئەو ڕۆژە باسدەکات، لە بەشێکیدا هاتووە:

"لە ساڵی ١٩٥٢دا خودی جۆن لە بیرمنگهام رووی کردە سندوقەکانی دەنگدان. ئەم پیاوە بە بەڵگەنامەکانییەوە کە تایبەتبوون بەوەی قەشەیەو دەرچووی زانکۆیە، وەستا. پیاوێك ئاماژە بۆ دەفرێکی شوشەیی دەکات کە پڕە لە دانەوێڵەی فاسۆلیاو بەقەشە جۆن رایس دەڵێت کاتێك دەتوانێت دەنگبدات ئەگەر بتوانێت ژمارەی ئەو دەنکە فاسۆلیایانەی ناو دەفرەکە بخەمڵێنێت".

جۆن لەلایەن هەندێك لە کۆمارییەکانەوە ئەوەی زانیبوو کە پارتی کۆماری ئەم شێوازانە بەکارناهێنێت. هەر لەو ڕۆژەوە جۆن پەیوەندی دەکات بەحیزبی کۆمارییەوەو هەرگیز لێی پەشیمان نەبووە. لە کۆنگرەی نیشتمانیی گشتیی کۆمارییەکاندا کۆندی لەبارەی ئەم بەسەرهاتەوە قسەدەکات کەبەسەر باوکیدا هاتووەو دەڵێت: "باوکم، جۆن رایس، یەکەم کەسی کۆمارییە کەناسیومەو

تانێستاش ئەو پیاوە کۆمارییەیە کە زۆر پێی سەرسامم. باوکم بۆیە پەیوەندی کردووە بەم حیزبەمانەوە چونکە ئەو دیموکراتانەی لە ئەلاباما پشتگیرییان لە یاساکانی جیم کرۆ دەکرد، تۆمارکردنی ناویان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٢دا رەتکردەوە، بەڵام کۆمارییەکان تۆمارکردنی ناوەکەیان پەسەندکرد. ئەمەوێت ئێوە بزانن کە باوکم هەرگیز ئەو رۆژەی لەبیرنەکردووە، هەروەها منیش".

لە دوای مانگی تەموزی ١٩٦٤دا کاتێك سەرۆك لیندۆن جۆنسۆن یاسای مافە مەدەنییەکانی واژۆکرد، خێزانی رایس روداوێکی مێژووییان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بینی. پاش دوو رۆژ خێزانی رایس بۆ یەکەمین جار روویانکردە ریستۆرانتێك لەبیرمنگهام کەپێشتر تایبەتبوو بەسپیپێستەکان. کۆندی دەڵێت: "بۆ ماوەی چەند خولەکێك ئەو کەسانەی لە ریستۆرانتەکەدابوون، دەستیان لەخواردن هەڵگرت"، بەڵام پاش ئەو چەند خولەکە، سەرسوڕمانییەکە نەماو هەریەکەو دەستیکردەوە بەکاری خۆی. گۆڕانکارییەکان لە هەموو شوێنێکدا بەئاسانی روویان نەدا. کۆندی دەشڵێت: "پاش چەند هەفتەیەك رومانکردە چێشتخانەیەك کە ژەمەخواردنی بۆ ئۆتۆمبێل ئامادە دەکرد، کاتێك دەرچووین و دەستمکرد بەخواردنی پارچەیەك هەمبەرگر بینیم تەنها پیازی تێدایە". واژۆکردنی ئەو یاسایەی کە سەرۆکی تیرۆرکراو جۆن کینیدی پێشنیازی کردبوو، لەلایەن جۆنسۆنەوە، بووە هۆی ئەوەی کەسایەتیی جۆنسۆن لەبەرچاوی ئەندامانی خێزانی رایسدا بەهێز بکات. کۆندی پێیوایە بەشێکی گرنگی پرسی مافە مەدەنییەکان لەناخی ئەو کەسانەدایە کە ئەم یاسایانەیان لە ژیانیاندا خستووەتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، هەروەها لەو رەشپێستانەی لە رێگەی فێربوون و رۆشنبیرییەوە، خۆیان بۆ ئەم یاسایانە ئامادەکردووە. کۆندی بەردەوامدەبێت و دەڵێت: "گۆڕانکارییە یاساییەکان جیاوازییەکی بێشوماریان هێنایە دی، بەڵام دوور نەبوون لەو کەسانەی پێشتر خۆیان ئامادەکردبوو تا سوود لەو گۆڕانکارییانە وەربگرن، هەربۆیە توانییان تا زۆرترین رادە سودیان لێ وەربگرن. کەس ناتوانێت ئەم کەسانە لە پرسەکە دووربخاتەوە".

کۆندی درکی بەوە کرد کە تێگەیشتنی دایك وباوکی بۆ جیاکردنەوەی

نەژادی– چۆنیەتی مامەلەکردنیان لەگەڵ ئەوداو چۆنیەتی مشتومڕکردن لەسەر بابەتێك لەگەڵیدا- سەرباری هەڵوێستە چەسپاوەکەیان سەبارەت بەفێربوونو دەسکەوتنی رۆشنبیری، دیارترین جێ پێی لە ژیانی کۆندیدا هەیە. سەبارەت بەتەمەنی منداڵی لە بیرمنگهام دەڵێت: "زۆر پێزانینم بۆ دایكو باوکم هەیە لەبەرئەوەی لەو ماوەیەدا زۆر یارمەتییان داوم. بەوپەڕی گرنگیپێدانەوە هەموو ئەو شتانەیان بۆ ڕووندەکردمەوە کە ڕوویاندەداو بەبێ دەربڕینی هیچ بێزارییەك ئەوەیان دەکرد. هەموو شتێك بەڵگەبوو لەسەر ئەوەی کەفێربوونو رۆشنبیری دەروازەیە.... و تێگەیشتنێك لەناو سەرجەم هاوڕێکانو هەموو ئەو منداڵانەی لەگەڵیان گەورە بووم، بڵاوببووەوە، ئەویش ئەوەبوو کەبەبێ گومان کاتێك گەورە دەبین وەك هەموو ئەمەریکییەکانی تر پەیوەندی دەکەین بەزانکۆ تێکەڵاوەکانەوە".

لە ساڵی ١٩٦٥ باوکی کۆندی کارێکی دەستکەوت کە بۆ ئەو بووە قۆناغێکی نوێی ژیانی پیشەیی. جۆن بەوپێیەی راگری بەرپرسی خوێندکاران بوو لە زانکۆی ستیلمان، بووە بەشێك لەسەرکردایەتی دامەزراوەیەك کەپێگەیەکی باڵای لەمیراتی خێزانی رایسدا داگیرکرد. پێشتریش باپیرەگەورەی رایس واتە باپیرەی کۆندی پاش ئەوەی دەستبەرداری زەوی‌وزار دەبێتو گۆڕانکاری لە ڕێڕەوی خێزانی رایسدا ئەنجامدەداتو وەك بانگخوازێکی کڵێسەی مەشیەخیەی راهێنان دەکات، هاتووەتە ئەم شوێنە.

ئەوکاتەی جۆن وەك راگری خوێندکاران گەیشتە زانکۆی ستیلمان، ئەم زانکۆیە وەك دامەزراوەیەکی راهێنانی قەشە رەشپێستەکان، قۆناغێکی گەورەی لەو ڕێڕەوە بڕیبوو کەبەهۆیەوە لەسەرەتای دامەزراندنییەوە لە ساڵی ١٨٧٦، ناوبانگی پێدەرکردبوو. لە ساڵی ١٩٣٠شدا زانکۆکە خوێندنگەیەکی بۆ راهێنانی کچان لەسەر پیشەی پەرستاری، دروستکرد. لە ساڵی ١٩٥٣شدا ستیلمان وەك زانکۆیەك کە خوێندن تێیدا چوارساڵە، بووە یەکێك لە زانکۆ تۆمارکراوو دانپێدانراوەکانی یەکێتی باشور بۆ زانکۆو خوێندنگە دواناوەندییەکان. پێش گەیشتنی جۆن بەم زانکۆیە بەچوار ساڵ، ستیلمان بەشداری لە سندوقی

یەکگرتوو بۆ زانکۆ رەشپێستەکان کردبوو، ئەم بەشداربوونە ماف ئەوەی پێدابوو کەیارمەتی دارایی لە تەعاونیەتی زانکۆکان وەربگرێت کە هاوکارییەك بوو ٤٠ زانکۆی لەخۆگرتبوو.

دوای ئەوەی جۆن پیشە تازەکەی دەستکەوت، خێزانی رایس ماڵیان گواستەوە بۆ تۆسکالۆزا. ئەم شارە ٦٠ میل لەبیرمینگهامەوە دوورە، هاوکات پەیوەندی ئەم خێزانە لەگەڵ خزمو کەسوکارەکانی تریانەوە بەپتەوی مایەوە، چونکە گەشتکردن لە رێگەی خێرای ژمارە ٢٠ەوە کە ویلایەتەکانی بەیەکەوە دەبەستەوەو تازە کرابووەوەو رێگەکەی کورت کردبووەوە. ئەو پۆستەی کە جۆن وەریگرت، هەنگاوێك لە ژیانی پیشەییدا، بردیە پێشەوەو خستیە دەرەوەی بازنەی فێرکردنی دواناوەندییەوە. لەوکاتەوە جۆن توانی لە چوارچێوەی چالاکییەکانی کڵێسەو چالاکییە خۆبەخشەکانی، لەکارکردن لەگەڵ لاواندا بەردەوامبێت، بەڵام کاری ئەکادیمی بەشێوەیەك گۆڕا کە ئەو لاوە پێگەیشتوانەی دەگرتەوە کە لەتەمەنێکدا بوون گونجاو بێت بۆ وەرگرتنی خوێندنی زانکۆیی. هاوکات قوتابییە پلە یەکەمەکەی ئەستێرە بچوکەکەی، گەورە دەبوو.

# بەشی چوارەم

## شۆپان، شكسپیر، یان سۆڤیەت؟

**بەبیرم نایەت رۆژێك لەرۆژان پێم وابووبێت كە خوێندكارێكی ناوازەم، بەڵام، پێم وایە ژەنیارێكی باشی پیانۆم.**

### كۆندۆلیزا رایس

جۆن بۆ ماوەی سێ ساڵ لە زانكۆی ستیلمان كاریكرد، دوای ئەوە ئۆفەری كارێكی تری خرایە بەردەم كە هاندەرێكی نوێ بوو بۆ خێزانەكە. ئەمجارەیان ئەوەندەی گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوون كاریگەری لەسەر كۆندی هەبوو، ئەو گۆڕانكارییەی یەكەم كە خێزانەكەی بۆ دەرەوەی بیرمنگهام گواستەوە، ئەوەندە كاریگەری لەسەر نەبوو، چونكە ئەمجارەیان خێزانەكە تەنها خزمو هاورێی لە ئەلاباما جێنەهێشت، بەڵكو باشووریان بەتەواوەتی بەجێهێشت. ئەم گواستنەوەیە پاش ئەوە روویدا كە جۆن دەستبەجێ پاش كۆتاییهاتنی خولە هاوینە زانكۆییەكانی لە زانكۆی دێنیڤەرو پاش وەرگرتنی بڕوانامەی ماستەر لە فێركردندا لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٦٩، كارێكی نوێی دەستكەوت. ئەو ساڵە زانكۆی ناوبراو ئۆفەرێكی بۆ پۆستی یاریدەدەری بەڕێوەبەر بۆ كاروباری پەیوەندیكردنی نوێ، پێشكەش كردو ئەوەندەی پێنەچوو دەستیكرد بەوانە وتنەوە.

جۆن رایس هەر لەسەرەتاوە كاری لە هەردوو بواری زانكۆ، واتە ئەكادیمیو كارگێڕیدا كردو دەستیكرد بەهەماهەنگیكردنو وتنەوەی مادەیەك كەپێی دەوترێت ئەزموونی رەش لە ئەمەریكا. بەدرێژایی چەندین ساڵ جۆن كاری لەسەر فراوانكردنی بواری ئەم ماددەیە كرد بەشێوەیەك كە چەندین كەسایەتیی گرنگی خستە چوارچێوەی خۆیەوە، هەروەها چەند ئۆفەرێك لەبەردەم جەماوەردا كرانەوە. ئەو پۆلە پرسی دەنگدەرە رەشپێستەكانو رۆڵی رەشپێستەكان لە سیاسەتی وڵاتو چەندین بابەتی تری كلتوری تاووتوێ دەكرد. جۆن چەند وتارخوێنێكیشی لەسەر ئاستی نیشتمانی بانگهێشت كرد تاكو وانە بڵێنەوە، لەوانە هاوارد رۆبنسۆن، كە بەڕێوەبەری جێبەجێكاری كۆنگرەی هەڵبژاردنی كاندیدە رەشپێستەكانو قەشە شانگ فیلیپس، كە یەكەم كەسایەتی رەشپێستبوو بۆ پۆستی سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكان دیاریبكرێت. ئەڵقەیەكی خوێندنی ئەم زنجیرە لێكۆڵینەوانە دەربارەی ڕەشپێستەكانە لە ئەدەبی میللیدا. ئەم ئەڵقەیە گۆردن پاركس دەرهێنەرو بەرهەمهێنەری هەردوو فیلمی شافت، سەركەوتنە مەزنەكانی شافت پێشكەشی كرد، كە رابەرایەتی مشتومڕی پیاوانی رەشپێستی لەسینەمادا دەكرد.

كۆندی ناوی ژنە وتەبێژێكی تر كەناوی فانی لۆ هامەر بووەو یەكێك بووە لە سیمبولەكانی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەكانو بەوە ناسراوە كە ژنێك بووە "بەهۆی ئەوەی نەخۆشو ماندوو بووە، نەخۆشو ماندوو بووە". فانی لۆ بۆ یەكەمین جار لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا، زانیویەتی كە مافی دەنگدانی هەیەو ئەمەش كاتێك روویدا كە چەند خۆبەخشێكی دەستەی خوێندكاریی هەماهەنگی هێمنانە لەكاتی سەردانیان بۆ شارەكەی، كە دەكەوێتە ناوچەی میسیسیپی، بەمەستی هاندانی رەشپێستەكان لەسەر تۆماركردنی ناویان بۆ دەنگدان، سەردانی دەكەن. فانی لۆو چەند كەسێكی تر خۆویستانە دەچنە بالەخانەی دادگا تا ناوەكانیان تۆماربكەن، بەڵام هەر كە گەیشتنە ئەوێ دەستگیرو زیندانی دەكرێنو زۆر بەتوندی لێیان دەدەن. پاش گەڕانەوەشی بۆ ماڵەوە، فانی چەندین هەڕەشەی كوشتنی پێدەگات، بەڵام سەرباری ئەوەش پابەند دەبێت بەدەستەكەوەو

بەشوێنە جیاكانی وڵاتدا دەگەڕێتو باس لەو پرسە دەكاتو یارمەتی خەڵك دەدات تا ناویان لە لیستی دەنگداندا تۆماربكەن. دواجار فانی بەشداری لە دامەزراندنی باڵی ئازادیی میسیسیپی لە حیزبی دیموكراتەكان دەكاتو ملیۆنەها ئەمەریكی لەو هەڵسوكەوتانەی كەیاساكانی باشوور پێشێلدەكەن، هۆشیاردەكاتەوە، ئەمەشی لەمیانەی رومالكردنێكی تەلەفزیۆنیی كۆنگرەی حیزبی دیموكراتدا، ئەنجام دا كە لە ساڵی ١٩٦٤دا سازكرا.

كۆندی لە وتارێكیدا كە لە پۆلی خوێندكارە دەرچووەكانی زانكۆی ستانفۆرد لە ساڵی ٢٠٠٢دا پێشكەشی كرد، دەڵێت: "هەرگیز ئەو دیدارەم بیرناچێتەوە كە لە تەمەنی هەرزەكاریمدا تێیدا فانی لۆ هامەرم بینی، كەسێكی ئالۆز نەبوو بەشێوەیەك كە رەنگە ئێمە پێشبینی بكەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كەسێكی هێندە كاریگەربوو كە تا ئەم رۆژگارەش بەهێزیی پەیامەكەیم لەبیرە. فانی لۆ هامەر لە ساڵی ١٩٦٤دا ئەوەی رەتكردەوە گوێ لەوانە بگرێت كەپێیان وتبوو جوتیارێك ئەگەر لە خوێندندا گەیشتبێتە پۆلی شەشەم، ناتوانێت یان شایانی ئەوە نییە بەرووداچوونەوەیەك هەڵبگیرسێنێت كە ببێتە هۆی كەرتوپەرتكردنی پێكهاتەی جیاكاری نەژادی لە حیزبی دیموكراتەكان لە ناوچەی میسیسیپیدا. بەڵام فانی توانی ئەو هەڵمەتە هەرچۆنێكبێ دەستپێبكات"

پاش ئەوەی جۆن پێنج ساڵی لەبواری فێركرندا بەسەربرد، زانكۆكە لە ساڵی ١٩٧٤دا پلەكەی لە پۆستی مامۆستاوە بۆ پۆستی پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە مادەی مێژوودا، بەرزكردەوە. هەرچەندە ئەم پۆستە بەپێچەوانەی ئەوەی لە پۆستی پرۆفیسۆری یاریدەدەر باوبوو، سودی دارایی نەبوو بە نموونە سودمەندبوون لە بیمەی كۆمەڵایەتیو پلەپەیژەی موچەو تەنانەت لە هەلی هەنگاونایش بەرەو جێگیربوون، بەڵام هەموو ئەمانە نەیانتوانی ببنە رێگر لەبەردەم توانای جۆن كە ژیانێكی خۆشو شیاو بۆ خێزانی رایس دابین بكات. جۆن سودی لەو داراییە دەبینی لە ئەنجامی گرتنەدەستی پۆستە كارگێڕییەكان وەریدەگرت، بەڵام بەلای خۆشیەوە، سودی گەورەی پۆستەكەی لە فێركردندا، تواناكەی بوو لەسەر كاركردنەسەر پرۆگرامی خوێندنی رەشپێستەكان لە زانكۆكەدا. بۆ یەكەمین جار

جۆن خۆی بەشێوەیەك بینی کە ئەو پرسانە دەڵێتەوە کە خودی خۆی لەسەر ئاستی زانکۆ تاقیکردوونەتەوە، هەر لە یاساکانی جیاکاری نەژادییەوە بگرە کە ناوچەی باشوری رەگەزپەرستی پێ جیادەکرایەوە تا دەگاتە خۆپیشاندانەکانی بیرمنگهام و رۆڵی فێرکردن لە دەرکەوتنی سەرکردەی رەشپێستدا. جۆن بینیشی کەوتۆتە ناوەندێکەوە کە کارە رۆژانە نزیکەکەی لە خەڵك وەك قەشەو راوێژکارو مامۆستایەك لە بیرمنگهام، بووەتە مادەیەك کە نەوەیەکی نوێ فێری ئەوە بکات مەبەست لەپەروەردەکردنی پیاوێکی رەشپێست لە باشوردا چییە.

لە ماوەی ئەو ١٣ ساڵەی لەو زانکۆیەدا کاریکرد، جۆن رایس ژمارەیەك پۆستی جۆراوجۆری کارگێڕی وەگرت. لە ساڵی ١٩٦٩دا سەرباری پۆستەکەی وەك یاریدەدەری بەڕێوەبەر بۆ پەیوەندیکردنی نوێ، بووە یاریدەدەری راگر لە کۆلێژی هونەرو زانستدا. لە ساڵی ١٩٧٢دا جۆن لە پلەبەرزکردنەوەیەك سودمەندبوو و بەهۆیەوە بووە راگری بەشدار، ماوەیەکی کەمیش وەك یاریدەدەری جێگری راوێژکار بۆ کاروباری خوێندکاران کاریکردووەو لە ساڵی ١٩٧٤یشدا بووە جێگری راوێژکار بۆ داهاتەکانی زانکۆ.

جۆن رایس وەك راگری بەشدار، یارمەتی لە گۆڕینی زانکۆکە بۆ سەنتەرێکی رۆشنبیری بۆ رەشپێستەکان، کردووە. ئەم پیاوە لە ساڵی ١٩٧٢دا دەڵێت: "زانکۆی دێنیفەر هۆشیارییەکی زیاتری سەبارەت بە کێشەی کەمایەتییەکان پەیداکردو دیارە دەیەوێت زیاتر لە ڕابردوو لەو کێشانە تێبگات. هەستدەکەم ئێمە توانیمان سەرکەوتن لەوەدا بەدەستبهێنین کەوا بکەین تۆپەکە بەو ئاراستەیە بجوڵێت کە ئەم زانکۆیە بکاتە یەکێك لەو زانکۆ کەمانەی کە چەمکێکی راستەقینەی بۆ فرەیی لە ژیانی ئەمەریکیدا هەبێت". ئەوکاتە جۆن پابەندبوونێکی نوێی بەهێنانی مامۆستای رەشپێستی زیاتر بۆ زانکۆو هاندانی خوێندکاری رەشپێستی زیاتر بۆ چوونەناو زانکۆ، راگەیاند. جۆن بەردەوامدەبێت و دەڵێت: "لەم رۆژانەدا هەست بەبوونی هۆشیارییەکی تەواو سەبارەت بەکلتوری رەشپێستەکان لەناو زانکۆدا دەکەم هیوادارم لەماوەی ساڵی داهاتوودا تێگەیشتنێکی قوڵتر بۆ ئەم کلتورە دروستببێت". جۆن و ئەنجێلینا دیقەتیان گرت کە سەرنجراکێشترین

سیمای زانکۆکە شوێنەکەیەتی‌و هەستیانکرد کە ئەمە تەنانەت لەئەو هەلی فێربوون دڵنیاییەش کە کارەکە پێیان دەدات، گرنگترەو بۆیان روونبووەوە کەگواستنەوە بۆ دێنیڤەر گۆڕانکارییەکی پۆزەتیڤی بۆ کچەکەیان دروستکردووە.

ئەو ماوەیەی نێوان تۆسکالۆزاو دێنیڤەر کە ١٣٠٠ میل بوو، بۆ کۆندی خوێندکاری دواناوەندی، لەرووی جۆرایەتییەوە، ئەو گرنگییەی نەبوو، هەروەها لەرووی جیاوازی کەشوهەواشەوە واتە لەنێوان ئەو کەشوهەوا ئیستیوایییە باراناوی‌و شێدارەی لە ئەلاباما‌دا هەبوو لەگەڵ ئەو بەرزاییانەی شاری دێنیڤەر کە هەموو ساڵێك نزیکەی ٦٠ ئینج بەفریان تێدا دەباری. ئەم گۆڕانکارییە بەگۆڕانێکی سادەو کەمتر هەژماردەکرێت بەرامبەر بەو گۆڕانەی لەو هەستیارییەی نێوان تۆسکالۆزاو ئینجلود-دا هەبوو کە ئەو گەڕەکە هێمنەی دێنیڤەر بوو کۆندی تێیدا خوێندنی قۆناغی دواناوەندی دەستپێکرد. ئینجلود دراوسێی باشوری دێنیڤەر بوو، ئەویش ئەو گەڕەکەیە کە کاتێك خێزانی رایس نیشتەجێبوون لە شارەکە، ماڵێکیان تێدا کڕی. لەوێ کۆندی پەیوەندی کرد بە ئەکادیمیای سانت ماری کە خوێندنگەیەکی کاسۆلیکی تایبەت‌و زۆر جیاواز بوو لە هەموو ئەو خوێندنگانەی لە ئەلاباما پەیوەندی پێوە کردبوون. ئەو کاتە کە تەمەنی ١٣ ساڵان بوو، بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا پەیوەندی کرد بەخوێندنگەیەك کەتێیدا رەشپێست‌و سپیپێستەکان بەتێکەڵاوی‌و پێکەوە دەیانخوێند.

خوێندنگای سانت ماری بەسیستەمە ئەکادیمیە توندەکەی شانازی دەکات. کۆندی لەوێ وەك خوێندکارێکی دواناوەندی خۆی لەناو کۆمەڵێك خوێندکاردا بینییەوە کە لەرووی تەمەنەوە لەخۆی گەورەتر بوون‌و هەمان ئەو هەستی کێبەرکێیەیان تێدابوو کە وەك شتێکی رەسەن لە کۆندیدا هەبوو. ئەو قوتابخانەیە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لەسەردەستی چەند ژنە قەشەیەکی لۆریتۆ دامەزرێندراوەو مەبەست لێی فێرکردنی کچانی ئەو خێزانانە بوو کە لەو سەردەمەی بە پەتای ئالتونی وەرگرتنی زانست ناسراوە، روویانکردبووە رۆژئاوا. لە ساڵی ١٨٦٤دا سێ ژنە قەشەی سەربە کڵێسەی ژنە

قەشـــەکانی لۆریتـــۆ لـــە ســـانتاڤ هەڵبـــژێردران تـــا دەستپێشـــخەری دامەزرانـــدنی خوێندنگەیـەك بكـەن، هەربۆیـە ئـەو ژنـە قەشـانە بەسـواری گالیسـكەیەك كـە ئێسـتر رایدەکێشـا چـوونە دێنیڤـەر. بـەو شـێوەیە ئـەو ژنەقەشـانە خوێندنگەی سانت ماریيان دامەزراند كە پێكهاتبوو لە بالەخانەیەكی دوو نهۆم. لە سـاڵی ١٨٧٥ دا یەكـەم كچـەخوێندكاری دواناوەنـدی لـەم خوێندنگەیـە دەرچـوو كەئـەویش خـاتوو جیسـی فۆرشـی بـوو، خوێندنگەكـە بڕوانامـەی بـەو كچـە دا كـە یەكـەم بڕوانامـــەبوو لـــە ســـنووری خۆرئـــاوای میسیســـیپیدا. خێزانـــە كاســـۆلیكیو ناكاســـۆلیكییەكانیش لەســـەر ئـــەوە راهـــاتبوون كەكچـــەكانیان دەنـــاردە ئـــەو قوتابخانەیـــە تـــا لـــەوێ جگـــە لەبابەتـــە ئەكادیمییـــە باوەكـــان، فێـــری خوێنـــدنی جۆراوجـۆرو هەڵسـوكەوت جـوانی بـبن لـە رێگـەی بایەخـدان بەهونـەرو زمانـە بیانییەكانەوە.

خوێنـــدنگای ســـانت مـــاری زۆر لـــە زانكـــۆی دێنیڤـــەرەوە دوور نییـــەو هەردووكیشـیان دەكەونـە سـەر یـەك شـەقام. بەدرێـژایی چـەندین سـاڵ ئـەو خوێندنگەیـە لەسـەر ئـەوە راهـاتبوو كـە كچـانی راگرانـی زانكۆكـەی فێردەكـرد. هـەواڵی ئـەم خوێندنگـە نایابـە نزیكـەی ناوچـەكە بەشـێوەیەك بڵاوبـووەوە كـە چـەند بەڕێوەبـەرێكی زانكۆكـە خوێندنگەكـەیان هەڵبـژارد تـا ببێتـە شـوێنی فێربوونی كچەكانیان، جۆن رایسیش لەمە بەدەر نەبوو. بەڕێوەبـەرێكی پێشـووی زانكۆكە دەڵێت: "دیارە زۆرێك لە خەڵك هـەواڵو كـاری ئـەم خوێندنگەیـەیان لـە رێگـەی كەسـانی نـاو زانكۆكـەوە دەبیسـت نـەك لـە رێگـەی نێوانگیرەوە، دیـارە پەیوەنـدیكردنی كچـانی راگرانـی زانكـۆی دێنیڤـەر بـەم خوێندنگەیـەوە بـووە نەریتێكی زانكۆكە". خوێندنگەكە مەرجی ئەوەی دانەنابوو كە لـە كاسـۆلیكەكان بن هەربۆیە توانی كچانی هـەموو ئـاینو بیروباوەڕەكان بـۆلای خـۆی رابكێشـێت. راهیبـە سـیلڤیا پۆڵتـەر بـاس لـەوە دەكـات كـە لـە شـارەكەدا تێكـەڵاوكردنی رەشپێستو سپیپێستەكان تاڕادەیەك سستبوو و دەشڵێت: "لەبیرمە لە سالەكانی چلەكانی سـەدەی رابـردوودا راهیبەیـەكی هـاوڕێم كـە بەڕێوەبـەری یـەكێك لـە خوێندنگـە سـەرەتاییەكانی ئێـرە بـوو، كچـەقوتابییەكی بەنـەژاد ئەفـەریكی لـە

خوێندنگەكە وەرگرت، بەڵام ئەوەندەی پێنەچوو زانیمان كە گەورەی قەشەكان لەتورەییدا بەهۆی ئەموەرگرتنەوە، خەریك بوو گیان لەدەستبدات. ئەم كچەقوتابییە لەبەر هۆكارێك پەیوەندی نەكرد بەقوتابخانەوە، بەڵام ئەوە لە چلەكانی سەدەی رابردوودا شتێكی باوبوو، بەڵام كاتێك كۆندی هات چەندین كچەقوتابی رەشپێستمان لەلا هەبوو"

لەساڵی ١٩٦٩دا كاتێك كۆندی پەیوەندیكرد بە قوتابخانەی سانت مارییەوە، قوتابخانەكە تازە لە دروستكردنی بینای دواناوەندی تەواوببوو كە ناوی هۆڵی بۆنفیلز بوو. خوێندنگا تایبەتەكانی پۆلە بنەرەتییەكان، تێكەڵاوبوون، بەڵام قۆناغی دواناوەندی خوێندنگەیەكی لەخۆگرتبوو كەتەنها تایبەتبوو بەكچان. وەك خوێندنگەكانی تری كۆلاورادۆ قوتابخانەی سانت ماری هەرچەندە لەرووی رەگەزە تێكەڵاوبوو، بەڵام زۆربەی خوێندكارەكانی لە سپیپێستەكان بوون. كۆندی یەكێكبوو لە سێ كچەخوێندكاری رەشپێست كە لە پۆلێكی ٧٠ خوێندكاریدا هەبوون. لە هەفتەكانی یەكەمی پەیوەندیكردنی بەو قوتابخانەیەوە كۆندی دەبوو رووبەرووی هەڵوێستێك ببێتەوە كە یەكەمینجاربوو لەژیانیدا توشی ببێت. راوێژكاری خوێندنگەكە بەخێزانی رایسی راگەیاند ئەو پلانەی كە كچەكەیان لەتاقیكردنەوە پێودانگییەكانی وەرزی یەكەم بەدەستیهێناون، بەڵگەی ئەوەن كە بە كەڵكی خوێندنی زانكۆیی نایەت هەرچەندە تۆماری خاڵەكانی پلەی Aیان لەسەربوو و خاوەنی لیستێكی درێژبوو لە دەسكەوتی ئەكادیمیو مۆزیكیو وەرزشیدا. كۆندی توشی سەرسوڕمان هات، بەڵام دایكوباوكی پشتگوێیان نەخستو هەر ئەوانیش خاوەنی بەرگریكردن بوون لە دژی كۆسپ یان شكستەكاندا. دایكوباوكی پێداگرییان لەسەر ئەوە كردەوەو پێیان وت ئەم نرخاندنە هەڵەیەو پێویستە كۆندی بەتەواوەتی پێشتگوێی بخات، هەرچەندە ئەم ئەركە بۆ كچێكی گەنجی هەستیاری وەك كۆندی كە هەمیشە لەپێشەنگدا بووە، ئاسان نەبوو. سەرباری ئەوەش كۆندی متمانەی بەدایكوباوكی هەبوو و دەستیكرد بەسەرقاڵبوون بەچەند كارێكی تر كە پەیوەندییان بەژیانی نوێیەوە هەبوو لە دێنیڤەر. بەرۆشتن بەرەو ئەم ئاراستە

نوێیە کۆندی توانی زاڵبێت بەسەر ئەو شۆکەی توشی هاتبوو، بەرەوپێشچوونی بەدەستهێنا. کۆندی لەمبارەیەوە دەدوێ‌و دەڵێت: "هەموو ئەوەی لە بیرمە لەوەدا چڕدەبوویەوە کە من بۆ یەکەمین جار جلوبەرگی فەرمی لەبەردەکەم، ڕەنگە زۆر پەرۆش بووبم بۆ ژیان لە دێنیڤەر کەتێیدا دەمتوانی بەدرێژایی ڕۆژەکانی ساڵ، یاری خلیسکان لەسەر بەفر بکەم".

بەگوێرەی قسەکانی بەناوی کۆنی ڕایسی خزمی کۆندی، شتەکە زۆر لەوە زیاتر بوو. کۆنی دەڵێت کاریگەری نێگەتیڤ لە کەسایەتی کۆندیدا جێگەی نابێتەوە، "هەرکە بچێتە جیهانێکی گەورەترەوە، یەکەم پەیام لەو کلتورەوە وەردەگرێت کەجیهانەکەی کۆنترۆڵ کردووە... ئەم پەیامانە لەوە ئاگادارت دەکەنەوە کە تۆ ناتوانیت بەسەرکەوتنەکانت بفڕیت‌و لەڕاستیدا هیچ زیرەکی‌و هەلێکت نییە تا بەهۆیانەوە دەسکەوت بەدەستبهێنیت، بەلام ئەو کاتە بەسەرچوو، کۆندی تەمەن ١٤ ساڵ بڕوای بەوە هەبوو کە دەتوانێت ببێتە ئەوەی کە دەیەوێت". جۆن‌و ئەنجێلینا ڕایس ئەم بیروباوەڕەیان لە مێشکی کچەکەیاندا چاندبوو و کۆندیش نرخاندن‌و ڕێزگرتن لەخۆی‌و متمانەکردن بەخۆی، لەسەروو هەموو شتێکەوە دانابوو. کۆندی لەباسی ئەو ڕوداوەدا دەڵێت ئەگەر منداڵێك دایك‌وباوکێکی نەبێت کە ئەم پشتگیرییە توندەی بکەن وەك ئەوەی باوك‌ودایکی پشتگیری ئەمیان کردووە، ڕەنگە نەتوانێت پاش ئەو ڕوداوەی لە نووسینگەی ڕاوێژکارەکە بەسەریداهات، سەرکەوتن بەدەستبهێنێت. کۆندی پێیوایە ڕەنگە ئەو پەیامە لە مێشکی کیژۆلەیەکدا بچەسپایەو بەهۆیەوە زۆرێك لە هێزی ژیری لەدەستبدایە، بەلام ئەم هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوەی لەبیر نەکردووە کە سەربە خێزانی ڕایس‌و ڕایە کە سێ نەوەی ئەم خێزانە سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەستهێناوە هەربۆیە ئەم لەوە بەهێزترە لەبەرامبەر تەنها دەنگێك لە سەرەتای ساڵی نوێی خوێندندا توشی شکست ببێت.

دیارە شیکردنەوەکەی ڕاوێژکاری قوتابخانەکە نەگەیشتبووە گوێی پرۆفیسۆرەکان یان بەلایەنی کەمەوە نەیتوانی کار بکاتە سەر ڕێزگرتنی پرۆفیسۆرەکان لە کۆندی کە یەکێك بوو لە لێهاتووترین کچەقوتابییەکانی

خوێندنگەکە. راهیبە پۆتلەر، کە مامۆستای وانەی ئاینی کۆندی بوو، دەڵێت: "کچێکی خۆراگرو لەسەرخۆو پێگەیشتوو بوو. زۆرێك لە کچە هەرزەکارەکان توشی چەندین ساتەوەختی سەخت دەهاتن، جا بەهۆی نەبوونی متمانەبەخۆکردنەوە بێت یان تێنەگەیشتنیان لە پرۆسەی پێگەیشتین یان بەهۆی خێزانەکانیانەوە بێت. هیچ یەکێك لەم نیشانانە لە کۆندیدا دەرنەکەوتن‌و بە قۆناغی گومانلەخۆکردن یان شلەژان سەبارەت بەگەورەبوون یان بەو شتانەی پەیوەندییان بەکاروباری خێزانەوە هەبوو، تێنەپەڕی".

تێرێز ساراسینۆ کە ئەمیش مامۆستای کۆندی بوو، ئەو ژینگە خوێندنە باش رێکخراوەی کە خوێندنگەی سانت ماری هەیبوو، بەچەند سیمایەك وەسفدەکات کە ببوونە هۆی ئەوەی خوێندنگەکە لای ئەو خەڵکە ببێتە شوێنێکی سەرنجڕاکێش کە هەوڵیاندەدا منداڵەکانیان لە هەندێك لەو دیاردە پاشاگەردانییانە بپارێزن کە لەشەستەکانی سەدەی رابردوودا باوبوون. تێرێز بەردەوامدەبێت‌و دەڵێت: "خوێندنگەی سانت ماری ژینگەیەکی سەرسوڕهێن بوو و هەموو خوێندنگە کاسۆلیکییەکانیش ناوبانگێکی باشی خوێندن‌و سیستمێکی بەهێزیان هەبوو. بچووکی قەبارەی خوێندنگەکە هۆکارێکی گرنگی سەرنجڕاکێش بوو بۆ خەڵکەکە، ئەمە وێڕای ئەوەی خوێندنگەکە ببووە شوێنێکی ئارام لەماوەی ئەو ئاژاوەگێڕییانەی لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا باوبوون مادده هۆشبەرەکان‌و گۆڕانکاری لەبەها باوەکاندا"،

تێرێز باس لەوە دەکات کە پێگەیشتنی کۆندی وایکردبوو لەناو کچانی خوێندنگەکەدا، بێهاوتا بێت. تێرێز دەشڵێت: "من فێری بیرکاریم دەکرد بەڵام دەمزانی کە زیاتر حەزی بەلای مادده زمانەوانییەکانەوە دەڕوات واتە ماددەی ئینگلیزی، خوێندنی کۆمەڵایەتی، مێژوو و ئەم جۆرە ماددانە. هەرکەسێك لەلای ئێمە منداڵی پەروەردە کردبێت دەزانێت کە چ سیمایەکی تێدا هەیەو چی تێدا نییە. سەرنجم دا بەپلەی یەکەم خاوەنی هاوسەنگییەکی توندە. ئەو کاتە کچێکی جوان‌و دڵگیر بوو، هەڵسوکەتی نموونەیی بوو، ئەمەش بۆ کچێکی تەمەن ١٦ یان ١٧ساڵان، شتێکی نامۆیە. لەسەرجەم ئەو هەڵوێستانەی پێکەوە کۆیکردووینەتەوەو

لە یادمە، وەك خانمێکی نموونەیی دەرکەوتووە. شتێك لەناخیدا بوو کە بەڵگەبوو بۆ ئەوەی لەوە تێدەگات کە دەیەوێتو ئامادەیە لەپێناو گەیشتن بەوەی دەیەوێت، هەموو قوربانییەکی پێویست بدات. پێموایە ئەو وەك قوربانی سەیری ئەم شتانەی نەدەکرد، بەڵکو بەشتێکی پێویستی دادەنا تابەهۆیەوە بگاتە ئامانجەکانی"

کۆندی لەپێناو بەدیهێنانی سەرکەوتنی چەندجارەدا، لە کارەکانی خۆی بەردەوامبوو ئەویش لە رێگەی چەند تەحەددایەکی نوێ کە زیاتر وەرزشیبوون. سەرباری بەردەوامبوون لەسەر خوێندنی وانەی پیانۆژەنین، راهێنانی لەسەر یاری تێنسو خلیسکانی ئیقاعی سەرسەهۆڵ دەکردو لەم دوو بوارەدا چووە ناو پاڵەوانێتییەوە. ئەو کاتە پرۆگرامی رۆژانەی بەشێوەیەك بوو کە لە سەعات ٤:٣٠ ی بەیانی لەخەوهەڵدەسا تا راهێنانە رۆژانەییەکانی ئەنجامبدات کە پێکهاتبوون لە سوڕانەوەی خێرا، رۆیشتنی خێرا، بازدان، سوڕانەوە لەسەر سەری پەنجەی قاچو خلیسکان لەسەر سەهۆڵی دووقۆڵیو چەند جوڵەیەکی جۆراوجۆری تر.

سەرباری ئەو کاتە زۆرەی کە لە خلیسکان لەسەر سەهۆڵ بەسەریدەبرد، پیانۆ وەك چەقی گرنگپێدان لەلای کۆندی مایەوە. کۆندی بەپێی توانای خۆی تا درەنگانێك لە ئەکادیمیا دەمایەوەو راهێنانی لەسەر ژەنین دەکرد، هەروەها لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر هۆڵەکانی راهێنانی زانکۆکەی بەکاردەهێنا، بەڵام خێزانەکەی حەزیان نەدەکرد تا درەنگانێکی شەو لەوێ بمێنێتەوە. خێزانەکەی توانییان بەسەر ئەم کێشەیەدا زاڵبنو قەرزێکیان پەیداکردو پیانۆیەکی گەورەی بەکارهاتووی مارکەی ستاینوای-یان پێ کڕی تا کۆندی هەرکات دەیەوێت تا درەنگانێکی شەو لەماڵەوە راهێنانی پێ بکات. بەم کارەی دایكوباوکی سەرسامبوو. دیبۆرا کارسۆن کە هاوڕێی کۆندییە دەڵێت: "ئەو سەردەمە نرخی پیانۆ زۆر گرانبوو. لەبیرمە پاش چەندین ساڵ باسی ئەم کارەی کرد کە دایكوباوکی ١٣ هەزار دۆلاریان داوە تا ئەو پیانۆیەیان دەسکەوتووە، تا ئەو کاتەش کۆندی هێشتا سەرسوڕمانی بەسیمایەوە دیاربوو". هەرجارێك کۆندی باسی پیانۆ بکات باس لەو وەبەرهێنانە دەکات کە خێزانەکەی لەپێناو راهێنانە موزیکییەکانی، بۆیان تەرخانکردبوو.

كۆندى بەئاسانى پۆلەكانى سانت مارى تەواوكردو هەر كە گەيشتە ساڵى كۆتايى، هەموو پێويستييەكانى تايبەت بەدەرچوونى ئامادەكرد. دايك‌وباوكى هەستيانكرد پێويستە خولەكێكيش بەفيرۆنەدات‌و ئەكاديميا جێبهێڵێت‌و كار لەسەر بەدەستهێنانى بڕوانامەى بەكالۆريۆس لە زانكۆى دێنيڤەر بكات. بيرۆكەى وازهێنـــان لــــە خوێندنگـــەى دواناوەنــــدى تەنانـــەت بەهــــەموو هۆكـــارە قايلكەرەكانيشـــەوە، بـــەدڵى كۆنـــدى نـــەبوو. نـــەيتوانى بەرگـــەى بيرۆكـــەى بەدەستنەهێنانى بڕوانامـەى دواناوەنـدى بكـات، سـەرەڕاى ئـەوەش دەيويسـت بەشدارى لە ئاهەنگى دەرچوونى پۆلەكەيدا بكات. كۆندى لەمبارەوە دەڵێت: "ئـەوە يەكـەمين جاربوو لەگەڵ خێزانەكەمدا لەسەر بابەتێك مشتومڕ بكەم. هەستێكى سادەم لەلا دروستببوو كە دەيوت پێويستە مرۆڤ وانەكانى قۆناغى دواناوەندى تەواوبكات". خێزانى رايس گەيشتنە چارەسەرێكى ناوەندى بۆ ئەم كێشەيە، ئەويش ئەوەبوو كە كۆندى بەشێوەى پارت تايم دەوامى زانكۆيى بكـات‌و هـەمان كـات ساڵى كۆتـايى خوێندنگـەى سـانت مـارى تـەواوبكات. ئـەم ريزبەندييـەش پێويسـتى بـە پرۆگرامێكـى زۆر ماندوكـەر هـەبوو، دەبـوو پـێش هەڵاتنى رۆژ لەخەوهەڵسێت‌و راهێنان لەسەر وانەكانى خليسكانى ئيقاعى سەر ســـەهۆڵ بكـــات‌و دوو مـــاددەى بـــەيانى خوێنـــدنى زانكـــۆش ئامادەبكـــات‌و پاشنيوەڕوانيش خوێندنێكى تەواو لە خوێندنگەى سانت مارى بخوێنێت.

ئەوەنـــدەى نـــەبرد كۆنـــدى لـــەوە تێگەيشـــت كـــە زۆر لـــە پرۆگرامـــەكانى خوێندنگەى دواناوەندى دووركەوتووەتەوەو گەڕانەوە بۆ باوەشى ئارامى سانت مـارى كـارێكى زۆر پێويسـت نييـە. لـەوە تێگەيشـت ئێسـتا بەباشـى دەزانێـت بەدرێژايى رۆژ لە حەرەمى زانكۆدا بمێنێتەوەو بەشدارى لەو چالاكييانەدا بكات كـە يانـــەى كچـــە هاوڕێكـــانى ئـــەنجامى دەدەن، بـــەڵام بەهـــەرحاڵ لـــەو پلانـــە بەردەوامبوو. كاتێك لەگەڵ ياريزانێكى هۆكى، سەمايەكى ئيقاعى لە ئەكاديمياى سانت مارى ئەنجامدا، نمايشەكەى هێندە جوان‌و سەرنجراكێش بوو، بووە هۆى ئەوەى سەرنجى جەماوەر بەلاى خۆيدا رابكێشێت. لەو نمايشەدا كوڕە هاوڕێكەى لەبەرچـاو كچـانى خوێندنگەكـە، وەك ماسـييەكى دەركـراو لـەناو دەركـەوت

بەشێوەیەك كە كۆندی لەبارەیەوە دەڵێت: "ئای چەندە داماوە! وا هەستیكرد وەك ئەوەی لە دەرەوەی ژینگەی خۆیدا بێت"

پەیوەندیكردنی كۆندی لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا بە قوتابخانەی دواناوەندیو زانكۆ لەیەك كاتدا، وەك پەراوێزێك وابوو بەنیسبەت دەسكەوتە موزیكییەكانییەوە. كۆندی لە پێشبڕكێیەكی هونەری لاواندا بەشداری دەكاتو پێشبڕكێكە دەباتەوە، لەو پێشبڕكێیەدا ڕێگەی پێدرا كەچەند پارچە موزیكێكی پیانۆی مۆزارت بەیاوەری ئۆركێسترای سیمفۆنی دێنمڤەر، لە كۆنسێرتێكی موزیكی لە دی مایەنر لێبدات.

لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا كۆندی بڕوانامەی سانت ماری بەدەستهێنا، هاوكات لە پەیمانگەی موزیكی لامۆنت كە سەربە زانكۆی دێنیڤەر بوو، سەركەوتنێكی بەرچاوی لەپیانۆژەنیندا بەدەستهێنا. لەكاتی خوێندنە دوانەییەكەی وەك خوێندكارێكی دواناوەندیو زانكۆیی لە یەك كاتدا، كۆندی بەبەردەوامی بڵاوكراوە زانكۆییە جیاوازەكانی دەخوێندەوەو لەوەش دڵنیابوو كە پاش كۆتاییهاتنی خوێندنەكەی لە سانت ماری، پەیوەندیدەكات بەزانكۆیەكی ترەوەو پەیمانگای جولیار لە ڕیزی سەرەوەی بژاردەكانی دانابوو، بەڵام باوكی حەزینەكرد خوێندنی لە جیهانی موزیكدا بێتو پێیوابوو تایبەتكردنی هەموو هەولەكانی تەنها بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەیەكی تایبەت بە موزیك، چانسی گەڕانەوەی بۆ زانكۆ بەمەبەستی فێربوونی پیشەیەكی تر، كەمدەكاتەوە. كۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "باوكم وەك بنەما دژی ئەم بیرۆكەیە بوو". جارێكی تر ئەم پرسە نەخرایەوە بەر وتووێژ، چونكە پاش ئەوەی كۆندی دوو وەرزی خوێندنی لە زانكۆی دێنیڤەر تەواوكرد، هەستیكرد دڵی چووە بەناو زانكۆكەدا، هەربۆیە بڕیاریدا تێیدا بمێنێتەوە. كۆندی لە بڵاوكراوەیەكی زانكۆییدا كە لە ساڵی ١٩٧٤دا بڵاوكراوەتەوە، دەڵێت:"سەرەتا پلانم دانابوو تەنها بۆ ماوەی ساڵێك بخوێنمو دوای ئەوە بچمە زانكۆیەكی تر، بەڵام مامەوە چونكە هەستمكرد زانكۆی دێنیڤەر ئەوەندە بچوكە بەشێوەیەك خەڵك گرنگی بەوانە دەدات كە بە سەرتا دێن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە بچوك نییە كە بگاتە ڕادەی كۆتوبەندكردنت

سەبارەت بەو بوارەى دەتەويْت بيخويْنيت". كۆندى ستايشى ئەو زانكۆيە دەكات بەهۆى ئەوەى هەلى يەكسانى داوە بە "سەرجەم خويْندكاران بەبىْ ئەوەى رەچاوى رەگەزو ئيتن بكات"، هاوكات دەشلَيْت: "كاتيْك كەسيْكى رەشپيْست يان ميْينە بيت ئەوا پيْويستە لەسەرت هەولَيْكى چەندجارە بخەيتەگەڕ". كۆندى باسى ئەوەشى كردووە كە هەست بەريْزو پيْزانين دەكاتو وەك پيانۆژەنيْكيش هەست بە تەحەدا دەكات. هەستيكرد خەونى پەيوەنديكردنى بە پەيمانگاى جوليارديەوە لەژيْر سايەى لاپەڕەكانى پارچەموزيكەكان كە بەهۆى زۆر بەكارهيْنانو هەلْدانەوەى لە هەموو شەويْكدا ليْوارەكانى داخورابوون، بەرەو نەمان دەچيْت.

بەرهەمى پلە نايابەكانو تۆمارەكانى كۆندى لە خويْندنگەى دواناوەنديدا، لەكاتى پەيوەنديكردنيدا بە زانكۆ، دەركەوت، ئەوەبوو مينحەيەكى شەرەف فيْركردنى بەدەستهيْنا كە هەموو سالَيْكى خويْندن بۆى تازە دەكرايەوە. لەگەلْ ئەوەشدا نەيتوانى زانكۆكە وەك ميْرگيْك لە ميْرگەكانى ئايدۆلۆژياى بيْلايەن، بهيْنيْتە پيْشچاو. رۆژيْك لەسەرەتاى خويْندندا، لە شويْنى قەلەبالْغى وانەدا خۆى بينييەوە، ئەم يەكيْكبوو لەو چەند خويْندكارە كەمە رەشپيْستەى لەناو كۆمەلْە خويْندكارەكاندا هەبوو كە ژمارەيان بە ٢٥٠ خويْندكار دەخەملْيْندرا، هەموويان گوێيان لە پرۆفيسۆريْك دەگرت كە باسى لەوە دەكرد سپيپيْست سەركەوتن بەدەستدەهيْنيْت. بابەتى موحازەرەكە بيردۆزيْكى ويليام شۆكلَى بوو سەبارەت بە جيابوونەوەى نەژادى كە دەلَيْت پەرەسەندنى مرۆڤ بە ريْرەويْكى دواكەوتووانەدا دەڕوات، ئەمەش دەگەڕيْتەوە بۆ ئەو گەلانەى تيْكراى زيرەكييان نزمەو ديارترين نموونەش لەسەر ئەم گەلانە، ئەمەريكييە رەشپيْستەكانن كە زياتر لە سپيپيْستەكان، ژمارەيان زياددەبيْت. ئەم ئايدۆلۆژيايانەى شۆكلَى كە مشتومريْكى زۆرى نايەوە، لە كۆتاييەكانى شەستەكاندا لەسەر ئاستى ولاْت گرنگى زۆرى پيْدرا، هەرچەندە زۆربەى هاوكارەكانى هيچ گويْيان پىْ نەداو بە تەواوەتى پشتگويْيان خست. ئەم گرنگيپيْدانە فراوانەى بە بيردۆزەكانى شۆكلَى درا، دەگەڕيْتەوە بۆ ئەو باكگراوندە نايابەى ئەو كەسە هەيبوو وەك زانايەك كە خەلاْتى نۆبلَى

بەدەستهێنابوو، چونکە پێشتر بەشداری لە داهێنانی ترانزستەردا کردووەو سەرۆکایەتی ئەو تیمەشی کردووە کە نیمچەگەیەنەری داهێناوە، بە پێشەنگێکی سەردەمی کۆمپیوتەریش دادەنرێت. ئەو کاتەی کۆندی چووە زانکۆوە، ئایدۆلۆژیاکانی شۆکلی لەناو زانکۆکانی سەرتاسەری وڵاتدا، جێی مشتومڕێکی زۆربوون.

شۆکلی بڕوای وایە هونەرو ئەدەبو تەکنۆلۆژیاو زانستی زمانەکان، هەموویان گەنجینەی شارستانێتی رۆژئاوان و بەرهەمی ئایدۆلۆژیای نەژادە سپیپێستە سەرکەوتووەکانن. تۆ بڵێی کاتێك ئەو پرۆفیسۆرە بە فراوانی ئەم بیروبۆچونانەی شۆکلی ڕووندەکاتەوە، دیاریشە کە پشتگیرییان دەکات کە گوایە ڕەشپێستەکان "هەر بە بۆماوەیی دواکەوتوون"، چی بەمێشکی کۆندیدا بێت؟ وەنەبێت کۆندی لەترسی ڕووبەڕووبوونەوە لەسەر کورسییەکەی نەجوڵابێت، بەڵکو هەستاو دەستیکرد بە بەرگریکردن لەخۆیو دەستیکرد بەقسەکردنو وتی: "من بە فەرەنسی قسەدەکەم! چەندین پارچەموزیکی بیتهۆڤن لێدەدەم، ئەوەندەی من لە کلتورو شارستانی تۆ شارەزاییم هەیە، تۆ ئەوەندەت نییە، هەموو ئەمانە شتگەلێکن کە دەتوانرێت فێریان ببین!".

پرسەکە تەنها ئەوە نەبوو کە کۆندۆلیزا رایسی تەمەن ١٥ساڵان، بەڵگەیەکی زیندوو بوو لەسەرئەوەی بیردۆزکارە کۆمەڵایەتییەکانی وەك شۆکلی بەهەڵەدا چووبوون، بەڵکو کۆندی ئەوکاتە هێندە متمانەبەخۆکردنو بوێری هەبوو بەشێوەیەك کە بتوانێت لەبەردەم سەدان خوێندکاری سپیپێستو مامۆستا زانکۆییەکەیدا، شتێکی وا بڵێت. سەبارەت بە کاردانەوەی مامۆستاکەی، کۆندی هیچی لەبیرنەماوە، بەڵام ئەوەی لەبیرە کە هەر پۆلەکەی بەجێهێشت، بۆ یەکەمین جار لە ستراتیژی دایكوباوکی تێگەیشت. بنەماڵەی رایس لەوە تێگەیشتبوون کە سپیپێستەکان وەك کەسانێکی ئاست نزمتر لەڕووی بیرەوە، دەڕواننە ڕەشپێستەکان، هەربۆیە ئەگەر کەسێك بیەوێت ئەم تێڕوانینە پێشوەختە بشکێنێت، ئەوا دەبێت تێکڕای سەرکەوتنەکانی زۆر لەپێش ئەوانەوە بێت. هەر لە لەدایکبوونییەوە خێزانی رایس زۆر بە چڕوپڕی چاویان بڕیبووە

كۆندى‌و بۆ ئەوە ئامادەيان دەكرد كە بتوانێت لە هەموو ڕێڕەوەكاندا لەسەر پێى خۆى بەرێگادا بڕوات. كۆندى لەمبارەيەوە دەڵێت: "ئەوە ئەو ستراتيژە بوو كە دايك‌وباوكم پەيڕەويان دەكرد، پێويستە مرۆڤ لەخۆيان زياتر زانيارى سەبارەت بە كلتوريان هەبێت‌و پێويستە لەوە تێبگەن كە بەشێوەيەكى زۆر دڕندانە حوكميان بەسەردا دەدرێت. دايك‌وباوكم دەيانويست لەوە دڵنيابن كە من هەرگيز ناچمە رەوشێكەوە تێيدا لاوازبم"

كۆندى رێگەى نەدا ئەو موحازەرەيە بەسەر ويستيدا زاڵ ببێت، هەربۆيە لە ستراتيژيى سەركەوتنى چەندجارە بەردەوامبوو، ئەوەبوو پەيوەنديكرد بەچەند كلاسێكى ترەوەو بەشدارى لە دەستەى نووسينى رۆژنامەى زانكۆكەدا كرد، هەروەها لەو ستراتيژە بەردەوامبوو كە هەموو بەيانييەك چەند سەعاتێكى لە ڕاهێنان لەسەر خليسكان بەسەردەبردو هەموو شەوێكيش ڕاهێنانى لەسەر پيانۆژەنين دەكرد. كۆندى دان بەوەدا دەنێت كە لەوانەكەيدا كەسێك بووە نەگەيشتووەتە ئاستى نموونەيى‌و لەمبارەيەوە دەڵێت: "لەڕاستيدا لەو كەسانە بووم كە بەشێوەيەكى لە ڕادەبەدەر وانەكانم دوادەخست. كاتێكى زۆر تێدەپەڕى بەبێ ئەوەى خۆم بەتەواوەتى بۆ تاقيكردنەوەكان ئامادەبكەم". پاش چەندين ساڵ لە دەرچوونى، كۆندى ئامۆژگارى خوێندكارەكانى دەكات كە ئەوەى ئەو كردوويەتى، ئەوان نەيكەن، ئامۆژگاريان دەكات كار لەسەر وەرگرتنى ئەو ماددەيە بكەن كە بە درێژايى وەرزى خوێندن دەيخوێنن، تەنها لە ڕێگەى تاقيكردنەوەى چڕەوە، وانە نەخوێنن. هەروەها ئەوەشى بۆ خوێندكارەكانى باسكردووە كە چۆن لە ساڵى يەكەميدا لە زانكۆى دێنيڤەر، يەكێك لە ماددەكانى پشتگوێخستووەو دواتر لەو پشتگوێخستنەى پەشيمان بووە. ئەم ماددەيە باسى ئاينە مەزنەكان دەكات لەجيهاندا. كۆندى دەڵێت: "لەدواساتدا ئەم ماددەيەم خوێندەوەو چوومە تاقيكردنەوەوە، بەلام ئەوەندەى پێنەچوو هەموو شتێكم بيرچووەوە. پاش تێپەڕبوونى ١٥ ساڵ لەوە، ڕۆيشتم بۆ ژاپۆن‌و دەستمكرد بە گەڕان بەناو پەرستگاكاندا. ئەو كاتە بەخۆمم وت: جارێكيان شتم لەسەر ئەم پەرستگايانە خوێندووەتەوە، خۆزگە ئەوەم لە يادبووايە كە خوێندوومەتەوە".

ئەو ئامانجەی کۆندی ماوەیەکی زۆر خستبوویە بەرچاوی بەوەی کە ببێتە پیانۆژەنێکی دانپیانراو، وەك ئەو تەوەرەی کە گرنیپێدانەکانی بەدەوریدا دەسورانەوە، مایەوە، بەڵام هەرکە گەیشتە نێوان ساڵی دووەمی زانکۆو ساڵی پێش دەرچوونی، ئەم پلانەی کۆندی توشی دارمانێکی کتوپڕ هات. ئەو هاوینە ئامادەی فێستیڤاڵی موزیکی بەناوبانگی ئەسپین بوو و خۆی خستە ناو سەختترین کێبەرکێ لە مێژووی ژیانیدا. کۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "لەم کێبەرکێیەدا چاوم بەچەند نەوجەوانێك کەوت کە لە تەمەنی ١١ ساڵیدا بوون و ئەوەم بینی کە چۆن توانییان چەند پارچە موزیکێك بۆ یەکەمینجار لێ بدەن، ئەو پارچە موزیکانەی کە من ساڵێکی تەواوم پێویستبوو کە راهێنانیان لەسەر بکەم. بیرم لەوە کردەوە کە رەنگە سەرەی من بێت و پیانۆ لە هۆڵێك یان لە نۆردستڕۆم بژەنم، بەڵام ناتوانم لە هۆڵی کارنیجی، موزیك لێ بدەم" کۆندی بڕیاریدا ئەگەر نەتوانێت ئەم ئامانجەی بهێنێتەدی واتە ئەگەر نەتوانێت ببێتە ژەنیارێکی دانپیانراو لە ئۆرکسترا سیمفۆنییەکان و ژەنینی چەند پارچە موزیکێکی مۆزارت و بیتهۆڤن لە شانۆ بەناوبانگەکانی جیهاندا، ئەوا بەتەواوەتی دەستبەرداری لە پرۆگرامەکەی دەهێنێت. پێشتر ئەم بیرۆکەیە دزەیکردبووە ناو مێشکی کۆندۆلیزاوە، بەڵام ئەزموونی ئەسپین وایلێکرد بەتەواوەتی خۆی یەکلاییبکاتەوە.

دارسی تایلۆر کە لە پەیمانگای موزیکی لارمۆنت، هاوڕێی کۆندی بوو، دەڵێت: "خواستەکانیان بۆ پیانۆ لەدەستدا. کۆندی بەهرەیەکی زۆری هەبوو بەڵام بڕیاریدا کە ئەم پسپۆڕییە بۆ ئەو دروستنەکراوە. هەموومان لەژەنیندا ناوازە بووین بەڵام بەوپەڕی روونییەوە دەڵێم کە کەسانی وامان دەناسی زۆر لێهاتوو بوون. دەمانزانی کە ژمارەیەکی زۆر بۆ ژەنین لە ئاهەنگە موزیکییەکاندا هەڵنابژێردرێن چونکە ژمارەیەکی زۆر شوێنی بەتاڵ نەبوو. من و ئەو لەوە تێگەیشتین کە کۆتاییەکەمان بۆ نموونە فێرکردن یان ژەنین لە کڵێسە یان سەرکردایەتیکردنی کۆرس، دەبێت. پێویستبوو لەسەرمان کە رووبەڕووی ئەو راستییە ببینەوە کە ناتوانین بگەینە جیهانی ئاهەنگە موزیکییەکان، هاوکات

بەوەش رازى نەدەبووين كە ببينە دوو كچە ژەنيارى لاوەكى".

دارسىو كۆندى وا راهاتبوون سەبارەت بە راستييە تالەكانى جيهانى موزيك، دڵنەوايى يەكيان دەدايەوەو وەكو جاران حەزيان بە ژەنينو كێبەركێ لەبەردەم ئەو پرۆفيسۆرانەدا نەدەكرد كە بەتەواوەتى گرنگييان پێنەدەدان. دارسى بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "لە چەندين كێبەركێدا بەشداريمانكردو توانيمان ساڵانە چەند ئاهەنگێكى گرنگ سازبكەينو دەبوو موزيكى بيتهۆڤنو باخو شۆپان، بخوێنين، كۆندى زۆر حەزى لە شۆپان بوو. ئەم كێبەركێيانە زۆر شتيان لەو لايەنانەى سەركەوتنەوە فێركردين كە ژيانى موزيكژەنانى پێ جيادەكرێتەوەو لەمبارەيەوە زۆر قسەمان لەگەڵ يەكدا دەكرد. ماندونەناسانە كارمان دەكردو هەندێك جار لەبەردەم ليژنەى برياردان يان ئاهەنگى گوێگرتندا، موزيكمان دەژەنىو سەرنجى ئەوەمان دەدا كە مامۆستاكان سەيرى لاپەڕەكانيان دەكردو لەگەڵ يەكدا قسەيان دەكردو دواتر لە ناوەڕاستى نمايشەكەماندا ژەنينەكەيان پێ دەبڕين. مامۆستاكان باسى ئەوەيان دەكرد كە لەجيهانى راستەقينەدا وايەو پێويستە خۆمان لەسەر ئەوە رابهێنين. من ئەمەم بەدڵ نەبوو، كۆنديش هەمان هەستى هەبوو"

كۆندى نەيدەتوانى ئەوە بهێنێتە پێش چاوى خۆى كە بەدرێژايى ژيانى، ژەنينى پيانۆ بلێتەوەو رێ بە منداڵان بدات ئەوە بكەن كە ناوينابوو "تيرۆركردنى بيتهۆڤن". لەمبارەيەوە دەڵێت: "بريارم دا كە ژيان پێويستەماناى لەوە زياتر بێت". بريارى دا ئاڕاستەى پسپۆڕييەكەى بگۆڕێت. ئەم گۆڕانكارييەى پلانەكەى وەك قومێك لە تاڵى واقيع، دەركەوتو وا دياربوو پێچەوانەى ئەو بيروباوەڕانە دەجوڵێتەوە كە خۆى بۆ خۆى دروستيكردبوون. كۆندى باس لەوە دەكات كە هەر لەمنداڵييەوە خۆى لەگەڵ جيهانى موزيكدا يەكخستووەو پێىوايە لە ئەسپين، توشى تەحەددايەك بوو، كە پێچەوانەى ئەمەبوو و بەهۆى ئەمەشەوە ناچاربوو بوارێكى تر بدۆزێتەوە كە ئەويش هەمان تەحەدداى هەڵگرتبێت، بەڵام هاوكات كێبەركێيەكى كەمترى تێدا بێت. شايانى باسە زۆرێك لەو كەسانەى خەونەكانيان لەپيشە هونەرييەكاندا لەدەستدەدەن، بۆ نموونە

ئەو ژنەسەماکارانەی لێهاتویی جەستەیی پێویست بۆ سەماکردن لەدەستدەدەن، چەندین ساڵ لەپێناو زاڵبوون بەسەر خەمۆکیو هەستکردن بە نەبوونی لێهاتوویی‌و گوێپێنەدان، خەباتدەکەن پێش ئەوەی بتوانن دەست بە شتێکی تر بکەن لەژیانیاندا، بەڵام پرسەکە لای کۆندی بەمشێوەیە نەبوو. ئەم لەسەر ئەو بیرۆکەیە جێگربوو کە "زۆرباشە، بەڵام مەزن نییە"، هەر بۆیە دەستبەجێ دەستیکرد بە گەڕان بۆ بابەتێکی نوێی خوێندن پاش چەند ساڵێك ئەمە ڕووندەکاتەوەو دەڵێت: "لەڕووی تەکنیکییەوە دەتوانم هەموو پارچە موزیکێك لێ بدەم، بەڵام ناتوانم بەو شێوەیە لێی بدەم کە ژەنیارە مەزنەکان لێی دەدەن".

کۆندی پێویستبوو لەسەری بە دایكوباوکی بڵێت لەم شوێنە سەرەکییەی خوێندنی زانکۆدا، هەموو شتێك گۆڕاوە، لەوبارەیەوە دەڵێت: "شێتانە دەستمکرد بە گەڕان بەدوای بابەتێکی نوێی خوێندندا. رومکردە دایكوباوکم کە سامانێکی زۆرو زۆربەی کاتەکانیان بۆ ئەوە تەرخانکردبوو ببمە پیانۆژەن، پێم وتن: دایە، بابە... من خەریکە جۆری پسپۆڕییەکەم دەگۆڕم". دەستبەجێ نەیتوانی هۆکاری ئەو کارەیان بۆ ڕوونبکاتەوە، هەموو ئەوەی دەیزانی ئەوەبوو کە چیتر حەز لەوە ناکات ببێتە پیانۆژەن. ئەم سیانە گەیشتنە ڕێککەوتنێك، بەپێی ئەو ڕێککەوتنە دەبێت کۆندی سەریاری ئەو ماددەیەی پسپۆڕە تێیدا، لەماوەی چوار ساڵدا بڕوانامەی بەکالۆریۆس لەهونەردا بەدەستبهێنێت. لە ساڵی پێش دەرچوونیدا، کۆندی پسپۆڕییەکەی گۆڕی و دەستیکرد بە گەڕان بەناو ئەو بژاردە کەمانەی لەبەردەمیدا هەبوون وەك ئەدەبی ئینگلیزیو کارگێڕیی حکومی. پاش ماوەیەکی کەم ئەدەبی ئینگلیزی لە بژاردەکان سڕییەوە چونکە پڕە لە چەمكو قورسی تێدا نییەو ئارەزومەندیشی نەبوو.

کۆندی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە خوێندنی کارگێڕی حکومی لەو ئاستەدا نییە کە چاوەڕێی دەکاتو بەلای ئەمەوە وا دیاربوو بەشەکانی وەك کارگێڕی وڵات، یان هەڵسوکەوتی تایبەت بە هەڵبژاردن، یان پارتە سیاسییەکان، یان تەنانەت پێکهاتەی حکومەت لەو ئاستی تەحەددایە یان ماندوبونەدا نین کە بنەهۆی وروژاندنی گرنیپێدان. لەسەرەتای وەرزی خوێندنی بەهاریدا،

هەنگاوەكانی بەرەو بەشێك پەلكێشیانكرد كە گۆڕانكاری لە هەموو شتێكیدا دروستكرد. ئەو بەشە ئەوكاتە بە خوێندنی ماددەیەك سەبارەت بە سیاسەتی نێودەولەتی، سەرقاڵبوو، وانەی رۆژیش سەبارەت بە ستالین بوو، پرۆفیسۆر جۆزێف كۆربێلْ كە باوكی مادلێن ئۆلْبرایتەو دیبلۆماسێكی پێشووەو لە ناوەندی ئەورووپادا كاریكردووە، دەیوتەوە.

كۆندی دەلێت: "ئەو رۆژە ئەوەم دۆزییەوە كە لێم ونببوو. بیرمكردەوە كە روسیا ئەو شوێنەیە كە دەمەوێت زیاتری سەبارەت بزانم. كارەكە وەك كەوتنە خۆشەویستی وابوو... بەلاّم ناتوانم هۆكارەكەی روونبكەمەوە، تەنها ئەوە نەبێت كە هەستمكرد رامدەكێشێت". دیاربوو ئەو تەحەددایەو نارۆشنییەی لە خوێندنی سۆڤیەتدا هەبوو، لەو جۆرانە بوون كە كۆندی بەدوایاندا دەگەڕا، بە واتەیەكی تر دیاربوو ئەم خوێندن و لێكۆڵینەوانە رێڕەوێكی تایبەتن لە ژیانی زانكۆیی كە بەتەواوەتی لەگەڵیدا دەگونجێت، ئەم رێڕەوە پێویستی بە سیستمێكی توندو سەخت هەیە، ئەمە سەرباری ئامادەیی بۆ فێربوونی زمانی بیانی. ئەم خوێندنانە بوارێكی تەواو نوێبوون و توانیان شەیداییەك لەكۆندیدا دروستبكەن كە پێشتر لە دەرەوەی جیهانی موزیكدا، هەستی پێ نەكردبوو. باس لەوە دەكات كە هەستێكی تێدا دروستبووە كە لەو هەستە چووە كە لە ساڵی ١٩٦٨دا لەكاتی بینینی چەند راپۆتەهەواڵێك سەبارەت بە داگیركردنی چیكسلۆڤاكیا لەلایەن روسیاوە، تێیدا دروستبووە. كۆندی ئەوكاتە زۆر كاریتێكراوەو بەمشێوەیە باس لەو هەستەی دەكات: "تائێستاش دەتوانم هەست بەو هەستە بەهێزە بكەم".

دكتۆر كۆربێلْ بە دەركەوتن و پەرۆشی كۆندی، سەرسامبوو هەربۆیە هانیدا پەیوەندی بەو پەیمانگای پەیوەندییە نێودەولەتییانەی سەر بە زانكۆكەوە بكات، كە خۆی دایمەزراندبوو. كۆندی لەبارەی كۆربێلەوە دەلێت: "بەڕاستی پێی سەرسام بووم و ئارەزووی لە ماددەكە كرد، خۆشیم خۆشویست، دیاربوو لە كاتێكی گونجاو بە شێوازێكی گونجاو هەلْیبژاردووم". دەستبەجێ رووی گرنگیپێدانی كردە یەكێتیی سۆڤیەت و خۆی لە سیاسەتی سۆڤیەت و هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە سۆڤیەتەوە هەیە، نوقم كرد.

کۆندی لەگەڵ ئەو خولە بەرایییەدا، هەستیکرد پێگەی راستەقینەی خۆی دۆزیوەتەوە. دایكوباوکی ئەم هەڵبژاردەیەی کۆندییان زۆر بەدڵبوو و پشتگیری خۆشیان بۆ دەربڕی. باوکی رایگەیاند: "کۆندی لەو جۆرە کەسانەیە کە زۆر متمانەی بەخۆی هەیەو دەتوانێت بڕیاری راست بدات، بەڵام هەڵبژاردنی زانستە سیاسییەکان، کارێکی سەیر بوو، چونکە رەشپێستەکان زانستە سیاسییەکان ناخوێنن"

دارسی ئەو کچە هاوڕێیەی بوو کە لە جیهانی پیانۆ رایکردبوو، پەیوەندیکرد بە بەشەکانی کارگێڕیی کارەوەو لە تەمەنی ١٩ساڵیدا کۆمپانیایەکی دامەزراند کە تایبەتبوو بە دیزاین. ئێستا کۆمپانیاکەی قازانجێکی زۆری هەیەو خودی دارسی بڕوای وایە ئەویش‌و کۆندیش توانیویانە شێوازی نوێ بۆ خستنەکاری ئەو وزە بەرهەمهێنەرەیان بدۆزنەوە کە هەیانە. دارسی دەڵێت: "دیزاین شێوازێکە بۆ دۆزینەوەی دەروازەیەك بۆ من تا ئەو بەهرە گوزارشتئامێزانەی لەموزیکدا بەکارمدەهێنان، لێردا بەکاریان بهێنم، بەڵام کۆندی لە رێگەی خوێندنی ئەو زمانە بیانییانەوە توانی ئەو وزە مێشکییەی کە پێویستی بوو بۆ ئەوەی ببێتە پیانۆژەن، بەکاربهێنێت هەروەها توانیشی بەشێوەیەکی بنیاتنەر بڕیارەکانی بدات". دارسی هەستدەکات کە هەمیشە قەرزاری باوکی کۆندییە چونکە ئەو رێنوێنی‌و پشتگیری کردووە تا هاریکاری خوێندنی لە زانکۆ دەستبکەوێت. دارسی باس لەوە دەکات کە "جۆن رایس کەسێکی خۆشەویست‌و راشکاو بووە، بەڵام هاوکات کەسێك بووە داواکاری زۆر بووە، وا راهاتبوو کە دەیویست لەوە دڵنیابێت کە تۆ بەڕاستی هاریکاری خوێندنت دەوێت‌و ماندونەناسانە لەپێناو خوێندنەکەدا کاردەکەیت‌و ئەو هاریکاریە لە کەسێك نابڕێت کە ئەوەندەی تۆ شیاوی هاریکاری بێت. راستە ئەو دەیبەخشی، بەڵام لەبەرامبەردا پێشبینی شتی زیاتری دەکرد، پێموایە ئەم هەڵسوکەتە هی کەسێکی دانایە، ئەگەر چوویتە زانکۆو دوودڵ بوویت لەوەی کە ئەنجامی دەدەیت لەژیانتدا، ئەوا پێویستە کەسێك بدۆزیتەوە پاڵنەرت بێت بۆ ئەوەی بیربکەیتەوەو کاروبارەکانت یەکلایی بکەیتەوە. بەڕاستی پیاوێکی زۆر زیرەك بوو"

كۆندی لە چەند خولێکی زانستە سیاسییەكانو زمانی روسی، خۆی تۆماركرد بەڵام بەتەواوەتی دەرگای بەرووی موزیكدا دانەخست. هەرچەند چیتر هەوڵی ئەوەی نەدەدا ببێتە ژەنیارێكی دانپیانراوی پیانۆ، بەڵام وەك خوێندكارێكی شێلگیری پیانۆ مایەوەو لەمبارەیەوە دەڵێت: "هەستمكرد زۆر پەرۆشی خوێندنی كاروباری روسیام بەڵام لەڕاستیدا شەیداییم بۆ موزیكیش لەدەست نەدا. تا ماوەیەكی زۆریش لە خوێندنی پیانۆو راهێنانكردن لەسەری بەردەوامبووم". ئەم لایەنەی خوێندنەكەی، كۆندی خستۆتە ناو چوارچێوەی كۆمەڵەیەكی بچوك لە بەرپرسانی فەرمی حكومی كە پسپۆرییە زانكۆییەكەیان لە بواری موزیكەوە دەستپێكردووە. شایانی باسە ئیدوارد هیس كە لە ساڵی ١٩٧٠ تا ١٩٧٤ سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بوو، ژەنیاری ئۆرگو سەرۆكی كۆرس بوو، كاتێك كۆندۆلیزا رایس بواری موزیكی تەواونەكردبوو، ئەم هێشتا خوێندكاری ئۆكسفۆرد بوو. پاش خانەنشینبوونی لەكاری سیاسی، هیس كاتێكی زۆری لە سەركردایەتیكردنی چەند تیمێكی ئۆركسترا لە شوێنە جیاجیاكانی ئەوروپادا بەسەربردووە، هەروەها ئالان گرینسبان كە سەرۆكی یەدەگی دراوی فیدراڵییە لە ئەمەریكا، ژیانی پیشەیی وەك ژەنیارێكی ئامێرەكانی فوكردن لە پەیمانگای جولیارد، دەستپێكردووە. گرینسبان پێش ئەوەی بچێتە زانكۆی نیۆركو خوێندن لە بواری ئابوریدا بخوێنێت، كلارنێتو ساكسیفۆنی خوێندووەو لەگەڵ تیمەكانی جازدا، بەشداری لە موزیك ژەنیندا كردووە. بەڵام كۆندی لە ساڵی ٢٠٠١دا دەڵێت: "پەشیمان نیم لەوەی وازم لە پیشەی موزیك هێناوە. پێموایە گەورەیی موزیك لەوەدایە كە بەدرێژایی ژیانت خۆشت بوێتو دەشتوانیت لە قۆناخە جیاكانی ژیانتدا، بگەرێیتەوە بۆ لای"

كۆندۆلیزا چەندینجار باسی لەوە كردووە كە جۆزێف كۆربێڵ بووەتە هۆی ئەوەی بچێتە ناو ژیانی سیاسەتی نێودەولەتییەوە، پیاوێكە وێنەی لەم بوارەدا كەمە، پیاوێكە بەهۆی ئەزموونەكانی لە ئەوروپا لەپێشو پاشو لەكاتی شەڕی جیهانی دووەمدا كردونیەتە نموونەیەكی سەرسوڕهێن بۆ ئەو گەنجانەی شەیدای تێگەیشتن لەپەیوەندییە نێودەولەتییەكانن. كۆربێڵ بەردەوام كەسایەتییە

هونەرییەکانی بۆ بازنەی هاوڕێیەتی رادەکێشا. کۆنە هاوڕێیەکی خێزانەکەی کۆربێڵ سەبارەت بەم پیاوە دەڵێت: "شێوازێکی خۆی هەبوو بۆ هاندانی کەسانی بەهرمەنــد. هونەرمەنــد نــەبوو، بــەڵام هونەرمەنــدانی لــە دەوری خــۆی کۆدەکردەوە". دیاربوو کچە خوێنـدکارێکی وەك کۆنـدی کـە بـە چـەند زمانێك قسەیدەکردو موزیکژەنێکی راهێنـراو بـوو، سـەرباری ئـەوەش کەسـێکی لێهاتوو و هاوسەنگ‌و پشتبەخۆبەستوو بوو، لەو جۆرە کەسانە بوو کە کۆربێڵ بۆلای خۆی رادەکێشان هەربۆیە زوو ئەم پیاوە کۆندی خستە ژێر سایەیەوە.

جۆزیـف کۆربێـڵ لـە سـاڵی ۱۹۰۹ لـە چیکۆسـلۆڤاکیا لـەدایکبووەو سـەرەتا لـە پـاریس خوێندویـەتی‌و دواتـر لـە زانکـۆی چـارلز لـە پـراگ، مۆڵـەتی لـە یاسـادا بەدەستهێناوە. یەکەم پۆستی لە حکومەتی چیك وەك وەزیـری کاروبـاری دەرەوە وەرگرتووەو لە ساڵی ۱۹۳۷یشدا بووەتە پاشکۆی رۆژنامەوانیی باڵیۆزخانەی چیك لـە بـەلگرادی پایتــەختی یۆگۆسـلافیا. فێـری زمـانی سـربی بـووەو توانیویـەتی دۆستایەتی توندوتۆڵ لەگەڵ چەندین رۆژنامەوانی یۆگۆسلاڤیدا بنیاتبنێت، ئـەو رۆژنامەوانانەی کە لەکاتێکدا هیتلەر چووە ناو چیکسلۆڤاکیاوە، رۆڵێکـی گرنگیـان بەنیسبەت خۆی‌و خێزانەکەیەوە بینی. لـە ئـازاری سـاڵی ۱۹۳۹دا هێـزە نازییـەکان چوونە ناو پراگەوە، ئەو کاتەش ناوی کۆربێڵ کە جولەکەبوو، لە ڕیزی پێشـەوەی ئەو لیستەدابوو کە داواکرابوو دەستگیر بکرێن.  خێزانـی کۆربێـڵ وەك چـەندین خێزانی تری جولەکە، نەژادو پەیوەندییـە ئاینییـەکانیان رەتکـردەوە. کۆربێـڵ لـە خانەی ئاینی ئەو بەڵگەنامەیەی کە دەبوو بەناچاری خێزانـەکان پـڕی بکەنـەوە، دەنووسێت "هیچ"واتە هیچ ئاینێکی نییـە. مایکڵ دۆبـس کـە ژیاننامـەی مـادڵین ئــۆڵبرایتی نووســیوەتەوە لــە زاری یــەکێك لــە هاوکــارە چـیکییەکانی کۆربێلـەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "کۆربێڵ یەکێکە لەو جولەکە زۆر کەمانـەی پـێش شـەڕەکە، توانیویانە پۆستی وەزیری دەرەوە بگرنەدەست. بۆیە توانی لە گرتنەدەستی ئـەم پۆستەدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، چونکە هیچ ئاماژەیەکی نەدابوو بەوەی کـە جولەکەیە". جۆزێـف بەدرێـژایی چـەند هەفتـەیەك کـاری لەسـەر دانـانی پلانێك کـردووە بـۆ دەرکردنـی خـۆی‌و خێزانەکـەی بـۆ یۆگسـلافیا، ئـەوەبوو بـە یارمـەتی

چەند نامەیەكى فەرمى راسپاردن لەلایەن دوو رۆژنامەوە لە بەلگراد، توانى ڤیزاى دەرچوون بۆ خۆىو هاوسەرەكەىو كچەكەیان كە ئەوكاتە تەمەنى دوو سالٚ بوو، دەستبكەویٚت. ئەو دوو رۆژنامەیە پۆستى پەیامنیٚرى دەرەوەیان پیٚدابوو. ئەم خیٚزانە چەند هەفتەیەكى كەم لە بەلگراد بەسەردەبەن، دواتر رودەكەنە لەندەن كە تیٚیدا ئەندامانى بالآى حكومەتى چیكى تیٚدابوو.

كۆربیٚلٚ وەك سكرتیٚرى تایبەتى وەزیرى دەرەوەى چیك، جان ماساریك، كاریكردووە، دواتر ئەوەندەى پیٚناچیٚت دەبیٚتە سەرۆكى دەستەى ئیٚزگەى چیك. ئەوكاتەى ئەم خیٚزانە لە لەندەن نیشتەجیٚ بوون، هیٚزەكانى هیتلەر پەلامارى ئەو گەرەكە دەدەن كە تیٚیدا نیشتەجیٚبوو. جۆزیٚف زانیارىى ئەوەى پیٚگەیشت كە زیاتر لە ٢٠ كەس لە خزمانى لە كۆمەلٚكوژییەكەى نازییەكان لەولآتەكەیدا، تیاچوون، سیٚ باپیرو دوو پورو مامیٚكو ئامۆزایەكو نۆ خزمى ترى مادلٚین لەناو قوربانییەكانى ئۆشیفیتز یان تیریزین بوون كە دوو سەربازگەى دەستگیركردن بوون لە چیكسلۆڤاكیا.

پاش جەنگەكە خیٚزانەكە دەگەریٚنەوە بۆ پراگو جۆزیٚف بەردەوامدەبیٚت لە پۆستە بالآ فەرمییەكەى لە حكومەتى چیكدا. مادلٚین تەمەنى دەگاتە هەشت سالٚو خیٚزانەكەش لە شوقەیەكى پشكەوتوو و گرانبەها لە نزیك كۆشكى سەرۆكایەتییەوەو نیشتەجیٚ دەبن. لە سالٚى ١٩٤٦دا كۆربیٚلٚ، وەك ئەندام، بەشدارى لە وەفدى چیك بۆ كۆنگرەى پاریس دەكات، كۆنگرەیەك بوو سیستمى نویٚى جیهانى تیٚدا لەدایكبوو، راستەوخۆ دواى كۆنگرەكەش كە ئەوكاتە تەمەنى ٣٦ سالآن بوو، وەك بالیٚۆزى ولآتەكەى لە یۆگۆسلاڤیا، دامەزرا. ئەم پیاوە لە هاتوچوون لەنیٚوان پراگو بەلگرادا بەردەوامدەبیٚتو بەهۆى ئەوەشەوە مادلٚین ژیانیٚكى خۆشى لە بارەگاى حەوانەوەى بالیٚۆزدا بەسەربردووە. شایانى باسە خیٚزانى كۆربیٚلٚ چەند پرۆفیسۆریٚكى تایبەتى دیاریكردبوو تا وانەى تایبەتى بە مادلٚین بلیٚنەوە نەوەك لە خویٚندنگە ناوخۆییەكانـدا توشى ریكلامكردن بۆ كۆمۆنیستى، ببیٚتەوە. كاتیٚك مادلٚین تەمەنى دەگاتە ١٠ سالآن، خیٚزانەكەى دەینیٚرنە خویٚندنگەیەكى تایبەت لە سویسرا. ئەوەندەى پیٚناچیٚت سیٚبەرى

بـــارگرژی لـــەنێوان کۆمۆنیســـتو دیموکراتـــەکان، وەك هـــەورێکی تاریـــك لـــە چیکسـلۆڤاکیا بـاڵ بەسـەر خێزانەکـەدا دەکێشـێتو زووبـەزوو لـە سـاڵی ١٩٤٨دا کۆمۆنیســتەکان دەســەڵات لــەو وڵاتــەدا دەگرنەدەســت، هەربۆیــە ئــەم خێزانــە ناچــاردەبن رابکەنــە ویلایەتــە یــەکگرتووەکان. کۆربێـڵ پـێش ئـەوەی پـراگ جێبهێڵێت، لە لیژنەیـەکی بارەگای نەتەوەیـەکگرتووەکان سـەبارەت بە پاکسـتانو هندستان، دامەزراو دواتر بەتـەواوەتی لـە بارەگـای نەتـەوە یـەکگرتووەکان لەشـاری نیۆرك دەستیکرد بەکارکردن. لە ساڵی ١٩٤٩دا کۆربێـڵ بـەهۆی ئـەو فشـارەی رژێمـی حکومەتی نوێ لە پراگ ئەنجامیدەدا، دەست لە کارەکەی هەڵدەگرێت.

پـاش جـەنگی جیهـانی دووەم، زانکۆکـانی ئەمـەریکا چـەند پرۆگرامێکـی چـڕوپڕیان سـەبارەت بەبابـەتی سیاسـەتی نێودەولـەتی، دەسـتپێکرد. ویلایەتـە یـەکگرتووەکان خـۆی وەك یـاریزانێکی نـوێ لەسـەر شـانۆی جیهـانی بینییـەوە، هەربۆیە بیری لەوە کردەوە کە پێویسـتی بـە رۆشـنبیرکردنێك هەیـە کـە پسـپۆڕانی بـواری مێـژووی چـەند سـەدەیەك لەمەوبـەر تـا دروسـتبوونی یـەکێتیی سـۆڤیەتو کوتلـەی سـۆڤیەت، پێشکەشـی بکـەن. بەرپرسـانی ئـەم پرۆگرامـە زانکۆییانـە بـۆ چـەند پسـۆڕێکی ئـەوروپی دەگـەڕان کـە تـازە کۆچـیان کردبێـت بـۆ ویلایەتـە یەکگرتووەکانو زانکۆی دێنیڤەر ئەو پسۆڕەی کە بـە دوایـدا دەگـەڕا، لـە جۆزێـف کۆربێڵدا دۆزییەوە. پاش ئـەوەی دەسـتبەرداری کارکردن لەنەتـەوە یـەکگرتووەکان بوو، کۆربێڵ وەك پرۆفیسۆری پەیوەندییە نێودەولەتییەکان، لە زانکۆکـە دامـەزرا. لـە سـاڵی ١٩٥٩دا بـووە راگـری پـەیمانگای زانکـۆیی بـۆ لێکۆڵینـەوەی نێودەولـەتیو پۆستی بەڕێوەبەری دامەزراوەی زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانیشـی وەرگـرت. لەمیانـەی کارکردنیـدا کۆربێـڵ رێـزو پێزانینێکـی زۆری لێنـراو وەك پرۆفیسـۆرێکی نـاوازە سـەیردەکرا، کەسـێکی نـەرمونیانو گـەرموگوڕو بەخشـندە بـوو. داواکـاری زۆری لەجیهانـەوە بـۆ دەهـاتو وەك پرۆفیسـۆرێکی میـوان لـە زانکۆکـانی ئۆکسـفۆردو هارڤـاردو کۆلۆمبیـاو پـەیمانگای تـەکنینی ماساشوسـتسو چـەندین زانکـۆی تـر کاریکردووە. کۆربێڵ شـەش کتێـبو ژمارەیـەکی ئێجگـار زۆر وتـاری بڵاوکردووەتـەوە کە هەموویان بە چڕوپڕی باس لە پرسی ئەوروپای رۆژهەڵاتو شەڕی سارد دەکەن.

پاش باوكی، كۆربێلْ دووەم گرنگترین كەسە لە ژیانی كۆندیدا. هەر لەو سەردەمەی كۆندی كچێكی بچوك بووە، جۆن رایس گرنگیپێدانەكانی كچەكەی سەبارەت بەپرسە نێودەولەتییەكان ورژاندووەو كاتێكی زۆری لەگەڵدا بەسەردەبرد سەبارەت بەو پرسانەی لە هەواڵی رۆژانەدا باسدەكران، ئەمەش وای لە كۆندی كرد هەروەك باوكی، ژیانی خۆی رێكبخات. كۆندی، جۆزێف كۆربێلْ بە"باوكی رۆحی" ناودەبات. شایانی باسە مادلینیش وەك كۆندی تەواو وابەستەی باوكی بووە. دۆبس دەڵێت: "هیچ گومان لەوەدا نییە كە مادلین هەر لەمنداڵییەوە جێگەی گرنگیپێدانی دایكوباوكیو سەرچاوەیەكی خەونو هیواكانیان بوو. ئەو گەورەترو لێهاتووترو بەتەماحتر بوو". خودی مادلینیش باوكی بەو كەسە توند، بەڵام زۆر خۆشەویستە وەسفدەكات، كە پشتگیرییەكی زۆری پێشكەش بەخێزانەكەی كردووە".

پسپۆڕییە نوێكەی كۆندی لە زانستە سیاسییەكاندا، فێربوونی زمانی روسیشی لەخۆگرتبوو. هەندێك كەس واڕاهاتبوون كە بەشێوەیەك سەیری ئەم زمانەیان دەكرد "ئەو زمانەیە كە فێربوونەكەی ١٠ ساڵی پێویستە"، ئەمەش بەهۆی قورسی پیتەكانییەوەیە كە بەرەگەز سلاڤی كۆنە لەگەڵ گرانی لە تێگەیشتنو لە ئالۆزییەكانی، ئەمانەش بۆ زۆرێك لە خوێندكاران سەرچاوەی بارگرانی زۆر گەورە بوون. كۆندی هەستیكرد كە خوێندنی وانەی زمانی فەرەنسیو ئیسپانیو ئەڵمانی لەڕابردوودا حەزێكی لەلا دروستكردووە كە خوێندنی زمانی لەلا خۆشەویست بكات، بەهۆی ئەمەوە لەو بوارەدا توانی پێشكەوتن بەدەستبهێنێت، سەرنجیشیدا ئەو ئەزموونە زمانەوانییانەی لەڕابردودا فێریبووە، بووەتە بنچینەیەكی پتەو بۆ دەستەواژەكانی ئەو یاسا رێزمانیانەی زۆرێك لە خوێندكاران، لە بیریان دەچێتەوە، ئەم یاسایانەش بنچینەن بۆ فێربوونی زمانێكی نوێ. جایسۆن گالی كە مامۆستای زمانی روسیو خوێندكاری دكتۆرای فەلسەفەیە لە زانكۆی كۆلۆمبیا، دەڵێت:"ئەلفابێتی روسی وەك تەحەددایەكی گەورە وایە، بەڵام بەشی هەرەقورسی زمانەكە نییە" ئەو مامۆستایە بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "زمانی روسی لە زمانەكانی چیرۆكە شیعرو

پەخشان کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، قورسترە، بەشێکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەلفابێتییەکەی. ئەو کەسەی دەیەوێت فێرببێت، بە نووسینی پیتەکانی ئینگلیزی لەبری روسی دەستپێدەکات، بەڵام لەوە قورستر ئەوەیە لەو رۆڵە تێبگەیت کە ئەو وشانە دەیگێڕن، ئەم رۆڵە پەیوەندی بەشوێنی وشەکانەوە نییە لەڕستەدا بەڵکو پەیوەندی بەکۆتایی خودی وشەکانەوە هەیە، ئەمەش شتێکە پێچەوانەی ئەوەیە کە لەئینگلیزیدا هەیەو زۆرێك لە خوێندکاران ئەمە بە کارێك دادەنێن کە تێگەیشتنی قورسە".

مانگ دوای مانگ کۆندی زیاتر لە زمانی روسی تێدەگەیشت هەربۆیە خۆی بەشێوەیەك بینییەوە کە پەیوەندییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ ئەو وڵاتەدا هەیە کە دەبێتە شتێکی سەرەکی لە ژیانو کارکردنیدا. بەوپێیەی تەنها دوو ساڵی لەبەردەمدا مابوو بۆ دەرچوون (تخرج)، کەواتە کاتێکی زۆری نەبوو تا ئەرکی زۆر بخاتە سەرشانی، هەربۆیە لەسەر بڕیارەکانی پێشووی مایەوەو بەشێوەیەکی فراوان دەستیکرد بە خوێندنەوە.

کاتێك خێزانی رایسماڵیان گواستەوە بۆ دێنیڤەر، جۆن بووە قەشەیەکی بەشدار لە کڵێسەی مەشیەخەی مۆنتڤیۆ، هەربۆیە کۆندی هەموو شەوانێکی پێنجشەممەی لە ڕاهێنان لەگەڵ گرووپی کڵێسەدا بەسەردەبرد کە پێکهاتبوو لە ٨٠ ئەندامو گرووپێکی نیمچە دانپیانراو بوو. مۆنتڤیۆ لە ساڵەکانی شەستەکاندا، رۆڵێکی گرنگی لە یارمەتیدانی پرۆسەی تێکەڵکردنی رەشپێستو سپیپێستەکان لە گەڕەکی پارك هێڵ لە دێنیڤەر کە گەڕەکێکبوو لە سەردەمی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان پرۆسەی تێکەڵکردنی رەشپێستو سپیپێستەکانی پەیڕەودەکرد، بینیوە. چەند لیژنەیەکی سەرخستنی کارەکان لەو گەڕەکە پێکهێنران، لەو لیژنانە دەچوون کە لە گەڕەکی هاید پارك لە شیکاگۆ یارمەتی تێکەڵکردنی رەشپێستو سپیپێستەکانیان دەدا. کڵێسەی مەشیەخەی مۆنتڤیۆ لەگەڵ کڵێسەی کاسۆلیکی نهێنی پیرۆزو کڵێسەی میتۆدی پارك هێڵ، هاوکاری یەکتریان دەکرد لە دامەزراندنی لیژنەی کاری پارك ڤیو. ئەم لیژنەیە یارمەتی کەمکردنەوەی کۆچکردنی خێزانە سپیپێستەکانیان دەدا لەو گەڕەکەی کە خێزانە رەشپێستەکان

تازە دەستیانكردبوو بە كۆچكردن بۆی. رۆس واینەر كە ئەندامێكی كۆنی كلێسەی مەشیەخەی مۆنتڤیۆیەو خێزانی رایس بەباشی دەناسێت، دەڵێت: "شوێنكەوتووانی ئەم كلێسانە پێكەوە كۆدەبنەوەو دەڵێن: "رێگەنادەین ئەوە لە گەڕەكەكەمان روبدات، ئێمە پێكەوە گەڕەكێكی تێكەڵمان لە رەگەز، لەرووی ئابوری‌و كۆمەڵایەتییە، پێكهێناوە". تۆمارەكانی كلێسەكە كە ناونراون گیانی مۆنتڤیۆ ١٩٠٢ - ٢٠٠٢ باس لەوە دەكەن: "داوا لە پەیرەوكارانی كلێسەكە كرا لەكاتی كڕین یان فرۆشتنی زەویدا، پەیماننامەیەكی دووقۆڵی‌و نا نەژادی واژۆبكەن... مۆنتڤیۆ پەیوەندیكرد بە كلێسەكانی ترەوە... ئەمەش لە چوارچێوەی چەند هەوڵێكدابوون بۆ ئەوەی پارك هیلْ بكرێتە یەكەم گەڕەك لە دێنیڤەرو لەراستیدا لە ویلایەتە یەكگرتووەكانیش، كەتێیدا رەشپێست‌و سپیپێست تێكەڵ بكرێن"

لە شەستەكانی سەدەی بیستەمدا ئارسەر میلەر كە گەورەترین قەشەی كلێسەی مۆنتڤیۆ بوو، پێش هەر كەسێكی تر، داوای لەسەركردە رەشپێستەكان كرد لەكلێسەكەدا قسەبكەن. واینەر دەڵێت: "لە گەرمەی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەكاندا، میلەر تووانی مارتن لۆسەر كینگی كوڕ قایل بكات بەوەی بێتە مۆنتڤیۆ، بێگومان ئەم داواكارییەش ئازایەتییەكی زۆری پێویستبوو". لە ساڵی ١٩٦٩شدا كلێسەی مۆنتڤیۆ داوای لە دیۆك ئێلنگتۆن كرد پارچە سروتێكی خۆی كەناوی سروتی پیرۆزی دووەم بوو، لەو كلێسەیەدا نمایش بكات. دەرهێنانی ئەم كارە، سەرباری ژەنیارانی ئۆركێسترای سیمفۆنی دێنیڤەر، بەشداریكردنی گرووپی مۆنتڤیۆی لەخۆگرتبوو. ژمارەیەكی زۆر لە خەڵك ئامادەی ئەم ئاهەنگە دەبن‌و دەبێتە رووداوێكی دیارو سەرنجڕاكێش لە مێژووی كلێسەو كۆمەڵگەكەشدا.

بەوپێیەی یەكێكبوو لە چوار قەشە بەشدارەكەی كلێسەكە، جۆن واراهاتبوو مانگی جارێك ئامۆژگارییەكانی پێشكەش دەكرد، هەروەها وەك راوێژكاریش كاری كردووە، سەركردایەتی پرۆگرامێكی تایبەت بەفێركردنی تازەپێگەیشتووانی كردووە كە ناوی گرووپی ٤٩ بوو. ئەم گرووپە ناوەكەی لە رۆژانی تای گەڕان بەدوای زێڕو دانانی پرۆگرامێكی رۆژانەی خوێندنەوە وەرگرتووە كە ماوەكەی ٤٩ خولەك بوو. تۆمارەكانی كلێسەكە دەڵێن: "لەژێر سەرپەشتی رایسدا، كارەكانی یانەی هاوچەرخی

گرووپــی ٤٩ دەنگیاندایــەوە، ژمــارەی پێشــەنگەکانی زۆربــوون". کارەکــانی جــۆن لەکلێســەکەدا چــەندین ئــەرکی چاودێرییان لــەخۆگرتبوو لەوانــە ســەردانکردنی ئــەو نــەخۆش و پەککەوتانــەی ســەر بــە کلێســەکەبوون، کــە لەنەخۆشــخانەدا کــەوتبوون. شایانی باسە پۆستەکەی جۆن وەك راگرو مامۆستای زانکۆ، رێگەی پــێ نــەدەدا کــە ببێتــە پیــاوێکی ئــاینی لێبڕاو. واینــەر دەڵێــت قەشــە رایــس کەســایەتییەکی دیــاری گەڕەکەکــە بــوو و پیــاوێکی ئــاینی بــوو کــە خــاوەنی رێزێکــی زۆر بــوو. واینــەر بەردەوامــــدەبێت و دەڵێــــت جۆن:"بــــەهۆی پەیوەندییــــەکانی بــــە زانکۆکــــەوە، شــکۆمەندییەکی گــەورەی دابــووە کلێســەکەو بــەهۆی ئەوەشــەوە ئەمەریکییــەکی بەڕەگەز ئەفەریکیبوو، توانیبووی رێزێکی زۆر پەیدابکات".

جۆن یارمەتی ئــەو کەسانەی دەدا کــە لــەژێر سایەیدا بوون تــا لــە گۆشــەیەکی نوێــوە بڕواننــە کاروبارەکــان، ئەمــەش کارێــك بــوو کتومــت لەگــەڵ خوێنــدکارە زانکۆییەکانیشیدا ئەنجامیدەدا. سەرپەرشتیاری ئەبرەشی پێشوو ریتچارد هچیسۆن دەڵێت: "کاتێك جۆن هاتە ناو تیمەکەوە، دەستبەجێ دەستیکرد بە کارکردن لەگەڵ ئــەو گرووپــەی لــەژێر نــاوی تێکــەڵکردنی سپیپێســت و رەشپێســت لــە مۆنتڤیــو، رێکمانخســتبوو. ئــەم پیــاوە یارمەتییــەکی زۆری پێشکەشــکردووین و لەڕاســتیدا هــەر لەیەکــەم کۆبوونــەوەوە، چــەندین زانیــاری بەسودی پێــداین. لــەو کۆبوونەوەیــەدا قسەمان لەسەر چۆنیەتی راکێشانی زیاتری ئەنــدامی رەشپێســت کــرد، ئــەویش وتــی: "زۆر چــاکە، ئایــا هــەمووتان لەســەر ئــەم تێکەڵکردنــە، کــۆکن؟" ئێمــەش وەڵامــمان دایــەوە کــە بێگومــان کــۆکین. دواتــر ســەبارەت بــە شــوێنی نزیکتــرین کلێســەی مەشیەخەی رەشپێستەکان، پرسیارمانکرد. ئاگادارمانکردەوە کە دانەیەك هەیە دوو میــل لێمانــەوە دوورە. ئــەم پیــاوە پرســیارێکی تــری لێکــردین: "بۆچــی هەنــدێکتان پەیوەندی بەو کلێسەیەوە ناکەن؟" ئەوکاتە لەوە تێگەیشتین کە ئێمە بڕوامــان بــە تێکەڵکردن هەیە، بەڵام لێپرسراوێتی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە دەخەینــە ئەســتۆی رەشپێستەکان"

ریتچــارد بەردەوامــدەبێت و دەڵێــت: " هەمیشــە جــۆن کەســێکی راشــکاوو راستگۆو پــڕ لەتەحــەددا بــوو، هاوکــات کەســێکی کاریگــەر بــوو. ئــەو پیــاوە هێنــدە

کەسێکی ڕاستگۆ بوو و هەستی بە ئارامی ناواخن دەکرد بەشێوەیەك کە هەڵوێستی بەرگری‌و تووڕەیی ئامێزی نەدەگرتەبەر. پێموایە کۆندی هەندێك لەم ئاکارانەی بە بۆماوەیی بۆ ماوەتەوە".

لە مۆنتڤیۆ دابونەریتی موزیکی کلاسیکی سەرنجی کۆندی بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت. ئەو گرووپە کە بە یەکێك لە باشترین گرووپەکانی شارەکە دادەنرا، واڕاهاتبوو بەشێوەی دەوری، چەند پارچە موزیکێکی مەزنی سرودی پیرۆزی نمایشدەکرد. مارگرێت وینەر کە هاوکاری کۆندی بوو لە گرووپەکە، دەڵێت: "کۆندی دەنگێکی جوانی هەبوو، ئاهەنگێکی لە کڵێسەکە سازکردو تێیدا پیانۆی ژەنی، ئەمەش ئەو هۆکارەیە کە پاڵی پێوەنام ئەوکاتە بگەمە ئەو باوەڕەی کە کۆندی لەموزیکدا هەنگاو بەرەوپێشەوە دەنێت. لەبیرمە کە خاوەنی کەسایەتییەکی دۆستانەو خۆشەویست بوو، گەنجێکی بەهرەدارو ڕۆحسوك بوو" هەندێك لەو پارچەموزیك‌و سروتانەی گرووپەکە نمایشیان دەکرد، کاریگەرییەکی قوڵیان لەناخی کۆندیدا جێهێشتووە. لە دیدارێکی ڕادیۆییدا کۆندی دەڵێت: "پارچە سرودێکی بیتهۆڤنمان نمایشکرد کە ناوی مەسیح لەسەر لوتکەی زەیتونە بوو، زۆر حەزم لەم پارچە سرودە بوو کە پارچەیەکی ئاینی بوو و زۆر نمایش نەدەکرا، لەبیریشمە کە یەکێك لەساتە مەزنەکانی ژیانم ئەوەبوو کاتێك لەساڵی ٢٠٠٠دا بۆ یەکەمینجار چوومە ئیسرائیل‌و لەسەر لوتکەی شاخی زەیتون، وەستام. ئەوکاتە کتوپڕ ئەم سرودە مەزنەم بیرکەوتەوەو هەروەك چۆن کەسێك شتێکی لەم بابەتەی بیردەکەوێتەوە، سەراپای جەستەی داگرتم"

جۆن ڕایس سەرباری کارکردنی وەك ڕاگری زانکۆو بواری فێرکردن‌و چاودێری ئەبرەشیە[1]، لە ئیدارەی ناوخۆیی شاری دێنیفەریشدا کاریکردووە. جۆن واڕاهاتبوو کە لە چوارچێوەی کارەکەیدا وەك ڕاوێژکار لە دەستەی هەڵبژاردنی تاکەکانی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، چەندین سەردانی بۆ واشنتۆنی پایتەخت

[1] لە هەندێك لەشێوەکانی مەسیحیەتدا، ئەبرەشیە بچووکترین یەکەیە لە سیستەمی کڵێسەدا (وەرگێڕ).

ئەنجامـدەدا. لـە سـاڵی ١٩٧٨دا دەبلیـو ئـێچ مـاك نیكۆلاسـی دووەم كـە سـەرۆكی شـارەوانی بـوو لـە دێنیڤـەر، جـۆنی لـە دەسـتەیەكی تازەكردنـەوەی دێنیڤـەردا دامەزرانـد. جـۆن بەشـداری لـە ئەنـدامێتیی چـەندین رێكخـراودا كـردووە لەوانـە یانەی كیوانیو یانەی ئۆپتیمیست، بەهۆی ئەم چالاكییانەیەوە توانی پارێزگاری لە پەیوەندییەكانی لەگەڵ پیاوانی كارو بەرپرسانی شارەكە، بكات، لە زانكۆكەش بووە ئەندامی هەردوو كۆمەڵەی برایـەتیی فـای دەلتـا كاپـاو برایـەتیی ئـەلفا فـای ئەلفا.

بەرزخوازیو سەرقاڵبوونی كۆندی لەوانەی باوكی كـەمتر نـەبوون. خلیسـكان لەسەر سەهۆڵ بووە كارێكی زۆر گرنگ لەژیانیداو تائێستاش راهێنانەكانی لەسـەر پەت وەك بەشێكی چالاك لەو پرۆسەی كە كردیە ئەو كەسە شیاوەی كـە ئـەمرۆ هەیـــە، دادەنێــت. كۆنـــدی لـــە ســـاڵی ١٩٩٩دا رایگەیانــد: "پێموایـــە وەرزش پلەوپایەیەكی تایبەتی لەلای من هەیە، من رۆژێك لـە رۆژان كەسـێكی وەرزشـكار بووم. پێموایە دەمتوانی زۆر لەو راهێنانانەی خلیسكانی ئیقاعی لەسـەر سـەهۆڵ فێـرببم كـە دواتـر وازملێهێنـان. لەراسـتیدا ئەوەنـدەی ئـەو یارییـە وەرزشـییانە تونـدوتۆڵیو رێكوپێكیـت پێـدەدەن، هـیچ شـتێكی تـر پێـت نـادەن". ئـەوەش یەكێكی تربوو لەو وانە ژیانیانەی ئەم خانمە لەباوكییەوە بۆی ماوەتەوە.

كۆندی زۆر بەوە دڵخۆش بوو كە ئەوەی هەڵبژارد بەدرێژایی ماوەی خوێندنە زانكۆییەكەی، لـە زانكۆكـە بمێنێتـەوە. پـاش چـەندین سـاڵ رایگەیانـد: "زانكـۆی دێنیڤـەر گەوهـەری زانكۆكانــەو زۆر زۆر پێــی سەرســامم". لـە سـاڵی ١٩٧٤ داو لەتەمــەنی ١٩ ســاڵیدا، كۆنــدی تــوانی بڕوانامــەی بــەكالۆریۆس لــە زانســتە سیاسـییەكاندا بەدەسـتبهێنێت. كۆنـدی بـە باشـترین دەرچـووانی ئـەو سـاڵە دادەنرێت كە باڵاترین پلەی رێزلێنانیـان بەدەستهێناوە، بـە پلـەی شـەرەفەوە لـە زانكۆكـە دەرچـوو لەبەرئـەوەی تـوانی زنجیرەیـەك مـاددەی تایبـەتی بڕیـاردراو تــەواوبكات، هاوكــات پلــەی نایابیشــی لــە مــاددە بڕیارلێــدراوە باوەكــان، بەدەسـتهێنابوو، یـەكێكبوو لـەو ١٠ خوێنـدكارەی بـەهۆی ئـەوەی پێـی دەوتـرا "دەسـكەوتی سـەركەوتوو و بەڵگـەی بلیمـەتی لـە بـواری زانسـتە سیاسـییەكان"،

پلەی شەرەفیان بەدەستهێنابوو". لە بڵاوكراوەی دەرچووانی زانكۆكە ناوی كۆندی وەك ئەندامێكی مۆرتەر بۆرد هاتبوو كە ئەمەش كۆمەڵەیەكی فەخریی ژنان بوو. ئەو پلە نایابانەی بەدەستیهێنابوون لەگەڵ فراوانبوونی ئاسۆی بڕیارلێدراوە زانكۆییەكان بوونە هۆی ئەوەی بچێتە ناو برایەتیی فای بیتا كابا كە كۆمەڵەیەكی فەخری خوێندنبوو. دروشمە بەیۆنانی نووسراوەكەی ئەم كۆمەڵەیە هاوشێوەی ئەو دروشمە بوو، كە هەردوو بنەماڵەی رایس و رای هەڵیانگرتبوو، ئەویش بریتبوو لە: **خۆشویستنی دانایی، ڕێبەری ژیانە.**

بەهۆی ئەم هەموو پلە فەخرییانەوە، كۆندی شیاوی نازناوی سەركەوتوترین خوێندكار بوو، بەڵام راگەیاندنی بەدەستهێنانی خەڵاتێكی مەزنترو بەنرختر، سەرنجێكی فراوانی بەلای دەسكەوتە دیارەكانیدا راكێشا، ئەویش خەڵاتی ناوازەترین ژن بوو. زانكۆكە ئەم نازناوە بەمشێوەیە باسدەكات: "بەرزترین پلەی فەخرییە كە دەدرێت بە كچە خوێندكارێك كە بە درێژایی ماوەی خوێندنی زانكۆیی، خوێندنەكەی، بەرپرسیارێتییەكەی، دەسكەوتەكانی و پشكەكانی لە زانكۆكە، شیاوی ئاماژەپێدانن". شایانی باسە خودی كۆندۆلیزا رایس كە جارێكیان بەشێوەیەك وەسفكراوە كە "ماددەیەكی خاوی زانكۆیی نییە"، لە ساڵی ١٩٧٤دا پێش دەرچوون، بەرزترین پلەی فەخری پۆلەكەی بەدەستهێناوە. لەسەرەتای ساڵی خوێندنی ئەوساڵەدا ئەرشیباڵد كۆكس واتە ئەوكەسەی لێكۆڵینەوەی لەسەر پرسی ووتەرگەیت كردووە، وتارێك پێشكەش دەكات. تەوەری سەرەكی باسەكەی كۆكس لەوەدا دەبێت كە دەڵێت هەر خوێندكارێك بەیارمەتی نەتەوەكەی بەرپرسیارێتییەكی تایبەت لەئەستۆدەگرێت تا نەتەوەكەی لەو پەشێویە دەستورییە پارێزراوبێت كە ئابڕوچوونەكەی ووتەرگەیت ئاشكرای كردووە. كۆندی بە ناوەرۆكە بەهێزەكەی ئەو بانگەوازە زۆر سەرسام دەبێت. ئەم ژنە ئەمە باسدەكات و دەڵێت: "بەوپێیەی كە ئەوە روون نەبوو لەلام بە دیاریكراوی چۆن ئەم یارمەتییە پێشكەش بكەم، لەوە دڵنیانەبووم كە تەنها ماددەیەك كە لە بابەتی سیایەتی ئەمەریكیدا خوێندوومە، كردوومیەتە كەسێكی ئامادە بۆ ئەم كارە. بیرم لەوە كردەوە كە رەنگە باشتربێت

بۆ من لەزانکۆدا بمێنمەوە یان لە سەعات ٩ تا پێنج کارێکم دەستبکەوێت و هەموو ئەو ئەرکانەم لەبیربچێتەوە کە هەمووان بەسەریاندا سەپاندووم، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەو هەلەم نەبوو کە پێویستم پێیەتی". ئەو وتارە بووە یارمەتیدەرێك بۆ کۆندی کە پەرە بە بەرنامەکانی بدات لە ڕووبەڕووبوونەوەی پرسەکاندا، کاتێکیش بووە پرۆفیسۆری زانکۆ ئامۆژگاری خوێندکارەکانی دەکرد، لە ڕێگەی پێشکەشکردنی ئەوەی لە توانایاندایە ئەگەرچی بچووکیش بێت، ڕووبەڕووی ئەو کێشە گەورانەی جیهان ببنەوە.

بەجێهێشتنی زانکۆ بەم ناوازەییەوە، بووە هۆی ئەوەی بە ئاسانی بچێتە ئاستێکی بەرزتر لە ئاستی خوێندنی زانکۆیی، ئەمیش کارێکبوو کە پاش چاوەڕوانییەکی زۆر ئەنجامی دەدات، ئەویش قوڵبونەوەبوو لە خوێندنی زمانی روسی و کاروباری سۆڤیەتدا. کۆندی ئەوەی هەڵبژارد کە خوێندنە نوێکەی لە باشترین شوێنی وتنەوەی ماددەی سیاسەتی نێودەولەتی، لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، دەستپێبکات، هەربۆیە کەرەستەو جانتای پێچایەوەو رووی کردە زانکۆی نۆتەردام لە ویلایەتی ئیندیانا.

# بەشی پێنجەم

## ژنە رۆشنبیرەکە

رۆشنبیری شتێکە دەتوانرێت بنیاتبنرێت، منیش وەك خۆم، مەیلدارێکی گەورەی فێربوونم دەربارەی روسیا... هەندێك بابەت هەن پەیوەندییان بە چەند کولتورگەلێکی دیاریکراوەوە هەیە، کە راتدەکێشێن بەرەو لای خۆی... ئەمە وەك خۆشەویستی وایە، تۆ ناتوانیت ئەوە روونبکەیتەوە کە بۆچی دەکەویتە خۆشەویستییەوە.

### کۆندۆلیزا رایس

جارێکیان لە روسیای کۆندا کچە شازادەیەکی گەنجو شۆخو شەنگ بەهۆی ئەو جادووەی باوکە جادوگەرەکەی ئەنجامیدەدان، دەبێتە بۆق، بەهۆی ئەو هێزەی کچەکەی هەیەتی، باوکی ئیرەیی پێدەبرد. تسارفنا لیاگۆشکا (شازادە بۆقەکە) تیرێك دەبینێت کە لەئاسمانەوە دێتە خوارەوە، ئەمیش تیرەکە بەدەم هەڵدەگرێتەوە. پاش ئەوە کوڕە شازادەیەك لە دارستان دەردەکەوێتو بەدوای تیرەکەیدا دەگەڕێت. شازادە ئیڤان دەزانێت کە ئەو تیرەی، دەیگەیەنێتە لای ئەو خانەی کە دەیەوێت، هەربۆیە بۆقەکە دەکاتە هاوسەری خۆی.

دەستبەجێ پاش گەڕانەوەی ئەم ژن و مێردە بۆ شانشینەکە، پادشا پێشبڕکێیەک رادەگەیەنێت بەو هیوایەی بەهرەمەندترین و بەتواناترین و داهێنەرترین ژن لە شانشینەکەیدا بدۆزێتەوە، ئەمەش ئەو ژنەیە کە دەبێتە هۆی سەرسامی هەمووان. یەکەم بەشی پێشبڕکێکە چنینی کراسێك دەبێت. شازادە ئیڤان بەوپەڕی نیگەرانییەوە دەڕواتەوە ماڵەوە بەڵام بوکە بۆقەکەی پێی دەڵێت نیگەران مەبە. لەشەودا بۆقەکە بازێك دەداتە دەرەوەو دەبێتە شازادەیەکی شۆخ و شەنگ کە پێی دەوترێت فاسیلیای دانا. ئەم شازادەیە بەپەلە ئەو خوشکانەی بانگدەکات کە توانایەکی بێهاوتایان هەیە تا لە دروستکردنی کراسێکی جوان لە دەزووی زێڕو زیو، یارمەتی بدەن. سەرلەبەیانی داهاتوو کوڕە شازادەکە کراسەکە دەبات بۆ پاشا، ئەویش رایدەگەیەنێت کە ئەم کراسە لە هەموو ئەو کراسانەی بەدرێژایی ژیانی بینیویەتی، باشترە. بەوشێوەیە بۆقەکە لە هەموو ئەرکێکی نوێی پێشبڕکێکەدا، کاری هێندە ناوازە دەکات بەشێوەیەك پاشا توشی سەرسوڕمان دەبێت، بەهۆی ئەمەشەوە کەسانی تر ئیرەیی پێدەبەن و رقی لێهەڵدەگرن. هیچ کەسێك تەنانەت شازادە ئیڤانی خۆشەویستیشی، نەیاندەزانی ئەم کچە شازادەیە سەربە بنەماڵەیەکی شاهانەیە بەڵام خۆی شاردۆتەوە.

کاتێك پاشا داوای لە هەمووان کرد کە لە هۆڵە گەورەکە ئامادەبن، شازادە ئیڤان جارێکی تر هەستی بەخەمباری کرد، چونکە دەیزانی سەرجەم ئامادەبووان گاڵتە بەخۆی و بوکەکەی دەکەن کە بۆقەکە بوو. شازادە بۆقەکە پێیوت پێویست بەخەمباری ناکات و ئەوەی لەسەریەتی ئەوەیە کە لەسەر خوانی کۆشکەکە، چاوەڕێی بکات. ئەو شەوە کچە شازادەکە بە جلوبەرگێکی شکۆمەندییەوەو وەك فاسیلیای دانا، گەیشتە شوێنی مەبەست. پاش ئەوە کوڕە شازادەکە لە ئەنجامدانی کۆمەڵێك ئەرکی قورس، سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت و ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی جادووەکەو فاسیلیای داناش بۆ هەتاهەتایە بەشێوە راستەقینەکەی خۆی دەمێنێتەوە.

لێکچوونێکی زۆر لەنێوان دەسکەوتە ئەکادمییەکانی کۆندۆلیزا رایس لەو بوارەی کە هەڵیبژارد، جا پێش دەرچوون بێت یان پاش دەرچوون و تسارفنا لیاگۆشکادا هەیە. لەو ئەمەریکایەی بەمدواییانە دەستبەرداری لە جیاکاریی نەژادی هێنابوو، تائێستاش سەرکەوتنی ژنێکی رەشپێست لە دەرچوون لە زانکۆو سەرکەوتن لە چەند زمانێکی بیانیداو دواتریش بوون بەژنێکی رۆشنبیر لەهەر بوارێکدا، کارێکی بێوێنەیە. سەبارەت بەوەی کە دەسکەوتەکانی بۆیە زیاتر بێهاوتان چونکە رەشپێستە، جارجارە نیگەرانی یەخەی کۆندی دەگرێت. کۆندی دەستەواژەیەکی چیرۆکە خەیاڵییەکان بۆ وەسفکردنی کاردانەوەکەی بەکاردەهێنێت و دەڵێت حاڵی ئەو وەك حاڵی "ئەلیسە لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا" و هەستدەکات کە ئەو کەسانەی بەهۆی ئەوەی ژنێکی رەشپێستەو سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، دەسکەوتەکانی بەشتێکی ناوازەو دەگمەن دادەنێن، ئەوانە کردوویانەتە کەسایەتییەکی سەرسوڕهێن بەشێوەیەکی زیاتر لەوەی لەڕاستیدا بوونی هەیە. کۆندی دەڵێت: "درێژی باڵام پێنج پێ و هەشت ئینجەو رەشپێست و ژنم. ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ رابردوو تا جارێکی تر خۆم دروستبکەمەوە، هەروەها ناشتوانم تاقیکردنەوەیەك بکەم تا بزانم ئەگەر بە پیاویان ژنێکی سپیپێست یان تەنانەت پیاوێکی رەشپێست دروستببوومایە، هەموو ئەم شتانە رووی اندەدا یان نا، بۆیە کاتی خۆم بە بیرکردنەوە لەم شتانە، بەفیڕۆ نادەم".

مەیلی کۆندی بەلای روسیاو زمانی روسی و یەکێتیی سۆڤیەتدا روون و ئاشکرابوو و کاتێکیش پەیوەندیکرد بە زانکۆوە، ئەم خولیایەی بووە ئارەزوویەکی کەسێکی ئالۆدە. نەیدەتووانی هۆکاری ئەم خولیا سەرشێتانەیەی بۆ ئەو بەشەی جیهان روونبکاتەوە بەڵام خۆویستانە هەڵیبژارد. پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك پەیوەندیکرد بەچەند کەسێکەوە کە ئەوانیش کاریان لە بواری سیاسەتی دەرەوە دەکردو کتومت هاوشێوەی کۆندی خۆیان بۆ مێژووی سۆڤیەت و زمانی روسی تەرخانکردبوو بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی کۆنیان لەگەڵ ئەو وڵاتەدا هەبێت.

هەڵبـژاردنی زانکۆیـەك کـە کۆنـدی تێیـدا بڕوانامـە بەدەسـتبهێنێت، بـەلای جـۆن و ئـەنجێلینا رایسـەوە، شـتێکی قـورس نـەبوو لەبەرئـەوەی ئـەم دوانـە زانیارییـەکی باشـیان لەسـەر پـەیمانگاکانی پـاش قۆنـاغی دواناوەنـدی، هـەبوو. دایك و بـاوکی واڕاهـاتبوون هـەر لـەکاتی لـەدایکبوونی کۆندییـەوە، بـەدوای زانکۆیەکـدا دەگـەڕان کـە باشـترین چانسـی فێرکـردن پێشـکەش بـە کچەکەیان بکـات و ئەمانـەش کـە لەمیانـەی گەشـتە هاوینەکانیانـدا بـەناو زانکۆکانـدا ئەنجامیانـدەدا، ببوونـە هـۆی دەسـکەوتنی ئـەو زانیارییانـەی لـەداهاتوودا سـودی پێدەگەیاند. لەلایەکی ترەوە بەهۆی ئەو پۆستە ناسەرەکییانەی جۆن رایـس لـە کڵێسەو زانکۆدا، بەڕێوەی دەبردن، دیارترین کەسانی ئـەم دوو بـوارەی دەناسـیو بەهۆی ئامۆژگارییەکانی ئەمانیشەوە دەیتوانی باشترین زانکۆ هەڵبـژێرێ. قەشـە تیۆدۆر هیسبۆرگ کە بەڕێوەبەری زانکۆی نۆتەردام بوو، یەکێك بوو لەو کەسـانە. خێزانـی رایـس دەیـانزانی کـە نۆتـەردام یەکێکـە لەباشـترین زانکـۆ تایبەتـەکانی ئەمەریکا، بەڵام قسەکانی جۆن لەگەڵ باوکە هیسـبۆرگ، سـەبارەت بـە فەلسـەفە کۆنزێرڤاتیڤەکەی زانکۆکە کە زۆر پابەندی بەهاکانبوو، تێڕوانینێکـی ورددتـری دا بە باوکی کۆندی.

هـەر لـە سـاڵی ١٨٤٢ەوە کەتێیـدا لەسەردەسـتی قەشـەیەکی کڵێسـەی رۆمـانی کاسـۆلیکی دامـەزراوە، ئـەو زانکۆیـە واڕاهـاتبوو کـە فێرکـردن بـۆ ئـەو کەسـانە دابینـدەکات کـە رووبـەڕووی "پرسـەکانی بـەهاو مانـا" دەبنـەوە. هەرچـەندە رێژەیـەکی زۆری خوێنـدکارانی نۆتـەردام کاسـۆلیکی نـەبوون، بـەڵام ئـەم زانکۆیـە بەشـێکی هەوڵـەکانی بـۆ هانـدانی خوێنـدکاران لەسـەر بەشـداریکردن لـە خزمەتکردنی کۆمـەڵگاو رووبەڕووبوونـەوەی ژیـان بەوپێیـەی کـە "رێگەیەکـە بـۆ ناسینی ئەو پەروەردگارەی کە نابینرێت"، ئاڕاستەدەکرد. زانکۆکـە بیروبـاوەڕێکی تـر لـە بیروباوەڕکـانی کڵێسـەی رۆمـانی کاسـۆلیکی پـەیڕەودەکرد کـە پوختەکـەی ئەمەبوو: "بەهرەی خوایی چالاکی مرۆڤ هاندەدات کە یارمـەتی جیهـان بـدات لـە بنیاتنانی دادوەری لەسەر بنچینەی خۆشەویستی"

دیاربوو ئەم تێڕوانینە واتە ئەو پەرەسەندنە رۆحییەی هاوشان لەگەڵ خوێندنی زانکۆییدا دەڕوات، بەلای قەشە رایسەوە کە خۆی بۆ رێنوێنیکردنی تازەلاوان تا باوەڕو مێشکیان پەرەپێبدەن، تەرخانکردبوو، زۆر سەرنجڕاکێش بوو. جۆن پێیوابوو ئەمە ئەو شوێنە گونجاوەیە کە پێویستە کۆندی تێیدا خوێندنی زانکۆیی پەرە پێبدات.

جۆرج برنکلی کە سەرپەرشتیاری نوێی کۆندی بوو، باس لەوە دەکات کە کۆندی لەبیروبۆچوونی کۆنەپارێزانەو گرنگیدان بەوەی ببێتە نموونەیەکی بالای زانکۆ، لەباوکی دەچوو. برنکلی بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "پێموایە ناوبانگە کۆنزێرڤاتیڤەکەی نۆتەردام بەشێك بوو لەو پاڵنەرانەی ببوونە هۆی ئەوەی کۆندۆلیزا پەیوەندی پێوە بکات، بەلام ئەو کەسێکی زۆر ئالۆزەو ئاسان نییە کە بێگومان بڵێین لەبەر ئەم هۆکارە پەیوەندی بە زانکۆکەوە کردووە. کەسێکە متمانەیەکی بێشوماری بەخۆی هەیە. پێموایە ئەو بۆیە حەزی لەو زانکۆیە بوو، چونکە زانکۆیەکی تاڕادەیەك بچووکەو خۆشی کەسێکە سەرباری پرۆگرامە کردەییەکانو راهێنانەکان، پابەندە بە بەهاو فەلسەفەو ئایدۆلۆژیا بنچینەییەکانەوە. من بۆ خۆشم لەبەر ئەم هۆیە حەزم لەو زانکۆیە بوو هەرچەندە نە منیشو نە کۆندیش هیچمان، کاسۆلیکی نەبووین... نیوەی دەستەی فێرکاریش کاسۆلیکی نەبوون. بەهۆی ئەوەی پرۆگرامەکانی دەرچوون بە فرە رەنگییە گەورەکەی جیادەکرایەوە، زانکۆکە توانیبووی خوێندکارانی بیروبۆچوونو باگراوندە جیاوازەکان بۆلای خۆی رابکێشێت"

وێڕای رەزامەندی باوکیو بچووکی قەبارەی کلاسەکان، هۆکارێکی تریش هەبوو کە بەهۆیەوە کۆندی داواکاری پەیوەندیکردن بە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی نۆتەردام، پێشکەشکرد. بەشی خوێندنی حکومیو نێودەولەتی یەکێك لە باشترین ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە لەسەر سۆڤیەتی لەخۆگرتبوو، ئەمەش ناوەندێکبوو کە لەلایەن کۆچبەرێکی ترەوە کە ئەویش وەك کۆربێل، لەئەوروپاوە هاتبوو، دامەزرێندرابوو. ئەم پیاوە لەم پۆستەدا دامەزرابوو تا بەشداری لەو هەوڵە ئەمەریکییانەدا بکات کە ئامانجیان تێگەیشتن

بوو لە مێژووی روسیاو سۆڤیەتدا. لە ساڵی ١٩٤٧ کاتێك کۆمۆنیستەکان دەسەڵاتیان لە وڵاتەکەدا گرتەدەست، ستیڤن د. کێرتسز کە دیبلۆماسێکی هەنگاری بوو، ئەو وڵاتە بەجێدەهێڵێت. کێرتسز لەسەر راسپاردەی فیلیپ موسلی سەرۆکی پەیمانگەی روسی سەربە زانکۆی کۆلۆمبیا (کە ئێستا ناونراوە پەیمانگای هاریمان)، بانگهێشتدەکرێت تا یارمەتی ئامادەکردنی ئەم پرۆگرامە بدات. سەبارەت بە پێکهێنانی بەرنامە تایبەتەکەی، زانکۆی نۆتەردام بە بەردەوامی لەگەڵ موسلیدا، لەراوێژدا بوو، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە ئیدارەی پەیمانگای روسی لە کۆلۆمبیا رێگەی پێدابوو پەیوەندی لەگەڵ چەندین کۆچبەری سیاسیی لەئەوروپاوە هاتوو، دروستبکات.

پەیمانگای روسی کە یەکەم بەرنامەی لەو شێوەیە بوو بۆ خوێندن سەبارەت بە سۆڤیەتو کاروباری روسی، توانی لەژێر سەرپەرشتیی موسلی گرووپێك پرۆگرام ئامادە بکات لەوانە، بەشی خوێندنی نێودەولەتی کە کۆندی لە نۆتەردام پەیوەندی پێوەکرد. ئەم پرۆگرامانە توانییان ئەو خوێندکارانە بەلای خۆیاندا رابکێشن کە لەسەردەمی پێشبڕکێی ناوکی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانو یەکێتیی سۆڤیەت واتە لە پەنجاکانو شەستەکانو حەفتاکانی سەدەی رابردوو، هەوڵیاندەدا پۆستی حکومیو زانکۆیی بەدەستبهێنن. مارك ئێڵ فۆن هاگن بەڕێوەبەری پەیمانگای هاریمان دەڵێت: "لەپێناو دەولەمەندکردنو ئاڕاستەکردنی پەیوەندییەکانمان لەسەردەمی جەنگداو پلاندانان بۆ سەردەمی پاش شەڕ، حکومەت ئەوەی لەتوانایدا بوو کۆیکردەوە. زۆربەی دەرچووانی ئەم پەیمانگایانە بینییان چەندین کار چاوەڕێیان دەکەنو حکومەت ببووە دابینکارێکی سەد لەسەدی کار"

ستیڤن کێرتسز بۆ سەرۆکایەتیکردنی پرۆگرامی نۆتەردام هەڵبژێردرا، پێشتریش وەك فەرمانبەرێکی ئاستبەرز لەوەزارەتی دەرەوەی هەنگاریادا، کاریکردبوو. ئەوکاتە کێرتسز سکرتێری گشتی یەکەمی نێردەی هەنگاریا بوو لە بوخارستو بەرپرسی کەمایەتی هەنگاری بوو لە هەرێمی ترانسلڤانیای باشوردا. کێرتسز پاش پەیوەندیکردنی بەدەستەی فێرکاری زانکۆی نۆتەردامەوە، چەندین

وتار سەبارەت بەسیاسەت لە ئەوروپای رۆژهەلاتدا، دەنووسێت.

جۆرج برنکلی دەچێتە پال لێکۆلەرە نوێکانی پەیمانگا روسییەکەوە. برنکلی خوێندن لە زانکۆکە تەواودەکاتو بڕوانامە بەدەستدەهێنێت، جگە لەوەش لە زانکۆی کۆلۆمبیا، بڕوانامەی دکتۆرا لە زانستە سیاسییەکان بەدەستدەهێنێت. ئەم پیاوە رێڕەوی ئەکادیمی هەلدەبژێرێتو لە سالی ١٩٥٨دا پەیوەندی دەکات بە کێرتسزو ئەندامانی تری دەستەی فێرکاری زانکۆی نۆتەردامەوە، بەوەش دەبێتە یەکێك لە تاکەکانی نەوەی دووەمی ئەو لێکۆلەرانەی کاروباری سۆڤیەت کە لەپەیمانگاکەدا وانەیان وتووەتەوە. برنکلی دەبێتە یەکێك لەو لێکۆلەرە دیارانەی گرنگی زۆر بە پرۆگرامی نۆتەردام دەدەن، چەند لێکۆلینەوەیەك بلاودەکاتەوە لەوانە: **لینینی: نوێنەرایەتی چی دەکاتو نوێنەرایەتی چی ناکات، لەناوچوونی ولات لەژێر حوکمی خرۆشۆفدا، یەکێتیی سۆڤیەتو نەتەوە یەکگرتووەکان: رۆلی گۆڕاو لە ولاتە تازەپێگەیشتووەکان**. یەکێك لەکتێبەکانی بەناوی **سوپای خۆبەخشەکانو شۆڕش لە باشوری روسیادا** خەلاتی بەدەستدەهێناوە کە خەلاتێکە یەکێتیی ئەمەریکی بۆ مێژوو، دەیدات.

لە کۆتاییەکانی چلەکانی سەدەی رابردوودا، بەشی لێکۆلینەوەی حکومیو نێودەولەتی لە زانکۆی نۆتەردام بووە ناوەندێکی گرنگی لێکۆلینەوە لەسەر روسیاو یەکێتیی سۆڤیەت. خوێندن لەم بوارەدا بە چڕوپڕییەکەیو خوێندن سەبارەت بەتەنها ولاتێك جیادەکرایەوە کە ئەمەش پێچەوانەی بەشەکانی تر بوو کە رومالی هەموو ناوچەکانی دەکرد. بەشی خوێندن سەبارەت بە روسیا، توانی ئەو کەسانە بۆ لای خۆی رابکێشێت کە حەزیان لە لێکۆلینەوە سەبارەت بەقولایی جەنگی ساردو ئەنجامدانی هەندێك لێکۆلینەوەی پێشکەوتوو لە مێژوو و سیاسەتدا، دەکرد. ئەو کەسانەی پەیوەندییان بەو بەشی نۆتەردامەوە دەکرد، پێشبینییان دەکرد پۆستێکیان لە جیهانی سیاسەتی دەرەوە یان پەیوەندییە نێودەولەتییەکان دەستبکەوێت، یان بتوانن خوێندنەکەیان بەشێوەیەك بەکاربهێنن کە ببێتە بنچینەیەکی تری کاری زانکۆیی بۆیان لە بواری یاسا یان خوێندنی زانکۆییدا. کۆندی پێشئەوەی بچێتەناو زانکۆی نۆتەردامەوە، ئەو

ناڕاسـتەیەی یـەکلایی نـەکردبووەوە کـە خوێندنەکـەی بـۆی دەبـات، بـەڵام هەستیکرد ئەگەری دەسـکەوتنی پۆسـتێك لـەم زانکۆیـە پـاش خوێنـدن، زۆر لـەوە بۆی باشترە کە خوێندن لە بواری موزیکدا تەواوبکات. جارێك پرسـیار لـە کۆنـدی دەکرێـت کـە بـەنیازە بـەو بڕوانامـە زانکۆییـەی لـە بـواری پسـپۆڕییە نوێکـەی بەدەستیدەهێنێت، چی بکات؟ لەوەڵامدا دەڵێت: "زۆرچاکە، دیـارە بـازاڕی کـار لـە بواری مێژووی روسیام زۆر لە بواری پیانۆژەنین بەلاوە چاکترە".

کۆندی لە زانکۆی نۆتەردام بـۆ خوێنـدنی بـاڵا وەرگـیرا، هـەر کـە وەریشـگیرا، لەژێر چاودێری جۆرج برنکڵی دەستیکرد بە پرۆگرامـی تایبـەتی ماسـتەر. دیـاربوو برنکڵـی سـەبارەت بـە پرۆگرامەکـەی کۆنـدی کەسـێکی گونجـاوبوو، هـەروەها لـە دانانی بەرنامەی خوێندنە زانکۆییەکەشیدا، زۆر بەوردی یارمـەتی بەشـەکەی داو لەمەشدا پشتیبەست بەهێزو تواناو گرنگیپێدانـەکانی ئـەم خانمـە. برنکڵی بـاس لـەوە دەکـات کـە کۆنـدی وەك زۆربـەی خوێنـدکارانی تـر، بـەبێ ئـەوەی پێشـتر بەشـێوەیەکی فـراوان، کـاری لـە خوێنـدنی روسـیدا کردبێـت، پەیوەنـدیکرد بـە زانکۆکـەوە. برنکڵـی دەڵێـت: "زۆربـەی خوێنـدکاران کـە دەهـاتن باکگراونـدێکی لاوازیـان هـەبوو، بۆیـە دەبـوو شـتە بنچـینەییەکانی وەك مێـژوو و رەوشـی کۆمەڵایەتیو کلتورییـان پـێ بڵێین تـا بتـوانن لـە یـەکێتیی سـۆڤیەتو کۆمـۆنیزم تێبگەن"

کۆنـدی لەسـەرکەوتنەکانی بـەردەوامبوو، ئـەوەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو خوێندنـەوە زیادانـەی لـە مـاوەی دوو سـاڵی کۆتاییـدا لـە دێنیڤـەر، سـەبارەت بـە بابەتی پسپۆڕییەکەی، ئـەنجامی دەدان، لـەو ماوەیـەدا چـەندین بابـەتی فراوانـی پەیوەندیـدار بـە جـەنگی جیهـانی دووەمو قەیرانـە سـەربازییەکان بەشـێوەیەکی گشـتی، دەخوێنێتـەوە، هـەروەها زۆر شـت لـەبارەی رۆماننووسـە روسـەکان لەوانـە دیستۆفسـکیو سۆڵجنسـتین، دەخوێنێتـەوە. کۆنـدی سـەبارەت بـە سۆڵجنتسـین دەدوێتو دەڵێت: ".... ئەوەنـدەی ئـەو بـە باشـی لەلایەنـە تاریکەکـەی روسـیا تێگەیشـتووە، هـیچ کەسـێکی تـر تێینەگەیشـتووە". سـەرباری خوێندنـەوەی چـەندین کتـێبی مێـژوویی و رۆمـان، کۆنـدی بـەهۆی وانـەکانی زمـانی روسـییەوە،

توانی بە قوڵی لە ئەدەبو کلتوری روسی تێبگات، هەر لەسەرەتای خوێندنی وانەکانەوە لەگەڵ کۆربێل، بەوپەڕی شەیدایییەوە بابەتەکانی قۆستۆتەوەو پێی وایە خوێندنەوە فراوانەکەی وەك سەرکەشییەك وابووە.

برنکلی هەرزوو لەوە تێگەیشت کە کۆندی بەشێوەیەکی خێرا وانە دەخوێنێتو کەسێکی بەهرەدارە. لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەو پرۆگرامی خوێندنە باڵایەی سەبارەت بە کاروباری سۆڤیەتو ئەوروپای رۆژهەڵات هەمانە، بنەمای چەند بڕیارلێدراوێکی پێویستی هەیە... کۆندی کەسێکی زۆر لێهاتوو بوو هەربۆیە بەشێوەیەکی باشتر لە زۆربەی خوێندکارەکان، دەستیپێکردو خۆی ئامادەکرد" برنکلی لە گرنگی ئەو رۆڵە تێگەیشت کە دایكوباوکی لە پەرەپێدانی متمانە بێشومارەکەی بەخۆیدا، بینیویانە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە خودی خۆی توانایەکی ئەکادیمی باشی هەبوو. ئەم پیاوە بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "یەکێکبوو لە خوێندکارە پەرۆشەکان، هەر لەمنداڵییەوە خاوەنی هەستی رێزلەخۆگرتن بووە. باوکی واڕاهاتبوو لە رێگەی ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت بە چاوپۆشین لە جۆری ژیان لەمنداڵیدا، گرنگترین شت بریتییە لەو کلتورەی کە ئەو توانایەی پێداوە کە چی بوێت، بیکاتو سەرکەوتن لەهەر کارێکدا بپێکێت کە خۆی هەڵبداتە ناوی، هانی دەدا".

برنکلی ئاماژەی بە بەهرەمەندیی کۆندی داوە لە زمانی روسیدا. لەمبارەوە دەڵێت: "کۆندی پێش ئەوەی بێتە نۆتەردام، کەمێك زمانی روسی فێرببوو، بەڵام پێموابوو کە لێرە زۆر بەخێرایی فێردەبێت، چونکە خاوەنی بەهرەیەکی مەزنە. لەو لایەنانەی کە دیارە بۆ من قورسبوون، کۆندی توانی بەئاسانی فێریان ببێت".

ئەو بەشەی زانکۆ دەستیکرد بە ئامادەکردنی بەرنامەیەکی تایبەت بۆ کۆندی، بەرنامەیەك کە بتوانێت ئەو زانیارییانەی پێبدات کە ئاواتی بۆ دەخواستن. برنکلی لەمبارەیەوە دەڵێت: "هەر لەسەرەتاوە ئەوەمان بۆ روونبووەوە کە ناتوانین بڕیارلێدراوە ئامادەو نەگۆڕەکانی پێبدەین، دەمزانی کە کەسایەتییەکە خاوەنی هەڵپەیەکی زۆرەو ژمارەیەکی بێشومار کتێبی

خوێندووەتەوەو ئەگەر بەوپێیەی خۆی دەیەوێت کاربکات، سود لە هەلێکی زۆر دەبینێت، ئەمەش ئەوەبوو کە خودی خۆی دەیویست". برنکلی لە ڕێگەی خولێکی خوێندنەوە کە پێی دەوترا خوێندنەوە راستەوخۆکان، دەستدەکات بە ڕێکخستنی بڕیارلێدراوە ئاساییەکانو ژمارەیەکی زۆر لەکاری سەربەخۆ. کۆندی زیاتر لەهەر خوێندکارێکی تری پرۆگرامەکە دەتوانێت خوێندنی سەربەخۆ ئەنجامبداتو بەهۆی ئەمەشەوە راستەوخۆ کار لەگەڵ پرۆفیسۆر برنکلیدا دەکات، لەسەرەتادا بابەتێك هەڵدەبژێرێتو پاش ئەوەش لیستی خوێندنەوەکان ئامادەدەکاتو لێکۆڵینەوەی پەیوەندیدار بە بابەتەکە ئەنجام دەدات. لە ماوەی ئەو ساڵەدا هاوڕێ لەگەڵ برنکلی، چەند دانیشتنێکی خوێندن ئەنجامدەداتو بەهۆی ئەمەشەوە ئەزموونێکی چڕوپڕو نایابی بۆ دروستدەبێت. راستە کۆندی بەهۆی بچووکی کلاسەکانی زانکۆی نۆتەردامەوە پەیوەندیکرد بەو زانکۆیەوە، بەڵام ئەوەی لێی سودمەندبوو زۆر گەورەبوو، ئەویش ڕێبەرو پسپۆڕێکی لێنەبڕاوی تایبەت بەیەکێتیی سۆڤیەت بوو، ئەو کەسەش یەکێکە لە دیارترین لێکۆڵەرانی ئەم بوارە.

کۆندی شەیدای دیاردەکانی هاوسەنگی هێزبوو، ئەو دیاردانەی کە حوکمی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان دەکەنو کاتێك لە دێنیڤەر بوو، سەرنجی ئەمەی دابوو، هەربۆیە هەڵمەتی خوێندنی سیاسی لە ڕێگەی خوێندنەوەی کارەکانی هانز مورگنساو، دەستپێکرد. هەستیکرد ئارەزووی بەلای واقیعبینی سیاسیی مۆرگنساودا هەیە. کۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "زۆرم خوێندەوەو زۆر بە هانز مۆرگنساو، سەرسام بووم". "زبیگنیۆ بریزنسکیو جۆن ئیریکسۆن کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر جێهێشتووم". بەدرێژایی شەڕی سارد، واقیعبینی یان واقیعی سیاسی سیاسەتەکانی دەسەڵات، بابەتێکی دیارو زەق بووە لە خوێندنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی ناو پرۆگرامی خوێندنی سۆڤیەت لە زانکۆکانی کۆلۆمبیاو نۆتەردامو دێنیڤەرو چەندین زانکۆی تریشدا. ئەو بۆچوونەی لە دووتوێی لاپەڕەکانی کتێبی (**سیاسەت لەنێوان وڵاتاندا**)ی مۆرگنساودا پیشاندراوە، توانی دیدی کۆندی لەکاتی بەڕێوەبردنی پۆستەکانیدا، بۆ سیاسەتی دەرەوە، گەڵاڵە بکات.

ئـەو پرۆگرامـە پراكتيكيـيـەى واقيعبـينى پـێ جيادەكرێتـەوەو پێداگرى لەسـەر ئـەوە دەكاتـەوە كـە كـردەوەى وڵاتو نەتـەوە لەسـەر سروشـتى بنچـينەيى مـرۆڤ وەسـتاوەو دەڵێـت نەتـەوە هـەروەك مـرۆڤ هـەوڵى پاراسـتنى بەرژەوەنديـيـە تايبەتـەكانى خـۆى دەدات، تـوانى سـەرنجى كۆنـدى بـەلاى خۆيـدا رابكێشـێت. مۆرگنسـاو نووسـيويەتى: "دەسـەڵات حـوكمى مـرۆڤ بـە مـرۆڤ دەكـات"و دەڵێـت پێويستە هەموو وڵاتێك بەپێى بەرژەوەندى نەتـەوەيى خـۆى، هەڵسوكەوت بكـات. بەردەوامـدەبێتو دەڵێـت كێشـە لەسـەر دەسـەڵاتە بـۆ نموونـە شـەڕ كاتێـك هەڵدەگيرسێت كە وڵاتانى تر هەڕەشە لەم بەرژەوەندييە دەكەن. مۆرگنساو هاوكات دەشـڵێت كـە ئايـدياليزم يـان سياسـەتە ليبراڵييـەكان سـورن لەسـەرئەوەى جـەنگ ئامازەيەكە بـۆ شكسـتخواردن لـە پەيوەنديـيـە نێودەولەتييەكانداو باشـترين هـەلى ئاشتى لە هاوكارىو دامەزرانـدنى رێكخراوێكـى بـالاّى وەك نەتـەوە يـەكگرتووەكانو يەكێتى ئەوروپيدا، خۆى دەبينێتەوە. ئايدياليستـەكان پالنـەرەكانيان لـە پرسـەكانى بنـەما رەوشـتىو ئايدۆلۆجييـەكان دەبيننـەوە، بـەلاّم واقيعبينـەكان خۆيـان بـەوە سـەرقالّ دەكـەن كـە مۆرگنسـاو ناوينـاوە ديـدى "عەقلانيـەتو بابەتيانـەو ناسۆزدارى"و وڵاتان لەپێناو مانەوەياندا، پێويستە پەيرەوى بكـەن. كۆنـدى لەگـەلّ ئەو چەمكەدا هاورايە كە دەلێت بەرژەوەندييە بالاكانى وڵات لە ڕێگەى سـەپاندنى پرسە ئايدۆلۆجييەكانو بلاوكردنەوەيان لەسەرتاسەرى جيهاندا، خزمەت ناكرێت.

واقيعبينەكان هێزى سەربازى بە گرنگترين سەرچاوەى ئـەو هێزە دادەنـێن كـە وڵات هەيـەتىو زۆرجـار گـۆڕان لـە هێـزە رێژەييـەكانى نێـوان وڵاتانـدا، هەلگيرسـانى شـەڕى لێدەكەوێتـەوە. واقيعبـينى لـە مـۆراڵ بێبـەش نييـە، بەهـەرحالّ پێويسـتە هەموو زانايەكى كۆمەلناس لـە مـاوەى پـاش شـەڕدا، ئـەو پرسـە رەوشـتيانەى وڵات تاووتوێ بكـات كـە رووبـەڕووى هەڕەشـەى نـاوكى دەبنـەوە. جويـلّ رۆزنتـالّ دەڵێت: "واقيعبينەكان سورن لەسەرئەوەى بەرژەوەندى نەتـەوەيى دەتوانێت گوزارشـت لـە بـەها ئەمەريكييـەكان بكـات، بـەلكو پێويستيشـە وابێـت". رۆزنتـالّ هەنـدێك لـەم بەهايانـەى باسـكردووە لەوانـە وێـڕاى "عەقلانيـەتو خۆبەكـەمگرىو پاراسـتنى ئازاديى، نموونەى ئەو بەهايانەن.

كۆنـدی خـۆی بەسیاسـەتمەدارێكی واقیعبین ناودەبـاتو لـە ڕوونكردنـەوەی ئەم هەڵوێستەشیدا دەڵێت هەر لەسەرەتاوە "سروشـتە بیزەنتییەكـەی سیاسـەتی سۆڤیەتو ئەو دەسەڵاتەی پەیڕەوی دەكرد: چۆنیەتی كارپێكردنو بـەكارهێنانی" بـۆلای خـۆی ڕاكێشـاوە. هـەروەك پشـتگیری ئـەو توخمـە ڕەوشـتییەش دەكات كـە ئەمەریكییـەكان بەشـێوەیەكی كلاسـیكی، ڕەچـاوی دەكـەنو دەڵێـت: "مـن واقیعبیـنم. دەسـەڵات كـارێكی گرنگـە، بـەڵام نـاتوانین لـە سیاسـەتی دەرەوەی ئەمـەریكادا ڕێبـدەین تـوخمی ڕەوشـت نـەمێنێت، هـەروەك گـەلی ئەمـەریكاش ناتوانێت ئەم نەمانەی قبوڵ كات" ئان ڕایلی دود لە شیكردنەوەی كەسایەتی ڕایسدا كە لە گۆڤاری جۆرجدا بڵاویكردووەتەوە، دەڵێت: "كۆندی لەوە تێگەیشت كە شەڕی سارد شەڕی ئایدۆلۆژیاكانی نێوان كۆمـۆنیزمو دیموكراسـی نییـە، بـەڵكو شتێكە ڕەگی زیاتری هەیە، واتە ئەو شـەڕە كێبەركێیـەكی بنەماییـە لـەنێوان دوو هێزی مەزن كە خاوەنی بەرژەوەندی نەتەوەیی دژبەیەكن"

كۆنـدی لەسـەر خواسـتی خـۆی ئـەوەی هەڵبـژارد كـە بایـەخ بـە سـتراتیژی سـەربازی بـداتو ئـەم بایەخپێدانـەی بـووە تـەوەری كاركردنی بـۆ دەرچـوون لـە زانكـۆ. پرۆفیسـۆر برنكلی دەڵێـت: "كۆنـدی كاتێـك لـە نۆتـەردام بـوو، بایـەخێكی زۆری بەسوپای سـۆڤیەتو ئـەو كێشـانەی هاوشـانی سـنووردانان بـۆ پرچەككردن بـوونو پەیوەندییـەكانی نێـوان سـۆڤیەتو ئەمـەریكای دەداو لـە تێـزی ماستەرەكەشیدا زیاتر پێداگری لەسەر سوپای سۆڤیەت دەكردەوە"

خوێندن سەبارەت بەم بابەتە، لـەو سـالەی خوێنـدن كـە كۆنـدی لەنۆتـەردام بەسـەریبرد، گەیشتە لوتكە. كۆنـدی لـەم كارەیـدا لەگـەڵ برنكلی بـەردەوامبوو تـا گەیاندییە ئەو ئاستەی تێزی دكتۆرا لە دێنیڤەر پێشكەش بكات. برنكلی دەڵێت: "پاش ڕۆیشـتنی بـۆ زانكـۆی دێنیڤـەر، پەیوەنـدیمان هـەر بـەردەوامبوو و لـەپێناو دەستپێكردنی پرۆگرامـی ئـەو لێكۆڵینەوەیـەی پەیوەنـدی بـەو تێـزی دكتۆرایـەوە هەبوو كە ئامادەی دەكرد، لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە قسەمان دەكرد"

برنكلی باسی لـەوە كـردووە كـە كۆنـدی زۆر لـە هـەردوو كارەكـەی واتـە كـاری زانكـۆییو سیاسـی، سـەرقاڵبووەو سـەرنجی ئـەوەی داوە كـە هاوكـات لەگـەڵ

دەستپێكى لێكۆڵینەوەكانى لە زانكۆى نۆتەردامەوە، بووەتە خاوەنى پەرەپێدانێكى لۆژیكىو ئەو لێكۆڵینەوەیەى لەمیانەى ئامادەكردنى تێزى ماستەرەكەى ئەنجامیدا، گەیاندییە تێزى دكتۆرا، دواتر بووە پرۆفیسۆرى زانكۆ، بەدواى ئەودا لە پێنتاگۆن دەستیكرد بەكاركردنو دواتریش چەند پۆستێكى لە ئەنجوومەنى ئاسایشى نەتەوەییدا گرتەدەست. لە دێنیڤەرەوە ئارەزووى بەلاى خوێندنى كاروبارى سۆڤیەتدا دەستیپێكرد، دواتر ئەو ئارەزووەى بۆ یەكەمین جار لە نۆتەردام چربووەوە.

ماوەى نێوان پایزى ساڵى ١٩٧٤و بەهارى ١٩٧٥، بۆ كۆندى كاتێكى پڕ لەتەحەدداو كارێكى بەرهەمداربوو، بەڵام كارێكى تەواو سەرقاڵكەرنەبوو. كۆندى لە ساوز بۆند تێكەڵاوى چەندین هاوڕێى نوێ دەبێت، توانیشى چەندین شەوەئاهەنگى درێژخایەن لە كاتێكەوە بۆ كاتێكى تر لە دەرەوەى ماڵەوە بەسەرببات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەى كە ئەم كچە لەو جۆرە خوێندكارانەبوو كە دەسكەوتێكى زۆر لەماوەیەكى كەمدا بەدەستدەهێنن، بەڵام كەسانى تر چەند هەفتەیەكیان پێویستە تا ئەو دەسكەوتانە بەدەستبهێنن. ئەم شەوەئاهەنگانەى نەدەبوونە هەڕەشەیەك بۆ كارەكانى رۆژى دواترى لەبەرئەوەى بە دەگمەن نەبێت ناچارنەدەبوو ئامادەى كلاسە بەیانییەكان ببێت. كۆندى بۆ یەكەمینجار لەدایكوباوكى دوركەوتەوەو كاتێكى بەتاڵى زیاتر لەبەردەمدا دروستبوو و ئازادییەكى زیاترى لەسەردەمى دێنیڤەر، بۆ مایەوە. هەر لەم ماوەیەدا موزیكى دیسكۆ بڵاودەبێتەوەو لە ساڵى ١٩٧٤دا دەچێتەناو بوارى سەماكردنو لەشارە زانكۆئامێزەكاندا چەندین گۆرانى لەوانە گۆرانییەكانى هاسڵ گت دوان تونایت بەبەردەوامى دەووترێتەوەو دەنگە نوێكانى وەك تیمى ئاباو ئەڵتون جۆن، ناوبانگ پەیدادەكەن. كۆندى لەسەر ئاوازەكانى برامزو مۆزارت پەروەردە بووە بەڵام وەك هەر كچێكى ترى تەمەن ٢١ ساڵ، ئارەزوومەندى لە موزیكى پۆپ بووە. دیبۆرا كارسۆن كە كچەهاوڕێیەكى دێرینى كۆندییە دەڵێت: "چەندین جار ئامادەى ئەم ئاهەنگانە بووە، كۆندى واڕاهاتبوو لەگەڵ هاوڕێكانیدا تا سەعات پێنجى بەرەبەیانى رۆژى دواتر، شەوەئاهەنگى بەسەرببەرێت"

لەکاتێکدا لە نۆتەردام دەخوێنێت، کۆندی زۆر شێلگیرانە بیر لەوە دەکاتەوە کە پاش بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر، پەیوەندی بکات بە کۆلێژی مافەوە. ئەو کاتە کۆنی رایس کە خزمی کۆندی بوو، زۆر گرنگی بەم پیشەیە دەدا، هەربۆیە پرۆگرامی خوێندنی زانکۆیی لە زانکۆی هارڤارد دەستپێدەکات. پاش چەند ساڵێکی کەم کۆنی پەیوەندی دەکات بە کۆلێژی ماف زانکۆی نیۆرکەوە. کۆندیش چەند داواکارییەکی پەیوەندیکردن بەچەند پەیمانگایەکی ماف پێشکەشدەکاتو هەموویان پەسەنددەکرێن، یەکێك لەو پەیمانگایانەش پەیمانگای یاسای زانکۆی دێنیڤەر بوو. کۆندی ئەم پلانانەی لەگەڵ مامۆستا کۆنەکەی واتە جۆزێف کۆربێل تاووتوێدەکات، ئەویش لەلایەن خۆیەوە قایلی دەکات کەوازیان لێبهێنێت. کۆربێل پێیدەڵێت: "تۆ زۆر بەهرەمەندیو دەبێت ببیتە مامۆستای زانکۆ". پێش ئەم گفتوگۆیە کۆندی بیرۆکەی ژیان لە جیهانی زانکۆکانی بەخەیاڵدا نەهاتبوو و لەمبارەیەوە دەڵێت: "کاتێك بیر لەو ساتە دەکەمەوە، نازانم، *ئەوە* پەیامێك بوو لە غەیبەوە یان نا، بەڵام زۆر رێزم بۆ کۆربێل هەبوو و پەیامەکەم هێندە بەدڵ بوو کە بۆ یەکەمینجار ئەو بیرۆکەیەم بەشێلگیرانە وەرگرت".

کۆندی بیرۆکەی پەیوەندیکردن بە کۆلێژی ماف لە مێشکی خۆی کردە دەرەوەو ساڵی دواتری بە خوێندنی ماددەکانی پەیمانگای خوێندنی نێودەولەتیی سەربە زانکۆی دێنیڤەر بەسەربرد بەو هیوایەی بزانێت بەدیاریکراوی دەیەوێت چی بکات. پێشتر دایکوباوکی بایەخدان بە پرسە جیهانییەکانیان لەناخیدا چاندبوو، هەربۆیە کە گەورەبوو هەستیکرد زۆر گرنگە خۆی بە پرسە گەورەکانەوە سەرقاڵبکات، ئەمەش لەبەرئەوە نا کە رەشپێستە، بەڵکو لەبەرئەوەی هاوڵاتییەکی ئەمەریکی رۆشنبیرو بایەخپێدەری پرسە جیهانییەکانە. کۆندی دەڵێت: "بیرکردنەوە لەکرانەوە بەرووی هەموو جیهاندا یەکێکە لە گرنگترین شتەکانی ژیانم. هەستمکرد زۆر پێویستە کە زانیاریم سەبارەت بەو پرسانە هەبێت کە دوور دەردەکەون لێمانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر گرنگن لەژیانماندا"

ئەو وانانەی، كۆندی ئەو ساله خوێندنی، وایانلێكرد لەوە تێبگات كە چەندە چێژ لە شیكردنەوەی پرسە گەورەكان دەبینێتو بە بیركردنەوە گەیشتە ئەو بڕوایەی كە چۆن ئەم شیكردنەوەیە دەتوانێت بخرێتە قۆناغی جێبەجێكردنەوە لەپێناو گۆڕانكاری راستەقینە لەجیهاندا. كۆندی بە شێوازە خاكییەكەی خۆی ئەوە رووندەكاتەوە كە چۆن ئەو ساڵەی لە گەڕانو خوێندندا بەسەریبرد، پەلكێشیكردە ناو پەیمانگای خوێندنی نێودەولەتی لە دێنیڤەر، دەلێت: "دركم بەوە كرد كە زانستە سیاسییەكانم لە ماف زیاتر حەز لێیە هەربۆیە بەبێ دوودلی پەیوەندیمكرد بە پرۆگرامی دكتۆراوە". دكتۆر كۆربێل هانیدا كە بڕیاری بەردەوامبوون لە هەوڵدانی بۆ دەرچوون لە زانستە سیاسییەكان بدات، هەربۆیە پەیوەندیكرد بەپرۆگرامەكەیەوە. كۆندی روونیدەكاتەوە: "هەڵوێستی كۆربێل پێداگرییانەو پشتگیریكارانە بوو و هانیدەدام كە لەم بوارەدا بەردەوام بم".

لە ٨ی ئابی ١٩٧٥ كۆندی بڕوانامەی ماستەری لە كارگێڕی حكومیی زانكۆی نۆتەردام وەرگرت، پاشان گەڕایەوە دێنیڤەر. پاش چەند ساڵێك جارێكی تر گەڕایەوە بۆ نۆتەردام، بەلام ئەمجارەیان وەك یەكێك لە سەرۆكەكانی زانكۆ، واتە وەك ئەندامێكی ئەنجوومەنی ئەمینداران.

كۆندی گەڕایەوە دێنیڤەرو چووەوە ماڵی دایكوباوكی تا چێژی چالاكییە كۆنەكانی بۆ بگەڕێتەوە، لەوانە گۆرانی وتن لەچوارچێوەی گرووپی كلێسەی مەشیەخەی مۆنتڤیۆ، پیانۆژەنین، وتنەوەی وانەی موزیكژەنین، ئەمەشیان بە ئامانجی پاراستنی ئەو تەكنیكە كۆنانەی ژەنین كە كۆندی هەیبوون، هەروەها سەیركردنی یاری فوتبۆڵ بەپێی توانا. واڕاهاتبوو لەكۆتایی هەفتەدا هەندێك لە هاوڕێكانی بانگهێشت دەكرد بۆ ماڵەوە تا پێكەوە یاری تۆپی پێ ببینن، ئەوەندەی پێنەچوو هاوڕێكانی دركیان بەوە كرد كە كۆندی زۆر لەوە زیاترە كە تەنها هاندەرێكی ئاسایی ئەم یارییە بێت. رۆبی لایتۆس كە خوێندكارێكی پەیمانگای خوێندنی نێودەولەتی بوو و لەبۆنەی پەیوەندیدار بە تۆپی پێوە، كۆندی بینیوە، دەلێت: " ئەو یەكێكە لەو كەسە كەمانەی كە من بینیومنو ئەوەندەی من زانیارییان سەبارەت بەوەرزش هەیە" لایتۆس كە ئێستا

کۆمپانیایەکی تایبەت بە راوێژی نێودەولەتی بەڕێوەدەبات کە بارەگاکەی لە دێنیڤەرە، خۆی بە ئالودەبویەکی فوتبۆڵ ناودەبات و بەشێوازێکی "زۆر زۆر شێلگیرانە" دەڕوانێتە ئەم وەرزشە. روبی دەلێت کاتێك لە سالی یەکەمی خوێندنیدا بووە لەو پەیمانگایە، جارێکیان لەگەڵ چەند دەرچوویەکدا بانگهێشتکراوە بۆ ساباتێك لە شاخەکانی دەرەوەی دێنیڤەر. مەبەست لەوە کە لە نێوارەیەکی رۆژی شەممەدا بووە، بەسەربردنی رۆژێك بووە لە "خواردن، موزیك و هاوڕێیەتی دۆستانەدا".

لایتۆس بەردەوامدەبێت و دەلێت: "ئەو رۆژە یارییەکی زۆر خۆشی فوتبۆڵ ئەنجام درا، پێموایە لەنێوان زانکۆی ئۆکلاهۆماو زانکۆی ئۆهایۆدا بوو. کاتێك من گەیشتمە شوێنەکە، یارییەکە تەواوببوو. کاتێکیش کۆندی گەیشت، من و کەسێکی تر گفتوگۆمان لەسەر یارییەکە دەکرد، کۆندیش هاتەناو گفتوگۆکەوە. ئەوە یەکەمین جاربوو کە کۆندی ببینم. یەکسەر بۆم دەرکەوت کە شارەزایی باشی سەبارەت بە فوتبۆڵ هەیەو خۆشی وا نیشانناداتە کە لەو یارییە تێدەگات. لەو رۆژەوە پەیوەندییەکی فوتبۆلی لەنێوان ئێمەدا دروستبوو کە دوو سالی خایاند. گفتوگۆمان لەسەر روسیا یان پەیمانگا نەکرد، بەلکو تەنها قسەمان لەسەر فوتبۆڵ کرد" لایتۆس باس لەوەش دەکات کە بەمەبەستی بینینی فوتبۆڵ، ئێوارانی یەکشەممە دەچووە مالی خێزانی رایس و چێژی لەو شلەی بامیە بەناوبانگەش وەردەگرت کە ئەنجێلینا ئامادەیدەکرد. لایتۆس دەشلێت: "بەو شێوەیە هەمووومان پێکەوە نێوارەیەکی خۆشی تۆپی پێ و خواردنی شلەی بامیەمان بەسەردەبرد، هاوکات زۆریش بە هاندانە خۆشەکەی یاری تۆپی پێ، دلخۆش دەبووین".

ئەو پرۆگرامە دکتۆرایەی کۆندی لە زانکۆی دێنیڤەر پەیوەندی پێوەکرد، لەرووی مامۆستاو بەرنامەشەوە، تۆمارێکی ناوازەی هەبوو. پەیمانگای خوێندنی نێودەولەتیی سەربە زانکۆی دێنیڤەر بە پرۆگرامە فراوانەکەی لە پرۆگرامەکانی زانکۆکانی کەناری رۆژهەلات، جیادەکرێتەوەو دەتوانین پرۆگرامی پەیمانگای روسیی سەربە زانکۆی کۆلۆمبیا وەك نموونەیەکی ئەوە بهێنینەوە. مارك فۆن

هاگن كە سەرۆكى ئێستاى پەیمانگاكەیە دەڵێت: "ئاراستەى ئایدۆلۆجى ئەوەندەى بەرەو خوێندنى سیستەمەكان هەنگاودەنێت، ئەوەندە بەرەو كارە كۆمەڵایەتىو ئابورىو كلتورییەكان، هەنگاو نانێت". پەیمانگاكانى كەنارى رۆژهەڵات بەتێروتەسەلى بایەخ بە ژێرخانى ئابورى مۆسكۆو ستراتیژى شەڕى سارد دەدەن. پاش هەڵوەشانەوەى یەكێتیى سۆڤیەت ئەم پەیمانگایانە ناچاربوون لە رەگەوە پرۆگرامەكانیان فراوانبكەن بەشێوەیەك كە دیاردە كلتورىو ئابورىو كۆمەڵایەتییەكانى ناوچەكەش بگرێتەوە. شایانى باسە زانكۆى دێنیڤەر هەر لەسەرەتاوە ئەم بابەتانەى خستووەتە ناو پرۆگرامەكانییەوە. پرۆفیسۆر كارین فیست كە كار لە پەیمانگاى خوێندنى نێودەولەتى دەكات، دەڵێت: "ئەگەر بیر لە رابردوو بكەینەوە، دەبینین ئەمڕۆى پەیمانگاكە زۆر لە دەستپێكەكەى جیاواز نییە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەى كە پەیمانگاكەمان بەپێچەوانەى پەیمانگاكانى ترى كەنارى خۆرهەڵاتەوە، بە سیاسەتەكانى جەنگى ساردەوە نەنووساوە. رومالْكردنى فراوان بەنیسبەت ئێمەوە پرسێكى رۆتینى باوەو ئێمە هەر لە زووەوە گرنگیمان بە پەرەسەندنى كۆمەڵایەتىو دادپەروەریى مرۆیىو ئەو دابەشبوونەى نێوان رۆژهەڵاتو رۆژئاوا، داوە. ئەو گۆڕانكارییانەى پاش كۆتایى جەنگى سارد لە پرۆگرامەكەماندا ئەنجامدران، بە بەراورد لەگەڵ پەیمانگا هاوشێوەكانماندا، زۆر كەمبوون.

ئەم پرۆگرامەى كە چەند دیاردەیەكى ئەزموونى سۆڤیەت/روسیا باسدەكات، توانى سەرنجى كۆندى بەلاى خۆیدا رابكێشێت، هەربۆیە لە ساڵى ١٩٧٦دا پەیوەندى پێوە دەكات. جۆزیف كۆربێل بەشێوەیەكى گشتى پێشوازى لە هاتنەناوەوەى ژنان بۆ بەشەكەى نەدەكرد، كاتێكیش پەیمانگاى خوێندنى نێودەولەتى دامەزراند، بەرهەڵستى هاتنەناوەوەى خوێندكارو مامۆستاى مێینەى دەكرد، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە گومانى لە تواناى كچەخوێندكارەكان هەبوو لە بەدەستهێنانى ئەو پۆستە بالایانەى دەبنەهۆى بەرزكردنەوەى پلەوپایەى بەشەكە. لەسەرەتاى حەفتاكاندا كاتێك كارین فیست، كە ژنێك بوو، پەیوەندیكرد بە دەستەى مامۆستاكانى پەیمانگاكەوە، كۆربێل لە دژى

دامەزرانـدنی دەنگـی دا بـەڵام زۆربـەی دەنگـەکان لـە بەرژەوەنـدی فیسـتبوون هەربۆیە وەك پرۆفیسۆری سیاسەتی نێودەوڵەتیو شێوازی لێکۆڵینـەوە، دامـەزرا. بەدرێژایی چەندین ساڵ کارین تەنها ژن بوو لەناو دەسـتەی مامۆستایاندا، بـەڵام بەتێپەڕبوونی کات، دیدوبۆچوونی کۆربێڵ گۆڕانی بەسـەردا هات. بەرهەڵستییە سـەرەتاییەکانی ئـەم پیـاوە تـا رادەیـەك شـتێکی سـەیر بـوو، چونکە بەتونـدی پشـتگیری ڕێـڕەوی ئـەکادیمی کچـەکەی دەکـرد، لـە زانسـتە سیاسـییەکاندا. لـە شەستەکانی سەدەی رابردوودا مادڵین ئۆڵبرایت لە خوێندن بەردەوامبوو تا توانی بڕوانامەی ماستەرو دکتـۆرا لـە بەشـی یاسـای گشـتیو کارگێڕی حکومیی سـەربە زانکۆی کۆڵۆمبیا بەدەستبهێنێت. مـادڵین توانیشـی پرۆگرامـی زانکـۆ لـە پـەیمانگا روسـییەکە، تـەواو بکـات. لـە سـاڵی ١٩٧٥ پـاش گەڕانـەوەی لـە زانکـۆی نۆتـەردام، کۆندی پەیوەندیکرد بە کلاسـەکانی خوێنـدنی نێودەوڵـەتی لـە زانکـۆی دێنیڤـەر، ئەوکاتە مادڵین سەرقاڵی بەڕێوەبردنی هەڵمـەتی سـیناتۆر ئیدمۆنـد مۆسـکی بـوو لەپێناو کۆکردنەوەی پیتەکدا.

کارین فیست کە یەکێکە لە پرۆفیسـۆرو ڕێبـەرە ئەکادیمییـەکانی کۆنـدی، لـە مـاوەی دوو سـاڵی پاش دامەزراندنیـدا، پەیوەندییـەکی بـەتینی لەگـەڵ کۆربێڵـدا بنیاتناو سەرنجیدا کە گۆڕانکارییەکی ریشـەیی لـە تێڕوانینی بەرامبـەر بـە ژنـانو رۆڵیان لە پرۆگرامە فێرکارییەکەیدا، رووی داوە. کـارین لەمبارەیـەوە دەڵێـت: "زۆر لەیەکـەوە نزیـك بـووین. ئـەو بەتەمـەنترین پرۆفیسـۆربوو، منـیش بچوکترینیان بووم لەرووی تەمەنەوە. دیاربوو ئـەو بەسـتایلەکەی نوێنەرایەتی جیهانی کـۆنی دەکـرد بـەڵام مـن نوێنەرایـەتی تازەگـەریم دەکـرد، بـەڵام کاروبارەکـان بـەدڵی هـەردووکمان بەڕێوەدەچـوون". کاتێـك کۆنـدی گەیشـتە زانکـۆی دێنیڤـەر دیـدی کۆربێـڵ زۆر گۆڕابـوو و ئاڕاسـتەی بایەخپێدانـەکانی کردبـووە رووی راکێشـانی لێهاتووترینو باشـترین خوێنـدکار بـۆ بەشـەکەیو فیسـت سـەرنجیدا کـە "چیتر گرنگی بە جیاوازی جێندەری نەدەدا"

کـارین فیسـت پـێش پەیوەنـدیکردنی بــە دەسـتەی فێرکـاری زانکـۆی دێنیڤەرەوە، بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکـۆی مینۆسـۆتا بەدەسـتهێنابوو. سـەرباری

فێرکـــردنیش وەك راوێـــژکاری سیاســـیی چـــەند رێکخراوێـــك کـــە لەجیهانـــدا بڵاوبوونەتـــەوە، لەوانـــە رێکخـــراوی میسـری بـۆ پلانـدانانی نەتـەوەیی‌و زانکـۆی کوێت، کاریکردووە. جۆناسـان ئـەدیڵمان کـە ئـەمیش یـەکێکبوو لـە مامۆسـتاکانی، بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستە سیاسـییەکان لـە زانکـۆی کۆلۆمبیـا بەدەسـتهێناوە. ئـەدیڵمان لـەو کاتـەوەی کـە پەیوەنـدیکرد بـە دەسـتەی فێرکـاری پـەیمانگای نێودەوڵەتییـەوە، بـە بـەردەوامی وەك لێکۆڵـەرێکی میـوان لـە هـەردوو زانکـۆی پـەکین‌و مۆسـکۆ، مایـەوەو چـەندین گەشـتی لـە بەرژەوەنـدی وەزارەتـی دەرەوە ئەنجامـــداوە. ئـــەدیڵمان وەك ئەنـــدامێکی دیـــاری دەســـتەی کاروبـــاری گشـــتی ئەمەریکی-ئیسرائیلی، ئـەژماردەکرێت، هـەروەها ئەنـدامی ئـەو وەفـدە بـووە کـە یەکێتی جولەکە، بۆ سەردانی ئیسرائیل لە ساڵی ۲۰۰۲دا دروستی کردووە.

کۆنـدی لەگـەڵ کاسـرین کیلیهـەر پێکـەوە لـە پـەیمانگای لێکۆڵینـەوەی نێودەوڵەتی، وانەیان خوێندووە کە دواتر بووە یەکێك لـە دیـارترین پسـپۆڕەکانی جیهـان لـە پرسـە ئەمنییەکانـداو کارەکـانی هـەردوو بـواری زانکـۆیی‌و حکـومی لـەخۆگرتبوو. کیلیهـەر وەك جێگـری یاریـدەدەری وەزیـری دەرەوە بـۆ کاروبـاری روسـیاو ئۆکرانیـاو ئۆراسـیا، کـاریکردووە، دواتـر پۆسـتی راوێـژکاری لـە وەزارەتـی بـەرگری‌و نوێنـەری تایبـەتی وەزیـری بـەرگری لـە رێکخـراوی پـەیمانی بـاکوری ئەتلەسی Nato گرتووەتەدەست. کیلیهەر پۆستی بەڕێوەبەری پەیمانگای ئەسپن لـە بـەرلین-ی گرتووەتـە دەسـت، کـە نووسـینگەی ئـەڵمانیای رێکخراوەکەیـە، چەندین زنجیرە وانەی خوێندنی سیاسی بۆ سەرکردە ئەمەریکی‌و ئەوروپییـەکان دەکاتەوە. لە بەهاری ساڵی ۲۰۰۲دا کیلیهەر خاچی زێـڕینی (شـەرەفی بۆندسـوێری) بەدەسـتهێناوە کـە بـاڵاترین مـەدالیای سـەربازییە لـە ئـەڵمانیا ئـەویش بـەهۆی "بەشدارییە بەرچاوەکانی لە پەیوەندییە ئەتلەسـییەکاندا، بەتایبـەت رۆڵـی لـە هانـدانی دیـالۆگی سیاسـی لـەنێوان سیاسـەتدارێژەرانی ئـەوروپی‌و ئەمەریکیـدا" بـوو. کیلیهـەر ئێسـتا لـە کۆلێـژی جـەنگی دەریـایی لـە نیۆپـۆرت لـە رۆدئایلەنـد، پرۆفیسۆرە.

سالەکانی حەفتاو هەشتاکان بە ماوەیەکی کاریگەر لە خوێندنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانو یەکێتیی سۆڤیەت، دادەنرێت. یەکێك لە ڕووداوە دیارە سەرەکییەکانی ماوەی جەنگی سارد کە هاوکات بوو لەگەڵ ئەو ساڵانەی کۆندی لە زانکۆکەدا بەسەریبردن، دەرکەوتنی پەیماننامەیەکی سنووردارکردنی پرچەککردن بوو بۆ چەکدانان بوو لەساڵی ١٩٧٢دا کە بە ساڵت یەك ناسراوەو ویلایەتە یەکگرتووەکانو یەکێتیی سۆڤیەت لەو ساڵەدا ئیمزایان کردووە. ئەو کاتەی کۆندی دەستیکرد بەخوێندنی زانکۆ، ئەم دیالۆگانە گەیشتنە بنبەستو داخراوو هندستانیش توانی چەکە ناوکییەکان پەرەپێبدات. لە ساڵی ١٩٧٥دا ویلایەتە یەکگرتووەکانو یەکێتیی سۆڤیەت لەگەڵ ٣٩ وڵاتی تر، کۆنگرەیەکیان سەبارەت بە کاروباری ئاسایشو هاوکاری لە ئەوروپا، بەستو ئەو دوو وڵاتەش ڕاگەیەندراوی کۆتایی کۆنگرەیەکەیان ئیمزاکرد کە بە ڕێککەوتننامەکانی هێلسنکی، ناسراوە. بەپێی ئەم ڕێککەوتننامانە، دەبێت هەموو لایەك پابەندی پاراستنی مافەکانی مرۆڤو سنوورەکانی ئەوروپابن بەپێی نەخشەی پاش کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی دووەم. ڕێککەوتننامەکان دانیشی بە دەسەڵاتی یەکێتیی سۆڤیەت بەسەر وڵاتانی بەلتیق ئیستۆنیا، لاتڤیا، لیتوانیادا ناوە.

لەکاتێکدا کۆندی سەرقاڵی پەرەپێدانی تواناکانی بوو لەسەر خوێندنەوەی بابەت بە زمانی ڕوسی کە لەوەشدا پشتی بە ڕۆژنامەی براڤدا دەبەست، دەبوو بەدواداچوون بۆ بابەتێکی تر بکات. ئەم ڕووداوەش پرۆتۆکۆلێکبوو سەبارەت بە فرۆشتنی گەنمی ئەمەریکی بە یەکێتیی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٧٥دا. ئەو برسێتییەی بەسەر یەکێتیی سۆڤیەتدا هات، حکومەتی ئەو وڵاتەی ناچارکرد ڕێککەوتننامەیەکی درێژخایەن بۆ دەسکەوتنی گەنمی ئەمەریکی، ئیمزا بکات. ئەو ساڵە یەکێتیی سۆڤیەتو ویلایەتە یەکگرتووەکان پاڵنەرێکی ئاسانتریان هەبوو بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانیان باشتر بکەن ئەویش پێکەوەگرێدانی کەشتی ئاسمانی ئەمەریکی ئەپۆلۆ بوو لەگەڵ کەشتی ئاسمانی سۆڤیەتی سۆیۆز لە ئاسمانی دەرەوەداو بەڕێوەبەرانی ناسا کەوتنەکارکردن لەسەر ئاراستەکردنی ئەرکی ئەپۆلۆ بەرەو پرۆگرامی هاوکاری ئەمەریکی ـ سۆڤیەتی، ئەمەش پاش

تێپەڕبوونی شەش ساڵ هات بەسەر دابەزینی چەند ئاسمانەوانێکی ئەمەریکی لەسەر رووی مانگ، لە رێگەی ئەپۆلۆوە. وتارێکی ئاژانسی ئاسمانی ئەمەریکی سەبارەت بە پێکەوەگرێدانی هەردوو کەشتیی ئەپۆلوو سۆیۆز، نووسیویەتی: "پرۆگرامەکانی ئاژانسی ئاسمانی ئەمەریکی رەنگدانەوەی رەوشە باوەکەی پرسە دەرەکییەکان بوون، ئەمەش هاوشان لەگەڵ چەند دیاردەیەکی سیاسەتی نەتەوەیی ئەمەریکیدا، هەنگاوی دەنا. دەتوانرێت وەك بەشێك لە سیاسەتی تەبایی، سەیری ئەم گەشتە هاوبەشە بکرێت، بەڵام کارمەندانی ئاژانسی ئاسمانیی ئەمەریکی شتی دوورتریان تێدا دەبینی".

پرۆژەی ئەزموونیی ئەپۆلۆ-سۆیۆز بووە رێخۆشکەرێك بۆ دروستبوونی هاوکاری ئاسمانی نێودەولەتیو بۆ پەرەپێدانی قۆناغی داهاتووی تەکنیکەکانی بۆشایی ئاسمان، شتێکی پێویست بوو. وێستگە تەلەفزیۆنییەکان ئەم پێکەوەگرێدانەیان رومالٚ کرد کە لە بۆشایی ئاسماندا ئەنجامدراو بووە هۆی ئەوەی وێنەی هاوکاریی ئەمەریکی-روسی بکەوێتە بەرچاوی خەڵك، ئەو هاوکارییەی کە لە بواری پێشبڕکێی پرچەکبووندا، بوونی نەبوو. لێدوانەکانی ئاسمانەوانەکان لەوبارەیەوە شتێکی جیاواز بوو لەو هەواڵە سیاسییانەی بایەخیان بە گرژییەکانی نێوان ئەو دوو زلهێزە دەداو پێشوازی گەرمیان لێکرا. ئاسمانەوان ڤالیری کۆباتسۆڤ لە لێدوانێکی تەلەفزیۆنیدا رایگەیاند: "بینەرە ئەمەریکییە خۆشەویستەکانی تەلەفزیۆن.... هەلەیەکی زۆر گەورەیە ئەگەر پرسیار بکەین چ وڵاتێك لەوی تر جوانترە. پێموایە راستییەکەی ئەوەیە کە بڵێین هیچ شتێك بە جوانی هەسارە شینەکەمان، بەراورد ناکرێت"

لە ساڵی ١٩٧٦دا واتە لەهەمان ئەو ساڵەی پرۆگرامی خوێندنی تایبەت بە بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا، دەستپێکرد، کۆندی ناوی خۆی وەك ئەندامێکی حیزبی دیموکراتەکان تۆمارکرد. لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەدا کۆندی دەنگی لە بەرژەوەندی جیمی کارتەر دا، بەڵام لە کۆتاییەکانی دیسەمبەری ساڵی ١٩٧٩دا، بەهۆی شێوازی مامەڵەی کارتەر لەگەڵ پرسی پەلاماردانی ئەفغانستان لەلایەن سۆڤیەتەوە، بیروبۆچوونی بەرامبەر بە خودی

کارتەرو حیزبی دیموکرات گۆڕا. سەرۆك ئەو پەلاماردانەی بەمشێوەیە وەسفکرد: "هەوڵێکی بەئەنقەستە کە حکومەتێکی بەهێزی بێباوەڕ بە ئامانجی ملکەچکردنی گەلێکی موسڵمانی سەربەخۆ، ئەنجامی داوە". کۆندی هۆشداری دەداتو دەڵێت: "ئەفغانستانی داگیرکراو لەلایەن سۆڤیەتەوە هەڕەشەیەك لەسەر ئێرانو پاکستان دروستدەکات". کارتەر دەشڵێت هێرشەکە توشی شۆكو خەفەتی کردووەو "ئەوەندەی لە ماوەی هەفتەی رابردوودا دیدوبۆچوونی سەبارەت بە سۆڤیەت گۆڕاوە، لە ماوەی دوو ساڵو نیوی پێش ئەو هەفتەیەدا، نەگۆڕاوە". لەمیانەی کاردانەوەیدا بەرامبەر بەو پەلامارە، کارتەر هەناردەکردنی گەنمو کەرەستەی تەکنیکی بۆ یەکێتیی سۆڤیەت قەدەغەکردو سەبارەت بە راوکردنی روسەکان لە ناوەکانی ناوچەی ئەمەریکیدا، گۆڕانکاری ئەنجامدا. سەرباری ئەوەش کارتەر پرسی دانووستان لەسەر رێککەوتننامەی (ساڵت دوو)و پەسەندکردنی دواخست کە ئەو ساڵە لەگەڵ بریجینیڤ کاری لەسەر کردبوو، داواشی کرد بایکۆتی خولی یارییە ئۆلۆمپییە هاوینەکانی ساڵی ١٩٨٠ی مۆسکۆ بکرێت. کۆندی پێیوابوو ئەو شۆكو سوپرایزەی کە کارتەر پیشانیدان، بەڵگەی ساویلکەییو هەڵسوکەوتەکانی زۆر لاواز بوونو دەڵێت: "لەیادمە کە بیرم لەوە دەکردەوەو دەموت: تۆ پێت وایە رووبەڕووی کێ دەبیتەوە؟ ئەمە حکومەتێکی مەترسیدارە. بێگومان ئەوان پەلاماری وڵاتێکی بیانییان داوە! پێموابوو کاتی ئەوە هاتووە کە سیاسەتێکی توندتر بەرامبەر بەم رژێمە داپلۆسێنەرە، بگرینەبەر"

رەنگە ئەو مامەڵەیەی کارتەر لەگەڵ سۆڤیەت سەبارەت بەم قەیرانە نەبووایە، کۆندی لەگەڵ دیموکراتەکاندا بمایەتەوە. لە ساڵی ٢٠٠٢دا کۆندی رایگەیاند: "بەشێوەیەکی فەرمی لە ریزەکانی حیزبی دیموکراتدا بووم، ئەگەر ئەوە نەبووایە کە پێموابوو مامەڵەکردنمان لەگەڵ شەڕی سارددا هەڵەیە، ئەو حیزبەم جێنەدەهێشت. بیرم لەوە دەکردەوە کە سۆڤیەتییەکان شەڕەنگێزنو وەك ژەنینی کەمانچە، یاری بە ئێمە دەکەن. بیرم لەوە دەکردەوە کە کارتەر لە سروشتی راستەقینەی یەکێتیی سۆڤیەت تێنەگەیشتبوو کە سروشتێکی زۆر رەش بوو"

كۆنـدى لـە ڕەخنـەگرتن لـە سياسـەتى ئەمـەريكا بەرامبـەر بـە يـەكێتيى سۆڤيەت، پەرۆشييەكى گەورەى نيشاندا كە گەيشتە ئاستێك تێيدا توانى بەسـەر ئەو پێـزانينو ڕێزلێگرتنـەى بـۆ حيزبـى ديموكراتـەكان هـەيبوو بـەهۆى پشتگيرى ئـەو حيزبـە بـۆ مافـە مەدەنييـەكان، زاڵببێـت. لەميانـەى هەڵمـەتى هەڵبژاردنـە سـەرۆكايەتييەكەى سـاڵى ١٩٨٠دا، خـۆى وەك لايـەنگرێكى حيزبـى كۆمـارى تۆمـاركردو لەبەرژەوەنـدى ڕۆناڵد ريگـان، دەنگـى دا. كۆنـدى دەڵێت: "ماوەيـەكى دوورودرێژ ئەو كارانەى ليندۆن جۆنسۆنم بەدڵبوو كە لە ساڵى ١٩٦٤ لـەپێناو مافـە مەدەنييەكاندا، ئەنجاميدان، بەڵام لە ساڵى ١٩٨٠دا بيرم لەوە كردەوە كە ويلايەتە يـەكگرتووەكان سياسـەتێكى دەرەكـى چـالاك پـەيرەوناكات، هـەروەها زۆر بەپەرۆشەوە ريگان سەرسامبووم. دواتـريش بـيروڕا سياسـييەكانم لەبەرژەوەنـدى حكومەتێكى بچووكتر، پەرەسەنديان بەخۆوەبينى".

پشـتگيرييە سـەرەتاييەكانى كۆنـدى لـە ديموكراتـەكان تائێسـتاش بـە بـيروڕا كۆمەڵايەتييە ميانڕەوەكانييەوە ديارە لەوانە هەڵوێسـتى پشـتگيريكردنى لـە مـافى لەباربردن. كۆندى خۆى بەمشێوەيە وەسفدەكات: "كۆمارى" بەشێوەيەكى گشـتى بەڵام "زۆر كۆنەپارێز" لە كاروبارى دەرەوەداو "زياد لە حـەد كۆنـەپارێز" لەچـەند بوارێكى ترداو لە هەندێك پرسى تردا "زۆرجـار پشـتگيريكارێكى سەرسـوڕهێن"ەو لەهەندێك پرسى تريشدا "ميانڕەو" ە.

زۆرێك لەو ئەمەريكيانەى بۆ يەكەمينجار كۆنديان لە ڕێگەى ئـەو وتـارەوە ناسـيوە كـە لـە سـاڵى ٢٠٠٠دا لـە كۆنفرانسـى نيشـتمانى حيزبـى كۆمـارى پێشكەشـيكرد، پێيانوايـە هۆكـارى بـوون بـە كۆمـارى بـۆ بـاوكى دەگەڕێتـەوە كـە ديموكراتـەكان لـەو سـەردەمى جياكـارى ڕەگەزييـەى لـە ئـەلابامادا بـاوبوو، پشـتگوێيان خسـتو كرديانـە دەرەوە، بـەڵام كۆنـدى هۆكـارى تايبـەتى هەيـە كـە پاڵنەرى بووە بۆ ئەوەى بچێتە ناو كۆمارييەكانەوەو دەڵێت: "دەستورو سياسەتى دەرەوە منيان ڕاكێشايە نـاو حيزبـى كۆمارييـەوە نـەك پرسـە كۆمەڵايەتييـەكان" بەهۆى ئەوەى بووە كۆمـارى، كۆنـدى لەلايـەن هـاوڕێ ڕەشپێسـتەكانييەوە توشـى سـەرزەنشـت بـووە، بـەڵام لەبەرامبـەردا ئـەم خانمـە زۆر پێـداگرى لەسـەر

هەڵوێستەکانی کردووە. کۆندی دەشڵێت: "لەبەر چەند هۆیەکی بەنرخ پەیوەندیمکردووە بە ئۆڵد پارتی-یەوە. لەپرسە پەیوەندیدارەکانی سیاسەتی دەرەوەدا زیاتر حەزم لە هەڵوێستی حیزبەکەمانەو خودی خۆشم حکومەتێکی بچووکترم پێ باشە. پێشم وانییە واشنتۆن چارەسەری بۆ هەموو شتێك هەبێت"

لە ساڵی کۆتایی ئەو پرۆگرامە دکتۆرایەی کاری لەسەر دەکرد، کرێکارێکی بواری حەوزی کەشتی پۆلەندی بەناوی لیش ڤالیسا وەك سەرۆکی سەندیکای کرێکارانی حەوزی کەشتی ناکۆمۆنیستی کە پێی دەووترێت هاریکاری، هەڵبژێردرا. ڤالیسا ماوەی چەندین ساڵ لە رێگەی چەندین مانگرتنی نایاساییەوە، خەباتی کردووە تا دواجار توانی مافەکانی کرێکارانی پۆلەندی بەدەستبهێنێتو سەرنجی نێودەولەتی بەلای ئەو تێکۆشانەدا رابکێشێت، کە پۆلەندییەکان لە دژی حوکمی کۆمۆنیستەکان، ئەنجامیان دەدا، تەنانەت نزیکترین چاودێرانیش هەرگیز ئەوەیان بەخەیاڵدا نەدەهات یان پێشبینیان نەدەکرد کە ئەم روداوانە ئاماژەی سەرەتای کۆتایی کۆمۆنیزمە لە ئەوروپای رۆژهەلاتو یەکێتیی سۆڤیەتدا.

ئەم روداوانەو دەرهاویشتەکانی پەرۆشییەکی زیاتریان دا بە کۆندی لەرووی بەردەوامبوون لەسەر خوێندنی تایبەت بە سۆڤیەتەوە. ئەم بوارەی کۆندی چوبووە ناوی لەو بابەتانەی تر جیاواز بوو کە لەمیانەی سالەکانی خوێندنی زانکۆییدا خوێندبووی لەبەرئەوەی ئەم بوارە بایەخێکی هێندە بەهێزو واقیعی هەبوو بەشێوەیەك کە کاریگەری لەسەر شێوازی هەڵسوکەوتی وڵاتانو ژیانی خەڵكو روداوە مێژووییەکان هەیە.

کۆندی لەناو خوێندکارانی پەیمانگای خوێندنی نێودەولەتی بەوە جیادەکرایەوە کە خاوەنی هەموو ئەو زانیارییە پێویستانە بوو کە جۆزیف کۆربێڵ پێی وابوو بۆ خوێندنەکە پێویستن، کە ئەوانیش زیرەکیی ئەکادیمیو پاڵنەری خۆییو بوونی باکگراوندێك بوون لە زمانی روسیدا. فیست دەڵێت: "کۆربێڵ بۆیە کۆندی خۆش دەویست چونکە کەسێکی زیرەكو گورجوگۆڵ بوو و وزەیەکی زۆریشی هەبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی کە زمانی روسی دەزانێت،

هەموو ئەمانەش گرنگترین رەگەزبوون بەلای كۆربێلەوە". ئەم پیاوە پێیوایە زمانی بیانی بەشێكی گرنگی پرۆگرامەكەیە هەربۆیە واڕاهاتبوو داوای لە خوێندكارەكانی دەكرد پێش دەستبەكاربوون لە پرۆگرامەكە، كار لەسەر فێربوونی زمانی سلاڤی بكەن. فیست دەڵێت: "كۆربێل بەو خوێندكارانەی دەوت، كە دەیانویست لەبارەی ئەوروپای رۆژهەڵات یان ناوەڕاست یان یەكێتیی سۆڤیەتی پێشوو، بخوێنن باشتروایە پێش ئەوەی بێنو ئەو وانەیان پێ بڵێت، بەباشی زمانێكی بیانی بزانن. دیاربوو كۆندی پاڵێوراوێكی نموونەیی بوو بۆ ئەو خوێندنە لەبەرئەوەی باكگراوندێكی لە زمانی روسیدا هەبوو كە لەوانی تردا نەبوو. خوێندكارەكانی تر زانستی سیاسییان خوێندبوو بەڵام زمانیان نەخوێندبوو هەربۆیە كۆربێل پێی دەوتن برۆنو پاش ئەوەی خوێندنی یەكێك لە زمانەكان لەوانە چیكی یان پۆلەندی یان روسی، تەواودەكەن بگەڕێنەوە بۆخوێندن"

كۆندی تەنها بەوەوە نەوەستا كە بەردەوامی بەوانەی فێربوونی زمانی روسی بدات بەڵكو دەستیشیكرد بەخوێندنی زمانی چیكیو ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ئەو پرۆفیسۆرەی فێری زمانی روسی دەكردو ناوی لیبۆر بلۆم بوو، چیكی بوو هەربۆیە هانیدا كەوانەی فێربوونی زمانی چیكیش بخوێنێت. تۆماری ئەو شتە پیشەییانەی كۆندی دەیانزانێت ئەوە نیشاندەدەن كە بە روسییەكی خاوێنو پەتی قسەدەكاتو بەهەردوو زمانی چیكیو فەرەنسی "توانای ئەنجامدانی لێكۆڵینەوە"ی هەیە.

كۆربێل بەوە بەناوبانگ بوو كە بەرامبەر بەو كەسانەی خۆشی دەویستن، زۆر دەستو دڵكراوە بوو و بەرامبەر بەوانەش كە پەیڕەوی ئەو پێودانگانەیان نەدەكرد كە ئەم داینابوون، زۆر توندبوو. فیست دەڵێت: "پێشبینی شتی زۆری لە خەڵك دەكردو زۆر حەزی بەلای ئەوانەدا هەبوو كە بەلایەوە زۆر زیرەك بوون" دیارە رێڕەوی كۆندی لەگەڵ كۆربێلدا بەشێوەیەكی باش بەڕێوەدەچوو و هەمیشە هانیدەدا كە ئامانجی بەرز لەبابەتی خوێندنەكەیدا، بنیات بنێت. ئەو پشتگیریو پەرۆشییەی كۆربێل دابوویە كۆندی، هاوتای ئەو پشتگیریو

پەرۆشییە بوو کە دابوویە کچەکەی هەریۆیە ببووە باوکێکی نموونەیی بۆی. کۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت: "شانازیکردنو پێشبینییە پەرۆشەکانی بە مادلین لەشانازیکردنو پێشبینییەکانی سەبارەت بە من دەچوون". بەڕوونی ئەوە دیاربوو کە بڕواو متمانەی تەواوەتی کۆربێل بە بەهرەی کۆندی، لە شوێنی خۆیاندابوون.

کۆربێل زیاتر پێداگری لەسەر ئەوە دەکردەوە کە خوێندکاران فێری وەرگێڕانی سیاسەت بۆ زمانێکی روونو ئاشکرا بن، ئەمەش لە کارکردنی کۆندی لە ئیدارەکەی بوشدا بە پراکتیکی رەنگیداوەتەوە. ئان بلاکمان لە ژیاننامەی مادلین ئۆلبرایتدا دەڵێت: "جۆزێف کۆربێل ئەوەی فێری مادلین کردووە کە پێویستە سەرکردە بەشێوەیەك سیاسەتی دەرەوەی دابڕێژێت کە مرۆڤی ئاسایی تێی بگات، لەبەرئەوەی خەڵك پەرۆشییان بۆ پرسێك نییە کە لە کاریگەرییەکەی لەسەر ژیانی رۆژانەیان، تێنەگەن". کۆندی بە باشی ئەم وانەیەی وەرگرتووە هەربۆیە توانیویەتی ناوبانگی وەك کەسێك کە دەتوانێت بەزمانێکی سادە، لەسەر ئاڵۆزترین پرس قسەبکات، پەرەپێبدات. ئەم توانایەی بوو وای لە جۆرج بوشی کوڕ کرد لەمیانەی هەڵمەتی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەیدا، پەلەبکات لە هەڵبژاردنی وەك پێشەنگی راهێنەرەکانی لەسەر سیاسەتی دەرەوە. هەر ئەم توانایەشی لەناخی کارەکەیدا وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، بەڕوونی دیاربوو.

هەرچەندە کۆربێل رێبەرو پرۆفیسۆرە پەسەندەکەی کۆندی بوو، بەڵام دیدوبۆچوونیان هەرگیز یەکی نەدەگرت. کۆندی دەڵێت رەنگە ئەو "لە سیاسەتی ناوخۆییدا لەمن زیاتر لیبراڵی بێت، بەڵام تۆلەسێنێکی ناوازەش بوو و گرنگییەکی زۆری دەدا بە خوێندکارەکانی. ئەم گرنگییە زۆرەو تواناکەی لەسەر بنیاتنانی پرسی چەمکیی زیاتر لەسەر چەندین بابەتی سەرنجڕاکێش، کردبوویانە مامۆستایەکی بەهێز"

ئەو لێکۆڵینەوە زۆرە سەربەخۆیەی کۆندی لە زانکۆی نۆتەردام ئەنجامیدان، بوونەهۆی ئەوەی بە باشی بۆ لێکۆڵینەوە قورسو گرانەکانی پەیمانگای

خوێندنی نێودەولەتی ئامادەبێت. فیست دەڵێت: "پرۆگرامەکەمان بەشێوەیەکی باشتر لەگەڵ ئەو خوێندکارانەدا سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ کاردەکەن، کۆندی لەو جۆرە خوێندکارانە بوو. شێوازی کۆندی بەوە جیادەکرایەوە کە هەرکاتێك پێویستی بوایە داوای یارمەتی دەکرد، پاشان کارەکەی دەکرد". مادده بڕیارلێدراوەکانی پرۆگرامەکە چەند بابەتێکیان لەخۆگرتبوو لەوانە مێژووی سەربازی، سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت، مێژووی سۆڤیەتو مێژووی روسیا، کۆمۆنیزم، سیاسەتی نێودەولەتی، کلتوری سۆڤیەتو روسیا. کۆندی بواری ئەو لێکۆڵینەوانەی کە تێزەکەی لەخۆی گرتبوو، بەشێوەیەك تەسککردەوە کە تەنها باس لە بەراوردی رژێمە سەربازییەکان بکات، لەم بوارەدا بەشێوەیەکی توندوتۆڵ کار لەگەڵ جۆناسان ئەدیلمان کە سەرۆکی بەشداری لیژنەی تاووتوێکردنی تێزی دکتۆراکەی بوو لەگەڵ جۆرج برنکلی کە لە زانکۆی نۆتەردام پێشتر مامۆستای بووە، دەکات. ئەم لێکۆڵینەوەیەی شیکردنەوەی سوپای چیکسلۆڤاکیاو کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەلایەتیو سیاسی ولات، لەخۆدەگرێت. ئەم کارەی کۆندی بە لێکۆڵینەوەیەکی پێشەنگ دادەنرێت لەم بوارەداو بەشدارییەکی گرنگە لەو بارەیەوە. ئەدیلمان دەڵێت: "لێکۆڵینەوەی زۆر سەبارەت بەم بابەتە نەنووسرابوو و داتای زۆر لەو بارەیەوە لەبەردەستدا نەبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەوانە نەبوونە بەربەست لەبەردەم خواستی کۆندیدا، بەڵکو بەوپەڕی پەرۆشییەوە دەستیکرد بە کارەکە". ئەدیلمان پێیوایە لە رێگەی ئەم پەرۆشییەی کۆندییەوە دەتوانین چەندین لایەنی کەسایەتیمان بۆ دەربکەوێتو لەوبارەیەوە دەڵێت: "رەنگە هەندێك وەك کەسێکی کۆنەپارێز ببینن، بەلام لەڕاستیدا دەتوانێت ببێتە ژنێکی زۆر بوێرو نەرمڕەوو داهێنەر"

پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکەی کۆندی گەشتێکی حەوت هەفتەیی بۆ یەکێتیی سۆڤیەت لەخۆگرتو لەو چوارچێوەیەشدا ماوەیەکی کورت لە پۆلەندا مایەوە. لەپێناو دەگمەنیی زانیاری راستو دروست لە مۆسکۆ، کۆندی لەو شارە ناچاربوو شێوازی نائاسایی بەکاربهێنێت تا بتوانێت لە لێکۆڵینەوەکەی بەردەوامبێت. ئەو

سەردانە تارادەیەك كورتەی كۆندی، رەهەندێكی راستەقینەی خستەسەر بابەتەكانی ئەو لێكۆڵینەوانەی، لە كتێبخانەكانی زانكۆی دێنیڤەر، بەدواداچوونی بۆ دەكردن. لەوبارەیەوە دەڵێت: "دەستەی ئەركانی گشتی لە یەكێتیی سۆڤیەت بە درێژایی ماوەی پێنج ساڵ، ژیانمی داگیركرد. دەرۆشتم بۆ مۆسكۆ تا پەنجەرەكانی وەزارەتی دەستەی ئەركانی سەربازی بژمێرمو لەورێگایەوە ژمارەی ئەو كارمەندانەی لەوێ كاردەكەن بخەملێنم، چونكە پێشتر ئەم زانیارییانە بەهیچ شێوەیەك بڵاونەكرابوونەوە". دواتر لەكاتی كاركردنی لە ئیدارەكەی بوشی باوكدا ئەم شتە لەگەڵ (سێرجی ئاخرمۆیڤ) كە ماوەی چەندین ساڵ سەرۆكی دەستەی ئەركانی گشتی بووە، تاوتوێ دەكات. كۆندی ژمارەی ئەو كەسانەی لەوێ كاردەكەن بە نزیكەی پێنج هەزار كارمەند دەخەملێنێتو كاتێكیش سەبارەت بەهەمان پرس، پرسیار لە ئاخرمۆیڤ دەكات، لە وەڵامدا دەڵێت: "پێنج هەزار". ئەوكاتە كۆندی دەگاتە ئەو راستییەی كە شێوازی كاركردنەكەی سەركەوتنی بەدەستهێناوە.

لەمیانەی گەشتە خوێندنییەكەیدا، كۆندی توانی ئەو كلتورە تاقیبكاتەوە كە چەندین ساڵبوو پێی سەرسامبوو و توانی سەردانی ئاهەنگە موزیكییەكانی مۆسكۆو سانت پترسبۆرگ، ئەو هۆڵانەی تێیدا چایكۆفسكی سەركردایەتی گرووپە سیمفۆنییەكانی دەكردو رۆبنشتاین موزیكی شۆپانی لێدەداو رەحمانینۆف لاو گرووپە ئۆپراڵییەكەی بەرێودەبرد، بكات. كۆندی بەشێوەیەكی راستەوخۆ ئەو دەسەڵاتە تۆكمەیەی ئەو وڵاتەی بینی كە خۆی لە دیوارە سەختەكانی چواردەوری كرملنو ئەو مۆنۆمێنتانەدا دەبینییەوە كە گوزارشتیان لە پاڵەوانانی ئەو نەتەوەیە دەكرد، ئەمە سەرەرای نەخشە ئەندازیارییە جوانو دڵرفێنەكەی سیستمی شەمەندۆفێری ژێرزەوی. هەروەك لە جوانی زمانی روسی كە بەتەواوەتی قسەی پێدەكردو دەیخوێندەوە، نوقمبوو.

لە مۆسكۆ تەنها ژمارەیەكی زۆر كەم رەشپێست هەبوون. هەرچەندە كۆندی بەو كلاسانە راهاتبوو كە خوێندكارە سپیپێستەكان كۆنترۆڵیان كردبوو، بەڵام وەك ژنێكی رەشپێستو هاوڵاتییەكی ئەمەریكی لە پایتەختی یەكێتیی سۆڤیەت،

هەستی بەوە دەکرد کە سەربەکەمایەتییەکانە. هاولاتییەکی روسی دەڵێت ئەم بارودۆخە وای لێدەکات کە ببێتە کەسایەتییەکی زۆر میللی. دیمتری گیراسامینکۆ کە هاولاتییەکی خەڵکی سانت پترسبۆرگەو دەرچووی ئەکادیمیای حکومی سانت پترسبۆرگە بۆ هونەر، سەرنجی ئەو قۆناغە جیایەی داوە کە رێگەی بە کەمایەتییەکان لەناویشیاندا رەشپێستەکان، داوە بۆ یەکەمین جار دزە بکەنە ناو یەکێتیی سۆڤیەتەوەو دەڵێت: "پێش ساڵی ١٩٥٧ واتە ئەو ساڵەی کە تێیدا کۆنگرەی نێودەولەتی بۆ خوێندکاران لە مۆسکۆ بەرێوەچوو، زۆربەی هاولاتیانی سۆڤیەت، هەلی چاوپێکەوتن لەگەڵ رەشپێستەکانیان نەبوو. بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ پەردەیەکی ئاسنین بنیاتنرابوو، دواتر کتوپڕ خەڵك لەسەرتاسەری جیهانەوە بۆ یەکەمینجار بەگوڕ رووەو مۆسکۆ هاتن. میوانەکان بەو توانا سەرسوڕهێنانەی لەمۆسکۆدا بینییان، سەرسامبوون، هەرچەندە خەڵك زۆر هەژاربوون، بەلام ئامادەیی ئەوەیان تێدابوو کە هەرشتێکیان هەبێت، بەشی میوانەکانی لێ بدەن تا ئەو ئاستەی لە بالەخانە کۆمەڵییەکانیان، ژوریان پێ دەدان و میوانداریان دەکردن".

گیراسامینکۆ دەشڵێت:"بیانییەکان ئەوەیان بەچاوی خۆیان دەبینی کە خەڵکەکە سەرباری هەژارییان، بەخشندەن و خۆشحاڵییان نیشاندەدا. دواتر بیانییەکان سەردانی شارەکە دەکەن و زۆرێك لە دانیشتوانی مۆسکۆ بۆ یەکەمین جار لەژیانیاندا کەسانی رەشپێست دەبینن. لە ساڵەکانی شەستەکاندا چەند دیمەنێك دووبارەبوونەتەوە کە تێیدا کەسانی روسیی فزوڵی لەشەقامەکاندا دەبینران شوێن کەسانی رەشپێست دەکەوتن تا دەستیان لێ بدەن بۆ ئەوەی لەوە دڵنیابن کە لەڕاستیدا ئەمانە مرۆڤن. ئەم کەسانە نەیاندەتوانی بڕوا بە چاوی خۆشیان بکەن. روسەکان ئەو کارەیان تەنها وەك کارێکی فزوڵی ئەنجامدەدا. لە ساڵەکانی حەفتاو هەشتاکانی سەدەی رابردوودا ئێمە خوێندکار بووین و هێندە پەرۆشی ئاشنابوون بە کلتوری دیکە بووین کە بەدوای بیانییەکاندا دەگەڕاین بۆ ئەوەی قسەیان لەگەڵدا بکەین و وایان لێ بکەین لەکۆمەڵگەکەماندا هەست بە ئاسودەیی بکەن، هەروەها بۆ ئەوەی شتێك

لەبارەی ژیانو ئەو وڵاتانەی لێیانەوە هاتوون، بزانین. خەڵکی ئەویَ گرنگییەکی تەواویان بەوڵاتە سەرمایەدارەکان دەدا. گەلەکەمان هیچ شتێکی لەبارەی ژیان لەئەمەریکا یان وڵاتە دیموکراتەکانی ترەوە، نەدەزانی".

گیراسامینکۆ باس لە پێنج ساڵی نێوان کۆتاییەکانی حەفتاکانو سەرەتاکانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو دەکات، واتە ئەو کاتەی کۆندی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی تێزەکەی بوو و لەو پێناوەدا سەردانی مۆسکۆی کردووە، دەڵێت: "شتێکی ئاساییە کچەخوێندکارێکی رەشپێست کە لەزانکۆیەکی باڵای ئەمەریکییەوە هاتبێتو بەباشی بەزمانی روسی قسەبکات، پێشوازی لیَ بکرێتو رێزی لیَ بگیرێت. ئەمەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە روسەکان کاتێك کەسێك دەبینن کە دەتوانێت بە روسی قسەبکات، هەست بە پێزانین دەکەن، تەنانەت ئەگەر قسەکردنەکەشی چەند رستەیەکی سادە بێت بۆ نموونە "سڵاو" یان "دەنگوباست چۆنە؟". ئەم جۆرە هەوڵانە خۆشحاڵی تێدا دەوروژاندن. پێموایە ئەو زانیارییەی رایس هەیبوو، سەرباری ئەزموونە ناوازە ئەمەریکییەکەی بەلای ئەو روسانەی لەماوەی ئەو ساڵانەدا بینیان، شتێکی سەرسوڕهێن بوو".

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٧دا کۆندی گەشتێکی ناوخۆیی لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکانیدا ئەنجامدا. ئەم گەشتە بۆ یەکەمینجار بیرۆکەیەکی سەبارەت بە پێکهاتەی سوپای ئەمەریکا، بە کۆندی بەخشی. کۆندی چووە واشنتۆن تا وەك راهێنەرێکی نیشتەجیَ لە وەزارەتی بەرگریدا کاربکات، چەند هەفتەیەکی لە بالەخانەی پێنتاگۆندا بەسەربرد. دواتر لەمیانەی ماوەیەکی راهێنانی هاوینەدا چووە ناو دامەزراوەی راندەوە. دامەزراوەی راند دامەزراوەیەکی لێکۆڵینەوەی سیاسییەو لەلایەن کۆمپانیای فرۆکەی دۆگلاسەوە لەپاش جەنگی جیهانی دووەمەوە دامەزراوەو ئەم کۆمپانیایەش فرۆکەی جەنگی بۆ سوپا دەهێنێتە وڵاتەوە. بارەگای ئەم کۆمپانیایە لەهەردوو شاری سانتا مۆنیکا لە کالیفۆرنیاو شاری ئارلینگتن لە ڤێرجینیایە. شایانی باسە دامەزراوەی راند شوێنێکی زۆر گونجاوە بۆ ئەو خوێندکارانەی بەشێوەیەکی چڕوپڕ گرنگی بە ئاسایشی

نێودەولـەتی دەدەن. لێکۆڵینـەوەکانی ئـەم دامەزراوەیـە ئاڕاسـتە سیاسـیو سـەربازیو ئابوورییـەکان لـە جیهـانو سەرچـاوەکانی قەیرانـە ناوخۆییـەکانو ئەگەرەکانی هەڕەشە بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەخۆدەگرێت.

پاش گەڕانەوەی بۆ دێنیڤەر، جارێکی تر فوتبۆڵ بووەوە تەوەرێکی سەرەکی ژیانی کۆمەلایەتیی کۆندی، بەلام شتێکی نوێی بۆ زیادکرد ئەویش ئەوەبوو کە بە درێژایی ئەم ساڵانە پەیوەندی لەگەڵ ئەندامێکی گرووپی دێنیڤەر برۆنکۆس، بەردەوامبوو و خۆشەویستییەکەیان بۆ پەیوەندییەکی گەرموگوڕ گۆڕا. دیبۆرا کارسۆن کە یەکێکە لە کچەهاوڕێکانی، دەڵێت هاوڕێکەی کۆندی "یاریزانێکی زۆر سەرەکی بوو". پەیوەندییەکەیان گەیشتە ئاستێك کە دەزگیرانداریيان، ڕاگەیاند. کۆندی بەردەوامدەبێت لەسەر تێکەلاوبوون لەگەڵ هاوسەری ئەندامانی یەکێتیی نیشـتمانی بـۆ تـۆپی پـێو واڕاهـاتبوو لـەکاتی یارییەکانـدا لەسـەر کورسـییە تایبەتـەکان دادەنیشـت، بـەوەش بـووە تـاکێکی زۆر خۆشەویشـت لەبازنـەی دۆستایەتییە گەرموگوڕەکەی ئەندامانی یەکێتییەکەدا. کۆندی گەیشـتە ئاسـتێك کـە کراسـی ئاهـەنگی هاوسەرگیرییەکەشـی هەڵبـژاردو هـاوڕێ لەگـەڵ دایکیـدا دەسـتیکرد بـە ئامـادەکردنی پێویسـتییەکانی ئـەو ئاهەنگـە، بـەلام ئـەم دوو دەزگیرانە پێش وادەی ئاهەنگەکە لەیەکتر جیابوونەوە. کارسۆن دەڵێت: "کۆنـدی بەڕاسـتی بـەنیازبوو شـووی پێبکـات، لەڕاسـتیدا مـن نـازانم چـی ڕوویـدا. هـیچ دەمەقالەیەك لەنێوانیاندا ڕووی نەدا، هەموو ئەوەی کە هەبوو ئەوەبوو کـە ئـەو دوانە بۆیان دەرکەوت ناتوانن ئەو ڕێگەیە پێکەوە تەواوبکەن".

کاتێك کۆندی پرۆگرامی دکتۆراکەی لـە دێنیڤـەر تـەواوکرد، تەمـەنی ٢٦ سـاڵ بوو. لەم ماوەیـەدا پەیوەنـدی لەگـەڵ چـەندین یـاریزانی تـری فوتبـۆڵو کەسـانی بـواری تـردا دروسـتدەکات، بـەلام تـا نووسـینی ئـەم چـەند دێـڕە گرێبەسـتی دەزگیرانداری لەگەڵ کەسیاندا ئەنجام نەداوە.

نـاوی بەرهـەمی کارەکـەی کۆنـدی واتـە تێزەکـەی، **سیاسـەتەکانی دەسـەلاتی پاراستن: پرسی چیکۆسلۆڤاکیا ١٩٤٨- ١٩٧٥**بوو. ئەم تێزەی بووە بنچینەیەك بـۆ کتێبی یەکەمی کە نـاوی **هاوپـەیمانێتی تەمومـژاوی: یـەکێتیی سـۆڤیەتو سـوپای**

**چیکۆسلۆڤاکیا ١٩٤٨-١٩٦٣**بوو. چاپخانەی زانکۆی برنستۆن لە ساڵی ١٩٨٤دا ئەم کتێبەی بڵاوکردووەتەوە.

لەبەرەبەیانی ١٤ی ئایاری ١٩٨١ کۆندی پەیوەندیدەکات بەهاوڕێ دەرچووەکانیەوەو هەموویان پێکەوە لە حەوشەی دەرەوەی کۆمەڵگەی مارگۆری ڕێد کە سەربە زانکۆی دێنیڤەر بوو، کۆدەبنەوە. کۆندی بڕوانامەی دکتۆرای لە لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتیدا بەدەستدەهێنێت، سەرباری ئەوەی، پاش بڕوانامەی دکتۆراکەی کارێك لە زانکۆی ستانفۆرد چاوەڕوانی دەکات. بەوشێوەیە خۆی بۆ دەستکردن بەکارێکی نایابی ئەکادیمی ئامادەدەکات هەرچەندە هێشتا تەمەنی لە ٢٦ ساڵیدایە. ئەندامانی خێزانەکەی هەروەك خودی کۆندی خۆشحاڵبوون و بەشداری لە هەستی شانازیکردنەکەی کۆندیدا دەکەن بەڵام دیارنەبوونی کەسێك، تاڵییەك تێکەڵاوی شیرینی ئەو ڕۆژە دەکات، لەبەرئەوەی جۆزێف کۆربێڵ لە ساڵی ١٩٧٧دا بەنەخۆشی شێرپەنجە مردبوو. ئەم پیاوە هێندە نەژیا کە ئەستێرەی خوێندکارەکانی یان کچەکانی ببینێت کە دەبنە دوو کەسایەتی باڵای جیهانی. کارین فیست دەڵێت:"بەهۆی شێرپەنجەی گەدەوە کۆچی دوایی کرد، بەڵام تا دواخولەکی ژیانی کەسێکی چالاك بوو". شایانی باسە کۆربێڵ کاتێك لەسەر جێگەبوو بەهۆی نەخۆشییەوە، سەرقاڵی نووسینێکی نوێ بوو لەسەر سەربازە چیکییەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا.

ئەزموونەکەی کۆندی لە زانکۆی دێنیڤەر لەوکاتەی کە کۆربێڵ چاودێری دەکرد تا گەیشتنە ئەو تەحەددایانەی بابەتی لێکۆڵینەوەکەی سەپاندبوونی، بەرزنرخاندنێکی زۆر جیادەکرێتەوەو خودی خۆشی ئەمەی باش لەبیرە. کۆندی دەڵێت:"بەهۆی ئەوەی کە دەستەی فێرکاری لە پەیمانگای لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی لەڕووی ژمارەوە بچووك بوو، کارلێککردن لەناویاندا بە زەقی دیاربوو. لەبەر ئەم هۆیە توانیم ڕاهێنانێکی توندوتۆڵم لە فەلسەفەی سیاسی و مەنهەجیدا دەستبکەوێت. حەزم لەو پرۆگرامە بوو کە ڕێگەی بە هاوکاریکردن لەنێوان بەشەکانی پەیمانگاکە دەدا، هەروەك حەزیشم لە بژاردە ناوابەستەکانی بوو". بەوەرگرتنی بڕوانامەکەی لەو بەیانییە هاوینەییەدا، کۆندی خوێندنی

زانکۆیی تەواودەکات. ئەم خوێندنەی لەبوارێکدا تەواوکرد کە لەسەرەتای خوێندنە زانکۆییەکەیدا تەنانەت ناویشی نەبیستبوو. دواتر کۆندی ئامۆژگاری خوێندکارەکانی دەکات هەروەك ئەو، چالاکانە بگەڕێن بەدوای ئەو بوارەی پەرۆشییان دەوروژێنێت. لەمبارەیەوە دەڵێت: "بەخوێندکارەکانم راگەیاندووە کە ئەگەر نازانن چیتان دەوێت ئەوا پێویستە دەست بکەن بە گەڕان. هانمداون کە کلاسێك بۆ خۆیان بدۆزنەوە حەزی لێ بکەن و مامۆستایەك بدۆزنەوە کە بە بەشەکەوە گرێیان بدات" ئەو گۆڕانکارییەی کاریکردووەتە سەر ئەو ژیانەی کە بە خوێندنی موزیك دەستیپێکردووە تا گەیشتووەتە لێکۆڵینەوە لەسەر سۆفیەت، فێری خۆگونجاندنی کردووەو لەوە تێی گەیاندووە کە خۆبەستنەوەی مرۆڤ بە پلانێکی وشکەوە، سودی نییە. کۆندی دەڵێت: "بۆ ماوەی چەندین ساڵ ژیانم لەسەر ئەو بنچینەیە رێکخست کە ببمە موزیکژەن و هەموو ئەوەی دەمویست ئەوەبوو، دواتر هەموو شتێك نەماو جارێکی تر شتی وا دووبارە ناکەمەوە". دیارە ئەم تێگەیشتنە زۆر کاریکردووەتە سەر پۆستەکەی هەربۆیە لەو ساتەوە خۆی بە کارکردنی شێلگیرانە لەسەر ئەو ئەرکەی لەبەردەستیدایە، پابەندکردووە، بەڵام هاوکات خاوەنی کرانەوەیەکی تەواوەتییە.

ئەندامانی ئەو دەستە فێرکارییەی ئامادەی ئاهەنگی دەرچوونی ئەو رۆژە بوون، درکیان بەوە کردبوو کە شتی زیاتر لەبارەی کۆندۆلیزا رایسەوە دەبیستن. ئارسەر گێلبێرت کە یەکێکە لەو پرۆفیسۆرانەی پێداچوونەوەیان بە تێزەکەی کۆندیدا کردووە، دەڵێت:"پێموایە هەمووومان درکمان بەوە کردبوو کە کۆندی کارێك دەکات زۆر لە توانای خوێندکاری ئاسایی زیاترە". کارین فیستیش ئەو پێشبینییەی دووبارەکردەوەو وتی:"هەمیشە لەو باوەڕەدا بووین کۆندی سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت. بەدرێژایی چەندین ساڵ، هەندێك خوێندکاری نایابمان هەبووە کە لەکاتی خوێندنیاندا لە دێنیڤەر دیاربوون، دەشمانزانی کە هەر یەکێکیان سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت. نەماندەزانی کاتەکە کەیە، بەڵام دڵنیابووین لەوەی کە رۆژێك دێت سەرکەوتن بەدەست دەهێنن" سەبارەت بە کۆندیش سەرکەوتنەکەی لە کالیفۆرنیاوە دەستیپێکردووە.

# بەشى شەشەم

## پرۆفیسۆر رایس

"تێگەیشتن لە سنوردانان بۆ پرچەکردنو بیروبۆچوونەکانی ولاتە پەیوەندیدارەکانو پێویستییەکانیان، هۆکارێکی سیاسییە بۆ بوونمان. پێویستە رەشپێستەکان بەشێك بن لەم تێگەیشتنە، هەروەك پێویستە بەشێك بن لەسەرجەم بوارەکانی تری فیکرو پەرەسەندنی ئەمەریکا. شەرمەزارییە بۆ ئێمە ئەم پرسە نەتەوەییە بۆ ئەو پیاوە سپیپێستانە بەجێبهێڵین کە تەمەنیان لەسەروو چل ساڵانەوەیە".

### کۆندۆلیزا رایس ۱۹۸۳

لە بەرەبەیانی یەکی دیسەمبەری ساڵی ۱۹۸۹ نەرمەبارنێك لەسەر رووی کەشتی جەنگی USS Belknap باریو بووە هۆی بریقەداربوونی کەشتییەکە. ئەو کەشتییە موشەکی ئاراستەکراوو کلاوەو پارچەکانی تری ئوستوڵی شەشەمی بەندەری ڤالیتا لە ئیتاڵیای هەڵگرتبوو. پێشبینییەکان بۆ کەشوهەوای دورگەکانی دەریای ناوەڕاست بۆ ئەو هەفتەیە باش نەبوون، هاوکات لەگەڵ هاتنی ئێوارەدا بایەکی توند هەڵیکرد کە بووە هۆی دروستبوونی چەند شەپۆلێك کە بەرزییەکانی دەگەیشتنە ۱٦ پێ ئەمەش بووە هۆی لەرینەوەی ئەو کەشتییە گەورەیەو سەرەوخوارکردنی وەك یاریپێکردن.

سەرۆك بوش لەو شوێنەی کە بۆ ئەدمیراڵ دانرابوو، دادەنیشێت و هەوڵدەدات پێش وادەی کۆنگرە چاوەڕوانکراوو گرنگەکە کەمێك پشوو بدات. لە کۆنگرەی لوتکەی مالتادا سەرۆك بوش چاوی بەسەرۆکی سۆڤیەت میخائیل گورباتشۆف دەکەوێت و هەوڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی لە چەندین پرسدا دەخاتە بەردەم، هەروەك پشتگیری وڵاتەکەی بۆ ریفۆرمەکانی پیریسترۆیکا دەخاتەڕوو کە گۆرباتشوف جێبەجێیان دەکات. شایانی باسە کۆنگرەی لوتکەی مالتا کە میدیاکان ناویان لێناوە لوتکەی گێژاوی دەریا یەکەم کۆنگرەیە کە هەردوو زلهێزەکە لەسەر رووی کەشتی دەیبەستن. بەهۆی شەپۆلە یەکلەدواییەکانەوە ئامادەبووانی کۆنگرە ناچاربوون بۆ ماوەی رۆژێك گفتوگۆکان رابگرن.

ئەو وەفدە ئەمەریکییەی لە کۆنگرەکەدا ئامادەبوون هەریەکە لە جەیمس ئەی بایکەری سێیەم وەزیری دەرەوەو جۆن سەنونو سەرۆکی ستاف کۆشکی سپی و بێرنت سکۆکرۆفت راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، لەخۆگرتبوو. دواتر یەکێکی تر لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پەیوەندیدەکات بەسکۆکرۆفتەوە کە ئەویش کۆندۆلیزا رایسی تەمەن ٣٥ ساڵان بوو کە پسپۆڕی کاروباری سۆڤیەت بوو. سەرۆك بوش رایس بەم شێوەیەك بەسەرۆك گۆرباتشۆف دەناسێنێت: "رایس ئەو ژنەیە کە هەرشتێکم بوێت سەبارەت بەیەکێتیی سۆڤیەت پێم دەڵێت". لەم کاتەدا ئامادەبووانی کۆنگرەکە سەرنجیاندا کە گۆرباتشۆف بەگومانە لە قسەکەی بوش ـ ی روانی، بۆیە ئاورێکی بۆ کۆندی دایەوەو وتی: "هیودارم زۆر بزانیت"

یەکێك لەو هۆکارانەی کۆندی کردبووە پسپۆڕی کاروباری یەکێتیی سۆڤیەت، ئەو راستییە بوو کە زانایەکی کراوەو کێڵگەیەکی هەمیشە گۆڕانخواز بوو و رۆژانە مێژووی خۆی دەنووسییەوە. کاتێك کۆندی دەستیکرد بە خوێندنی یەکەم بڕیارلێدراوەکانی پسپۆڕییە زانکۆییەکەی لە پەیوەندییە نێودەولەتییەکان، ئەوەی لەخەیاڵیدا نەبوو، کە رۆژێك لە رۆژان ببێتە تەوەری یەکێك لە گرنگترین دیمەنە مێژووییەکان لە مێژووی هاوچەرخدا واتە کۆتایی شەڕی سارد. رۆژی

یەکەمی دانووستانەکان لە ژوورێکی پڕ لە کتێب کە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دانرابوون، لەناو ئەو کەشتییە جەنگییەی کە پێیان دەووت **مەکسیم گۆرکی**و تەنها کەشتییەك بوو لەو بەندەرەدا کە بەهۆی قورساییەکەیەوە دەیتوانی رووبەڕووی شەپۆلە سەختەکان ببێتەوە، بەڕێوەچوو. گفتوگۆکان لە ماوەی دوو رۆژدا هەشت سەعاتیان خایاند. لەو ماوەیەدا بوش‌و گۆرباتشۆف چەندین پرس تاووتوێدەکەن لەوانە سنوردانان بۆ پڕچەککردن، سیاسەتی بازرگانی، یاساکانی کۆچی سۆڤیەت، بوونی هێزی سەربازی لە ئەوروپا بەپێی ڕێککەوتنی نێوان وڵاتان. لەو کۆبوونەوەیەدا هەردوو سەرۆك لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە دووژمنایەتییەکەی نێوانیان بووە بە بەشێك لەڕابردوو و ئەوەش گرنگترین ئەنجامی کۆنگرەکەبوو. گۆرباتشۆف لە کۆتایی کۆنگرەکەدا وتی: "پێویستە دەستبەرداری تایبەتمەندییەکانی شەڕی سارد بین، هەروەك پێویستە دەست لە هەموو دیاردەکانی پێشبڕکێی چەك، نەبوونی متمانە، ناکۆکی دەروونی‌و ئایدۆلۆجی هەڵبگرێت". سەرۆك بوش هاوڕای ئەم قسەیەی هاوتا سۆڤیەتییەکەی بوو و وتیشی کە جیهان: "لەسەروبەندی سەردەمێکی نوێی پەیوەندییەکانی نێوان ئەمەریکاو سۆڤیەتدایە". لەوێ لە ماڵتا کە بە ئامادەبوونی کۆندی، هەردوو سەرۆك بوش‌و گۆرباتشۆف سەردەمێکی نوێی هاوکاری نێوان ئەو دوو زلهێزەیان کردەوە.

هەشت ساڵ پێشتر لە زانکۆی ستانفۆردەوە کاری پیشەیی کۆندی وەك ژنێکی ئەکادیمی‌و داڕێژەری سیاسەت دەستیپێکرد. کۆندی توانی سودمەند بێت لە مینحەی زانکۆیی بۆ بەردەوامبوون لە لێکۆڵینەوەکانی لە سەنتەری ستانفۆرد بۆ لێکۆڵینەوەی ئاسایشی نێودەولەتی‌و سنوردانان بۆ چەك کە بەشێکبوو لە ئینستیتیوی لێکۆڵینەوە نێودەولەتییەکان کە سەر بە زانکۆکەبوو. ستانفۆرد نزیکەی ٣٥ میل لە باشووری سانفرانسیسکۆوە دوورە، ئەم زانکۆیە شانازی بەوەوە دەکات کە خاوەنی دەستەیەکی فێرکارییە کە چەندین مامۆستاو پرۆفیسۆری تێدایە خەڵاتی نۆبڵ‌و پۆڵتیزەریان وەرگرتووە، هەروەك خاوەنی یەکێك لە جوانترین باڵەخانەی زانکۆیە لەو وڵاتەدا. لەو زانکۆیە چەندین بیناو

بالەخانـەی بـەهێزو بـەرز هـەن کـە لەسـەر شـێوازی بیناسـازیی کالیفۆرنیـا ئەنجامدراون‌و بـە بنمیچـی دروسـتکراو لـە قەرمیـدی سـوور رازاندویەتییـەوەو بـە هـەزارەها درەخـتی سـندیان‌و خورمـاو ئـەکالێتس، چواردەورە دراوە. ئـەم کۆمەڵـە بالەخانەیە کۆنترین بەشی حەرەمە زەبەلاحەکەی زانکۆ پێکدەهێنێت کە بەسەر ٨ هـەزار هێکتـار زەویـدا دابەشـبووەو بەسـەر دیمـەنی دڵگـیری دورگـەی سانفرانسیسکۆدا، دەڕوانێت.

بەهۆی ئـەو مینحەیـەی پێـی درا، کۆنـدی دەتوانێت موچەیەکی سـی هـەزار دۆلاری‌و نووسـینگەیەکی تایبـەت بـەخۆی‌و ئـازادی گەیشـتن بەسـەرجەم کتێبخانـەکانی زانکـۆی سـتانفۆردی دەسـتبکەوێت، ئەمـە سـەرەڕای ئاسـانیی پەیوەنـدیکردن لەگـەڵ دامـەزراوەکانی بـواری لێکۆڵینـەوەو دەسـتەی فێرکاریـدا. کۆنـدی وەك لێکۆڵـەرەوەی بـواری کاروبـاری سـۆڤیەت پەیوەندیـدەکات بـە داڕێژەرانی سیاسەت‌و بیزنسمانان‌و پسپۆڕانی ئاسایش‌و چەندین پسپۆڕی تـر تـا کـار لەسـەر لێکۆڵینـەوەی ئـەو پرسـە هاوچـەرخانەی پەیوەنـدییان بـە ئاسایشـی نێودەولەتییـەوە هەیـە، بکـات. ئـەم بەشـەی کۆنـدی پەیوەنـدی پێـوەکرد تـەنها بەشە لەسەرتاسەری وڵاتدا خـولی چـڕوپڕ لەسـەر کاروبـاری تایبـەت بەسنوردانان بۆ پڕچەککردن پێشکەشدەکات‌و ئەو خوێندکارانـەی ئـەم جۆرە خولانـە دەبیـنن بەشـێوەیەك راهێنانیـان پێـدەکرێت کـە ببنـە پسـپۆڕی کاروبـاری سـنوردانان بـۆ چەك‌و ئاسایش. زۆرێك لە دەرچوانی ئەم بەشە دواتـر چـەندین پۆسـتی حکومی پەیوەندیدار بە کاروبـاری سـنوردانان بـۆ پڕچـەککردنیان وەرگرتـووە. ئێسـتا ئـەم بەشـە ناوەکـەی گـۆڕاوە بـە سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی ئاسـایش‌و هاوکـاری نێودەولەتی.

ماوەی مینحە زانکۆییەکەی کۆندی تەنها ساڵێك بوو، بـەڵام ئـەو وتـارەی کـە ئەم خانمە پاش چەند مانگێکی کەم لە پەیوەنـدیکردنی بەمینحەکـەوە لەبەشـی زانستە سیاسییەکان پێشکەشیکرد، کاریگەریـەکی هێنـدە بـەهێزی هـەبوو کـەوای لـە زانکۆکـە کـرد داوای لێبکـات ببێتـە ئەنـدامی دەسـتەی فێرکـاری. ئـەو کاتـە ئەوبەشە لە هەوڵی ئەوەدابوو کە ئـەو کەسـانەی لێهاتوون‌و سـەربەکەمینەکانن

لەخۆبگرێت. بەو شێوەیە کۆندی وەك کەسێکی شیاو دەرکەوتو توانی لەم یاسای جوڵە پۆزێتیڤە سودمەندبێت، تەنها لەبەرئەوە نا کە کەسایەتییەکی رەشپێستە بەڵکو بەوپێیەی ژنێکە کار لەبوارێکدا دەکات کە پیاوان کۆنترۆڵیان کردووە. بەشەکە گرەنتی نوێکردنەوەی گرێبەستی کارکردنی نەدا بە کۆندی تەنها لەکاتێکدا نەبێت کەشیاوی کارەکەی بێت. لەوبارەیەوە کۆندی دەڵێت: "ئەوان پێویستیان بە پسپۆرێکی تری کاروباری یەکێتیی سۆڤیەت نەبوو، بەڵام پرسیاریان لەخۆیان دەکرد "چەند جار ژنی رەشپێست هاتووە بۆ ئەوەی ریزەکانمان فرەرەنگ بێت؟" سەرۆکی بەشەکە هەڵوێستی ڕووندەکاتەوەو بە کۆندی دەڵێت:"ئێمە لێرە بە گرێبەست بۆ ماوەی سێ ساڵ کاردەکەین، دواتر پێویستە گرێبەستەکە نوێبکەینەوە. کەس لێرەدا ناڕوانێتە رەگەز یان ئەوەی کە مامۆستاکە ژن بێت یان پیاوو لەکاتی نوێکردنەوەی گرێبەستەکەدا هیچ ئیمتیازاتێکت پێ نادرێت". کۆندی کەمێك بیردەکاتەوەو پاشان دەڵێت:"زۆر چاکە، پێم وایە بۆ من زۆر گونجاوە".

لە پایزی ساڵی ١٩٨١دا کۆندی وەك یاریدەدەری پرۆفیسیۆر لە زانستە سیاسییەکان دەستدەکات بەوانەوتنەوە، هەروەها پۆستی یاریدەدەری بەڕێوەبەری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ئاسایش و سنوردانان بۆ پرچەککردنی نێودەولەتیشی وەرگرت. فراوانی تێڕوانین و کارامەیی لە وانە وتنەوەو بەهێزیی لەکەسایەتیدا بوونە هۆی ئەوەی کۆندی ببێتە جێگەی رێزی دەستەی فێرکاریی خوێندکارانیش، هەرچەندە تەمەنی تەنها ٣٦ ساڵ بوو. کویت پلاکەر کە یەکێکە لە پرۆفیسۆرە هاوکارەکانی کۆندی دەڵێت:"پێموایە ئەوەی کە ببووە جێگەی سەرنجی خەڵکی لەوکاتەدا، تێکەڵەیەك بوو لە هەڵسوکەتی کەسایەتی، لەوانە سەرنجڕاکێشی و کەسایەتییە زۆر نەرمونیانەکەی... هەروەها سەرنجی ئەوەیان دەدا کە جۆرێك لەخێرابۆهاتنی تێدابوو کە ئاوێتەی روخسارە نەرمەکەی بوو. ئەو ماگنۆلیایەکی ئاسنین بوو". پلاکەر دەشڵێت:"پەروەردە باشورییەکەی ئاوێتەی ناخێکی پۆڵایین و خۆرێکخستنێکی چڕوپڕبوو".

جۆن فێریگۆن کە وەك پرۆفیسۆر لە ساڵی ١٩٨٣دا پەیوەندیکردووە بە

بەشی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ستانفۆردەوە باس لەوە دەکات کە لەو سەردەمەدا تەنها کەسێکی رەشپێست لە دەستەی فێرکاریدا، کۆندی بوو. جۆن ئاماژە بەوەش دەکات کە کۆندی بە سیمای سەرکردایەتیو قایلکردن جیادەکرێتەوەو بەدرێژایی ژیانی پیشەیی، ئەم سیمایانەی لەگەڵدا بووە. جۆن دەڵێت: "کۆندی دەتوانێت لەگەڵ هەموولایەکدا رێکبکەوێت، تەنانەت کاتێك کە تەنها یاریدەدەری پرۆفیسۆربوو زۆر لەو سیمایانەی تێدابوو کەئێستا پێوەی دیارە. ژنەسەرکردەیەکی کاریگەرە، خاوەنی بریارو دیدێکی روونە بۆ پرسەکان. ئەگەر لەشتێکیشدا بۆچونت لەگەڵیدا جیاواز بێت دەبینیت هۆکاری بەهێزی پێیە کەپشتگیری بیروبۆچوونەکەی ئەو دەکاتو لەکاتی ناکۆکیدا هەمیشە لەکۆتاییدا بۆچوونەکەی ئەو دەیبردەوە"

لەماوەی دەیەی دواتردا کۆندی چەندین وانە لە چەندین بەشی جیاوازدا دەڵێتەوە کەزۆربەیان لە بواری زانستی سیاسی پراکتیکیدا بوو. ئەم وانانەی کۆندی باسیان لە پرسەکانی تایبەت بەسوپاو ئاسایشی نەتەوەییو سیاسەتی دەرەوە دەکرد. وانەکان ئەم بابەتانەیان لەخۆگرتبوو:

**بارستەی کۆمۆنیزمو جیهانی سێیەم:** ئەم زنجیرەوانەیە باسیان لەچالاکییە سیاسیو سەربازیو ئابورییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتو هاوپەیمانەکانی لە جیهانی سێیەمدا دەکرد.

**رۆڵی سوپاس لە سیاسەتدا:** تێروانین بوو سەبارەت بەو کارلێکەی لەنێوان سەرکردە سیاسییەکانو هاوتا سەربازییەکانیاندا لەسێ جۆر حکومەتدا کە ئەوانیش حکومەتی پیشەسازیی رۆژئاوا، حکومەتی کۆمۆنیستی، حکومەتی وڵاتانی تازەپێگەیشتوو. لەمەدا کۆندی پشتی بەچەندین نموونەی سەکردەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانو یەکێتیی سۆڤیەتو چینو بەرازیلو نێجیریا، بەستووە.

**سیاسەتی هاوپەیمانێتی:** ئەم بوارە باس لە پەیمانی باکوری ئەتلەسی (ناتۆ)، پەیمانی وارسۆو ئەو هاوپەیمانێتییە سەربازی- سیاسییانەی تر دەکات کە سیستمی جیهانی لە سەدەی نۆزدەهەمو بیستەمدا بەخۆوەی بینیوە.

**بژاردەی سیاسی:** بابەتی ئەم زنجیرەوانەیە باس لەبەکارخستنی دارێژەرانی

بڕیاری سیاسیو هەڵسوكەتیان لە بوارەكانی وڵاتی پەرلەمانی، ئیداریی، جێبەجێكرنو سەربازیدا، دەكات.

**سیاسەتەكانی ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتە یەكگرتووەكانو یەكێتیی سۆڤیەت، لێپرسراوێتی ئیمپراتۆریەت لە سەردەمی جەگی ناوكیدا:** ئەمە بابەتێكی بەراوردكارییە سەبارەت بەچۆنیەتی راگرتنی هاوسەنگی لەنێوان بەرپرسیارێتی ناوخۆییو دەرەكی لەلایەن هەردوو زلهێزەكەوە، هاوكات پاراستنی تێڕوانینێكیورد بۆ هەردوو سیستمی ئاسایشی نەتەوەیی لەو دوو وڵاتەدا.

**دامەزراوەكانی توندوتیژی:** ئەمە زنجیرە وانەیەك بوو كە باس لەو گۆڕانكارییە دەكات كە دەبێتە هۆی دروستبوونی شۆڕش، هەروەها باس لە ڕۆڵی سوپاو هێزەكانی پۆلیس دەكات.

**گۆڕانكاری لە ئەوروپا:** تێڕوانینە لەم گۆڕانگارییە لە دیدی بڕیاردارێژەرانی واشنتۆن، بۆن، مۆسكۆ، پاریسو لەندەنەوە. ئەم زنجیرەوانەیە گفتوگۆكردنبوو لەسەر ئەو گۆڕانكاریيانەی لەنێوان هەردوو ساڵی ١٩٨٩و ١٩٩٠دا لە ئەوروپا ڕوویانداوە.

یەكێك لەو شێوازە وانەوتنەوانەی لەلای كۆندی زۆر خوازراو بوو ئەوەبوو كە وای لە خوێندكارەكانی دەكرد پیاچوونەوە بەو بڕیاردانە گرنگانەدا بكەن كە پەیوەندییان بەسیاسەتی دەرەوە هەیە، ئەویش لە ڕێگەی زنجیرەیەك دانیشتن كەتێیدا خوێندكارەكان ڕۆڵی كەسایەتییەكان ببینن. پاش ئەنجامدانی لێكۆڵینەوە لەلایەن خوێندكارانەوەو نووسینی لێكۆڵینەوەكان سەبارەت بە ڕووداوێكی سیاسی گرنگ، ڕۆڵی هەر كەسایەتییەك دەدرا بەخوێندكارێك. كۆندی هەستیكرد كە ئەم شێوازی وانەوتنەوەیە تێگەیشتنێكی فراوانتر، سەبارەت بەوەی لە هۆلەكانی بڕیارداندا ڕوودەدات، دەداتە خوێندكارانو دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر لە بابەتەكە قوڵببنەوەو تەنها خوێندنەوەی دەقێك نەبێو هیچی تر. لەو بارەیەوە دەڵێت: "دروستكردنی ئەو هەستی ئاڵۆزكردنو قورسكردنەی پەیوەندی بە سیاسەتی دەرەوە هەیە، لەلای خوێندكار، كارێكە لەگەڵ بوونی ئەو پرۆگرامانەی لە ئەدەبیاتی زانستە سیاسییەكانو مێژوودا هەن، قورستر دەبێت". كۆندی

هەستیکرد کە رۆڵدان بەخوێندکار یارمەتییان دەدات لە گرنگی کەسایەتی یاریزانە بنچینەییەکانو کاردانەوە سۆزدارییەکانیان باشتر تێبگەن، هەروەك یارمەتییان دەدات لە رۆڵی ئەندامانی کۆنگرێس، میدیا، بیرۆکراسییەکانو ئەو گرووپانەی نوێنەرایەتی بەرژەوەندییە تایبەتەکان دەکەن، باشتر تێبگەن. هەر لەوبارەیەوە بەردەوامدەبێتو دەڵێت:"دروستکردنەوەی ئەو کەسایەتییانەی بەشێوەیەکی نیزامی" لە پرۆگرامەکانی خوێندنی زانکۆییدا دەیانخوێنین چەند لایەنێکی گرنگی چیرۆکەکە پشتگوێدەخەن، بەڵام دروستکردنەوەی رووداوێکی سیاسی دیاریکراو، هەست بەشۆککردنێك لەلای خوێندکاران دەچەسپێنێت. کۆندی دەڵێت:"زۆر جێگەی سەرنجو گرنگیپێدانە خوێندکاران ببینین کە ئەو شێوازە پەسەندبکەن کە ئەوان دەیکەنو بڵێن:"لەو باوەڕەدا نەبووم بمتوانیایە بەم شێوازە هەڵسوکەوت بکەم"

یەکێك لەخوێندکارەکان بە ناوی ترۆی عید، باس لەو درامایە دەکات کە لەیەکێك لەدانیشتنە رۆڵبینینەکاندا دەرکەوتووەو تێیدا رۆڵی وەزیری بەرگری یەکێتیی سۆڤیەت بەرجەستەدەکات، ئەو خوێندکارە لە رۆڵەکەیدا پاڵتۆیەکی هاوشێوەی ئەوەی لەبەربوو کە ئەفسەرێکی پلەبەرزی سوپای روس لەبەریدەکات. ئەم رۆڵە یەك هەفتەی تەواو دەخایەنێت، جارێکیان خوێندکارەکە بەهۆی ماندووبوونەوە هەر لەنووسینگەکەی کۆندیدا خەوی لێدەکەوێت، بەڵام کۆندی بەئاگای دەهێنێتەوەو قاوەیەکی پێدەدات تابتوانێت لە بەرنامەکە بەردەوام بێت. ترۆی دەڵێت: "تائێستاش ئەو هەفتەیە بەماندووکەرترین هەفتەی مێژووی ژیانم دادەنێم". ئەم قسەیەی ترۆی زۆر هەڵدەگرێت بەتایبەت کە هی کەسێکە کۆلێژی مافی زانکۆی شیکاگۆی تەواوکردووە، دواتر بووەتە راوێژکاری یەکەمی بیل ئۆینز حاکمی ویلایەتی کۆلۆرادۆ، دواتریش پۆستی سەرۆكو بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیایەکی گەورەی بواری سیستمی ئینتەرنێت دەگرێتەدەست.

کۆندی وابەستەی کۆتوبەندی لیبراڵیی کلاسیکی نەبووە لە ژیانی زانکۆییدا ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سەر بەکۆمارییەکان بووە. هاوکات هەوڵی

نەداوە بۆچونە كۆنەپارێزەكانى بشارێتەوە. يەكێك لە خوێنەدكارەكان باس لەوە دەكات كە كۆندى بە هەلّۆ كۆندى ناسراو بوو. هەروەك جۆن فێريگۆن بە ئاشكرا باسى لەوە كردووە كە "هاوسۆزيى كۆندى بۆ كۆمارييەكان شتێكى سەيرو كتوپڕ نەبووە بەڵكو بەوە ناسراوبوو. ژنێكى چالاكى ناو كۆمەڵگا بووەو بيروبۆچونەكانى لەهيچ كەسێك نەدەشاردەوە لەبەرئەوەى كەسێكى زۆر راشكاو بوو"

كۆندىوا راهاتبوو وانە سەرەتاييەكانى ئەو بابەتانەى باسيان لە پرسى سەربازى دەكرد بەيارى تۆپى پىێ بچوێنێت. ئەو كەسانەى دەيناسن دەيانزانى كەيەكێك لەبابەتە خوازراوەكانى، بەراوردكردنى فوتبۆڵ بووە بەشەڕ. پۆڵ پرست كە راگرى پێشووى ئينستيتيوى ماڤ سەر بەزانكۆى ستانفۆردو سەرۆكى ئێستاى دامەزراوەى هيۆلێتە، باس لەوە دەكات كە جارێكيان لەگەڵ كۆندى ئامادەى يارى كاردينال گەيم ستانفۆرد بووە. پۆڵ لە ئينيستيتيوى ماف بۆنەيەكى ئامادەكردبوو بۆ ئەوەى سەرۆكى فۆرتى نايزەر لەفرانسيسكۆ ئامادەى ببێت. پرست دەڵێت: "كۆندى كاتێك بەم بۆنەيەى زانى، پێىوتم: "نامەوێت بەهۆى نەبوونى شارەزاييت لەسەر فوتبۆڵ زانكۆكە شەرمەزاربكەيت، لەبەرئەوە دەتبەم بۆ ئامادەبوون لە يارييەكانى فوتبۆڵ لە ستانفۆرد". كۆندى لەنێوان پۆڵو هاوسەرەكەيدا دادەنيشێتو هەر لەوێ وانەيەكى چڕوپڕيان لەسەر ئەو يارييە پێدەدات. پۆڵ لەو بارەيەوە دەڵێت: "يەكەم شت كەپێى وتين ئەمە بوو: "يارى تۆپى هەروەكو شەڕ، پەيوەندييان بەدەستبەسەرداگرتنى زەوييەوە هەيە".

كۆندى يەكەم كەس نييە كە بڕواى بەم لێكچواندنە هەيە. ستيڤن كراين كە نووسەرى رۆمانى خەڵاتى سوورى ئازايەتىيە (١٨٩٥) كەباس لە شەڕى ناوخۆ دەكات، كاتێك پرسيارى لىێ دەكەن چۆن دەتوانێت بەشێوەيەك لەسەر ئەو جۆرە شەڕە بنووسێتو بڕوا بەخەڵك بهێنێت لەكاتێكدا نەيبينوە، لەوەڵامدا دەڵێت:"پێم وايە هەستكردن بەتوڕەيى توندو ناكۆكيم لە يارىگاى فوتبۆڵەوە وەرگرتووە". هەروەها باس لەوە دەكرێت كە جارێكيان تيدى رۆزڤڵت وتويەتى: "باشترين بنچينە كەپێويستە مرۆڤ جێبەجێى بكات چ لەژياندا بێت يان لە يارى

تۆپی پێدا بریتییە لە: بەتوندی نیشانەگرتن و ئاڕاستەکردن، نەفیلێ بکەو نە رابکە بەڵکو بەتوندی نیشانەی لێ بگرە". هەروەها والتەر کامپ (١٨٥٩-١٩٢٥) کەداهێنەری تۆپی پێی ئەمەریکییە باس لەوە دەکات کە لێکچوونێکی سەرسوڕهێنەرو سەرنجڕاکێش لەنێوان ئەو بیردۆزانەی جەنگە گەورەکان بەڕێوەدەبەن لەگەڵ کێبەرکێ بچوکەکانی نێو یاریگاکانی فوتبۆڵی ئەمەریکیدا هەیە".

ژمارەیەك لە یاریزانانی فوتبۆڵ و یارییەکانی تر پەیوەندیدەکەن بەوانە فراوانەکانی کۆندییەوەو لەوێ خۆیان لەمەودای نزیکی نێوان جەنگ و فوتبۆڵ تێدەگەن، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك لە کچە خوێندکارەکان باس لەوە دەکات کە لەم جۆرە مامەڵەیەدا هەستی بەبێزاریی کردووە. ئەم کچە خوێندکارە لە ساڵی ١٩٩٢دا لەکاتی دەستپێکی جەنگی بۆسنەدا پەیوەندیدەکات بەماددەکانی ساڵی یەکەمی زانکۆوە کە ئەو کاتە کۆندی دەیوتنەوەو باس لە ئەزموونی خۆی لەوێ دەکات و دەڵێت:"کۆندی لە وانەوتنەوەیدا زیاتر پێداگریی لەسەر کارو دەستتێوەردانی سەربازی دەکرد، وانەکانی جێبایەخ و گرنگی بوون لەبەرئەوەی هاوکات بوون لەگەڵ هەڵگیرسانی قەیرانی یۆگۆسلافیا. دکتۆر رایس وانەکانی بەپشتبەستن بە لێکچواندن بەیاری فوتبۆڵ دەستپێدەکرد، ستراتیژەکانی فوتبۆڵی لەگەڵ شەڕی مەیدانی نێوان وڵاتاندا بەراورددەکرد. ئەم بەراوردکارییانە بۆ من سوپرایز بوون لەبەرئەوەی ئەو ژن بوو و ئەم بابەتانە هەمیشە لە چوارچێوەی پسپۆ ڕیی پیاواندایە. پێم‌وایە ئەم جۆرە لێکچواندنە هۆکارێکی سەرکەوتووە بۆ خوێندکاران بەگشتی، بەڵام بەداخەوە کاتێك پۆلەکە ژمارەیەکی زۆر لەو خوێندکارانە لەخۆدەگرێت کە رۆژانە یاری فوتبۆڵ دەکەن، دەبێتە هۆکارێکی مەترسیدار. پێم‌وایە ئەم شێوازە جەنگ دێنێتە ئاستی فوتبۆڵەوە نەك بەپێچەوانەوە، هەر لەبەر ئەوەیە کەئەم بەراوردکارییەم بەدڵ نییە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە کۆندی پرۆفیسۆرێکی خراپە بەڵکو بەپێچەوانەوە وانەکانی چێژبەخش بوون و زۆرشتی لێوە فێربووم"

یەكێك لە كوڕە هاوكارەكانی دەڵێت، ئەو پەرۆشییەی كۆندی لەگەڵ خۆیدا هێنابوویە ناو كەرتی فێركردنەوە هێندە كاریگەر بوو تەنانەت پاش چوونە دەرەوەشی لە هۆڵی وانەوتنەوەكە، دەمایەوە. ئەم پیاوە دەشڵێت:"هەركەسێك بەخت یاوەری ببوایەو دوای وانەوتنەوە پرۆفیسۆر رایسی ببینیایە، هەستی بەو جۆش و خرۆشە دەكرد كەبردبوویە ناو پۆلەوە. شێوازی قسەكردنی لەسەر ئەووانەیەی كە تازە لە وتنەوەی تەواو ببوو، بەڵگەی ئەوە بوو كە تا ئەو كاتەش تارادەیەكی زۆر سەرقاڵی بابەتی وانەكەیەتی". ئەو خوێندكارانەی كۆندی وەك راوێژكار بووە بۆیان، ئەو خانمەوادەناسێنن كە زۆر گرنگی پێداون. لەو بارەیەوە یەكێك لە دەرچووەكان دەڵێت: "هەرگیز ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەم بیرناچێتەوە كە لە نیوەڕۆیەكدا كۆندی بۆی تەرخانكردم و ٥٥ خولەكی خایاندو تایبەت بوو بەگفتوگۆكردن لەسەر رەشنووسی پرۆژەی تێزەكەم". یەكێكی تر لە كچە خوێندكارە دەرچووەكان، كۆندیوا وەسف دەكات كە "بەشێوەیەكی سەرسوڕهێن كارەكانی ئاساندەكرد، بەمانای كۆنی سوقرات بەڕاستی مامۆستا بوو، هەروەك كۆنترۆڵكردنی ڕێڕەوی گفتوگۆكانمان و دڵنیابوونی لەوەی كە لەكۆتاییدا دەگەینە تێگەیشتنی چەمكەكان، بەبەراورد لەگەڵ ئەو پرۆفیسۆرانەی ستانفۆرد كەمن دەمناسین، كارێكی ناوازەو سەرسوڕهێن بوو" كۆندی وەك نموونەیەكی نموونەیی كاریگەرییەكی هەمیشەیی لەسەر كۆمەڵێك خوێندكار كەئامادەی یەكێك لە ئەڵقەكانی زنجیرەوانەكانی بوون، جێهێشتووە. ئەم كچەخوێندكارە دەڵێت:"بەشێوەیەك مامەلەی لەگەڵ هەمومان دەكردوەك ئەوەی دڵخوازی بین. زۆرێك لە خوێندكاران لە كۆتایی ئەڵقەی زنجیرەوانەكەدا خۆزگەیان دەخواست ببنە كەسێكی وەك ئەو. ئەوە جۆرێك نەبوو لە پەرستنی پاڵەوان. ئاسۆیەكی فراوانی زانیاری هەبوو، بەڵام بیروبۆچوونەكانی خۆی نەدەسەپاند، پلەوپایەكی باڵای هەبوو، بەڵام لەخۆبایی نەبوو، وانەكانیشی ئاڵۆز بوون، بەڵام وشك نەبوون".

سێ ساڵ ئەزموونییەكەی تەواوبوو، لەكۆتاییدا زانكۆكە كارەكانی بەپۆزەتیڤ هەڵسەنگاندو وەك یاریدەدەری پرۆفیسۆر گرێبەستەكەی نوێكردەوە.

لەڕاستیدا کۆندی بووە یەکێك لە مامۆستا ناسراوو دیارەکانی زانکۆکە. بەهۆی سەرکەوتنی لەفێرکردندا لە ساڵی ١٩٨٤دا زانکۆی ستانفۆرد خەڵاتی واڵتەر جی گۆری پێدەدات کەگەورەترین خەڵاتی فەخرییە بدرێت بەمامۆستایانی زانکۆ. سەرۆکی زانکۆکە ئەلبێرت هاسترۆف لەدەستپێکی مەراسیمی رادەستکردنی بڕوانامەکاندا لە ١٧ی حوزەیران، ئاماژە بەگرنگی کۆندی دەکات و دەڵێت:"پەرۆشییەکی گەورەو تێگەیشتنێکی قوڵی لە وانەکانیدا هەبووەو توانیویەتی هەستی فزوڵیو سەرسوڕمانی لە خوێندکارەکانیدا دروستبکات". هاسترۆف باسی لەوەش کردووە کە کۆندی بە پێدانی "پشتگیریو هاندان و ئیلهامی بێسنور بۆ ئەو خوێندکارانەی ساڵی یەکەم کە داوای راوێژیان لێکردووە، ناسراوە".

کۆندی راوێژی پێویستی پێشکەش بەخوێندکارانی ساڵی یەکەمو ساڵی دەرچوون یش دەکرد. یەکێك لەو کچەخوێندکارانەی ئەو ئامادەیکردوون بۆ بڕوانامەی دکتۆرا، ئێستا ئەستێرەیەکی گەشی بواری سیاسەتی دەرەوەیە. جیندایی فرایزەر پاش ئەوەی لەسەرەتاکانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا، زانکۆی ستانفۆرد تەواودەکات، پۆستێکی فێرکردنی لە زانکۆکەی کۆندی واتە پەیمانگای دەرچوانی زانکۆی دێنیڤەر بۆ خوێندنی نێودەولەتی، بەدەستهێناوە. راهێنانی فرایزەروەك پسۆڕی بواری سیاسیەتی ئەفەریکی، پۆستی لێکۆڵەری لە زانکۆی نەیرۆبی لە کینیا بۆ مسۆگەر دەکات. زانکۆی هارڤاردیش لە ئینستیتیوی کەنەدی بۆ کارگێڕیی حکومی دەیخاتە سەر کارو دەیکاتە پرۆفیسۆری یاریدەدەر بۆ سیاسەتی گشتی. دواتر کۆندی کاتێك لە سەردەمی جۆرج دەبلیو بوشدا پۆستی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی وەردەگرێت، لەلایەن خۆیەوە جیندایی وەك پسپۆڕی تایبەتی کاروباری ئەفەریکیا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دادەمەزرێنێت. ئەو کاتە ناونیشانی فەرمی کۆندی یاریدەدەری تایبەتی سەرۆك بوو، هاوکات بەڕێوەبەرێکی باڵای کاروباری ئەفەریکا بوو.

ئەو هەڵسەنگاندنەی جۆزێف کۆربێڵ داینابوو ووتبووی کۆندی خاوەنی ماددەی خامی پرۆفیسۆرە زانکۆییە بەهرەدارەکانە، لەکاتی سەرکەوتن بەسەر

پلەپەیژەکانی خوێندن لە زانکۆی ستانفۆرددا، ئەنجامەکەی بەروونی دەرکەوت. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٨٧ پلەکەی بەرزکرایەوەو پۆستی پرۆفیسۆری بەشداری وەگرت لە ساڵی ١٩٩٣شدا بووە پرۆفیسۆری زانکۆ هەرچەندە تەمەنی تەنها ٣٨ ساڵان بوو. هەمان ساڵ بەهۆی سەرکەوتنییەوە لەبواری فێرکردندا، ڕێزلێنانێکی ناوازەی بەدەستهێنا کە خەڵاتی راگری ئنیستیتیوی مرۆڤایەتیو زانستەکان (الانسانیاتو العلوم) بوو. هاوشانی ئەو خەڵاتە پاداشتێکی ٥ هەزار دۆلاریو زیادکردنی بڕی ٥ هەزار دۆلار بۆ سەر موچەکەی، پێدرا.

لە ساڵی ١٩٨٤دا هاوڕێیەتییەکی پتەو کۆندیو هاوکارێکی بەناوی پرۆفیسۆر کویت پلاکەر، کۆکردەوە. پلاکەر لەسەرەتاکانی هەشتاکاندا وەك یاریدەدەری سیناتۆر گاری هارت کاریکردووە. ئەم دوو هاوڕێیە پێکەوە هەڵمەتی هەڵبژاردنی هارتو بیروباوەڕەکانی تایبەت بەچاکسازی لە سوپا تاووتوێدەکەن، کۆندی هەستدەکات ئەم بیروباوەڕانە جێگرنگی ئەون کویت، کۆندی بەسیناتۆر هارت دەناسێنێتو دەڵێت:"هارت بیروبۆچونو لێهاتوویی کۆندی بەمانای وشە بەهەند وەردەگرێت، منیش لەلایەن خۆمەوە رەهەندێکی ترم بۆ کۆندی زیادکردو ناومنا هێزی ناوخۆیی". کۆندی بەوپێیەی راوێژکاری سیاسەتی دەرەوە بوو، بۆ ماوەیەکی کورت یارمەتی هارت دەدات.

کۆندی سودی لە کارکردن لەگەڵ هارتدا دەبینێت بەوەی بیرۆکەیەك لەسەر هەنگاونانی سیاسەت بەرەو پراکتیزەبوون، وەردەگرێت، بەڵام یەکەم ئەزموونی راستەوخۆی لەگەڵ حکومەتدا ساڵی ١٩٨٦ بوو کەتێیدا ئەنجوومەنی پەیوەندییە دەرەکییەکان بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو دەینێرێت بۆ پێنتاگۆن. ئەم رێکخراوە کە ئەندامانی بێلایەن لەخۆدەگرێتو لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ ئەنجامدەداتو رۆژنامەی فۆرین پەلیسی دەردەکات ئەرکی "تێگەیاندنی ئەمەریکا بە جیهانو بەشداریکردن لە پێشکەشکردنی ئەو ئایدۆلۆژیایانەی لە بەرژەوەندی سیاسەتی ئەمەریکادان"ی لە ئەستۆدایە. ئەنجوومەنەکە واراهاتبوو کەساڵانە چەند چانسێکی زەمالەی بواری پرسە نێودەولەتییەکانی دابەشدەکرد کەتێیدا کێبەرکێ رۆڵی هەبوو. ئەم چانسانە رێگەیاندەدا بەپسپۆڕە زانکۆییەکان

کەکورسییەکانیان لەگەڵ بەرپرسانی حکومەتدا بگۆڕنەوە. ئەم ئۆفەرە چانسی شارەزابوون لەکاری حکومی دەدا بە لێکۆڵەران، هاوکات ڕێگەی بەبەرپرسانی حکومەتیش دەدا کارە ئەکادیمییەکانیان لەشوێنی کارەکانیاندا ئەنجامبدەن. جۆرج برینکڵی مامۆستای کۆندی لە زانکۆی نۆتردام پێشنیازی بۆ کۆندی کرد کەپێویستە هەوڵ بۆ ئەم هەلە بدات و خودی برینکڵییش یارمەتی کۆندی دا کە لەو ٢٠ کورسییەی ئەو ساڵە بۆ ئەکادیمییەکان تەرخانکرابوو، کورسییەکی بەریکەوێت. برینکڵی دەڵێت: "من هاوکاری ئەنجوومەنی پەیوەندییە دەرەکییەکان بووم و یەکێك بووم لەو چەند کەسەی داوامان کرد کۆندی ئەندامێتی ئەم ئەنجوومەنەی پێ بدرێت"

ئەوە هەلێکی نایاب بوو بۆ کۆندی کە بەناو ڕاڕەوەکانی سەنتەرەکانی هێزی سەربازیدا بگەڕێت. ئەم پۆستەی کەوەك یاریدەدەری تایبەتی بەڕێوەبەری سەرۆکایەتی ئەرکان، وەریگرت، ڕێگەی پێدەدات بچێتە ناو پێنتاگۆن، هاوکاتیش لەگەڵ دەستپێکردنی ریگان بەپرچەککردنی نوێی سوپا. لەماوەی سەرۆکایەتیی یەکەمی ریگاندا خەرجیی سەربازیی بەڕێژەی لە سەدا حەوت بۆ هەر ساڵێك زیادیکرد. سەرۆك ریگان دەستیکرد بەخۆئامادەکردن بۆ کۆبونەوەی لوتکەی سنووردارکردنی پرچەککردن لەگەڵ گۆرباتشۆفدا، ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ پەیوەندیکردنی کۆندی بەئیدارەکەیەوە. لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٦دا لوتکەی ئایسلەندا بەجوڵەیەکی بەرچاوو گرنگ دەستیپێکرد، هەردوو سەرۆك گەیشتنە ڕێککەوتننامەیەکی ئەزموونیی بۆ سەپاندنی سزای قەدەغەکردن لەسەر هەموو موشەکە بالیستییە ناوکییەکان بۆماوەی ١٠ ساڵ. هەروەها هەردوو سەرۆك لە چەند ڕوویەکی پەیوەندیدار بەمافەکانی مرۆڤیشەوە پێشکەوتنیان بەدەستهێنا. گۆرباتشۆف داوادەکات ریگان بەرنامەی بەرگریی موشەکیی ئاسمانیی، کە بە بەرنامەی شەڕی ئەستێرەکان ناسراوە، کەمبکاتەوە، لێرەوە گفتوگۆکان دەگەنە ڕێگەیەکی داخراو. ساڵی دواتر جارێکی تر هەردوو سەرۆك لەپێناو ئیمزاکردنی پەیماننامەی هێزە ناوکییە مەودا مامناوەندییەکان، کۆدەبنەوە کە بەپێی ئەم پەیماننامەیە سەرجەم ئەو موشەکانەی لە زەوییەوە هەڵدەدرێن (واتە نزیکەی

٢٧٠٠ موشەك)و مەوداكانیان لەنێوان ٣٠٠ میلو ٣٥٠٠ میلدان، لابرێن.

کۆندی پلاندانانی ناوکی دەخوێنێتو چێژ لەو کلتورە سەربازییە وەردەگرت کە لە پێنتاگۆن هەبوو. پێی‌وابوو کە ئەرکی ئەو لەوێ وردبوونەوەی واقعبینانە لەو کارە ئالۆزانەیە کە لەسوپادا هەنو هەستیکرد بەهۆی ئەوەوە رێزگرتن لە هێزە سەربازییەکانو سەرسامبوون پێیان، زیاتر قوڵدەبێتەوە. پرسی چەکە ناوکییەکان، کە لەو سەردەمانەدا ببووە سەردێری بابەتەکان، زۆر کاری تێدەکات، هەروەك بایەخی گرنگیدان بە ئەرکەکەیو ئەو ژینگەیەی کاری تێدادەکرد زۆر کاریگەربوو بۆی. دواتر سەرنجیدا کۆمەڵگەی ئەکادیمیو کۆمەڵگەی مەدەنی بەگشتی بەهەڵە لە پرسەکانی تایبەت بەبەرگریو سوپا تێگەیشتوون. هەروەك هەستی بەپێزانینێکی زۆریش کرد لەبەرئەوەی توانیویەتی بروانێتە ناوجەرگەی پێنتاگۆنەوە لەو بارەیەوە دەڵێت:"هەستم بەهەموو پێشوازییەك دەكرد، سەرنجم دا بەکارلێککردن لەگەڵ ئەکادیمییەکاندا، خۆشحاڵن". پاش ساڵێك لە گەڕانەوەی لە ئەرکەکەی لەپێنتاگۆنەوە بۆ زانکۆی ستانفۆرد، کۆندی دیدارێك ئەنجامدەدات تێیدا ئەم ئەرکەی بە "یەکێك لە گەورەترین ئەزموونەکانی ژیانم" ناودەبات.

پاش رۆیشتنی بۆ کالیفۆرنیا بەمەبەستی دەستبەکاربوونی لە ستانفۆرد، کۆندی بۆ جاری دووەم ماڵی دایكوباوکی بەجێدەهێڵێت. کارکردنی لە ستانفۆرد بەوە جیادەکرایەوە کە ماوەکەی لەو ساڵە زیاتربوو کە لە نۆتەردام بەسەریبردبوو، هەربۆیە هەستیکرد بەتەواوەتی لەژێر سایەی دایكوباوکی، پچڕاوە. پێشتر هەمیشە چوونی بۆ کڵێسە یەکێك بوو لە چالاکییە خێزانییەکانی، بەڵام دواتر لە ساڵی یەکەمیدا لە کالیفۆرنیا، کاتێك بەتەنها دەژیا، هەستدەکات ناتوانێت بەشێوەیەکی رێکخراو سەردانی کڵێسە بکات. سەرلەبەیانییەکی یەکشەممە کاتێك کۆندی لە دوکانێکی فرۆشتنی خواردەمەنیدا دەبێت، لەگەڵ پیاوێکدا دەکەوێتە قسە، پیاوەکە پێی دەڵێت پێویستی بەژەنیارێکی پیانۆیە بۆ کڵێسە بچووکەکەی. کۆندی بیردەکاتەوە کە زۆر خۆشحاڵ دەبێت ئەگەر ئەو کارە بکات، بەو شێوەیە مانگەکانی ساڵی

داهاتووی بەژەنینی پیانۆ لەو کلێسەیە بەسەردەبات. ڕۆژێکیان لە ساڵی ۲۰۰۰دا بەکۆمەڵێك کەس کە بۆ نوێژ لە دێنیفەر کۆببوونەوە دەڵێت: "گەیشتوومەتە ئەو تێگەیشتنەی کە دەستی درێژی خودا دەگاتە گشت ئەو کەسانەی جیهان، کە بەخت یاوەریانە"

لە شاری پالتۆ ئالتۆ، کۆندی چاوی دەکەوێت بە کچەهاوڕێیەکی سەردەمی منداڵی کەناوی دیبۆرا کارسۆنە. ئەم دوو هاوڕێیە زۆرجار بۆ قسەکردن لەسەر هاوڕێکانیانو خواردنی نانی نێوارە ، یان بۆ بازاڕکردن پێکەوە، کۆدەبوونەوە. کۆندی زۆر حەزی لە پێڵاوکڕین بوو، هەربۆیە هەستدەکات زۆر ئەو بازاڕە تایبەتەی بەدڵە کە لە گۆڕەپانی سان فرانسیسکۆدا هەبوو کەتێیدا نوێترین مۆدەی پێڵاوی بەناوبانگترین مارکە جیهانییەکانی تێدا نمایش دەکرا. دیبۆرا باس لەوە دەکات کە جارێکیان کۆندی لە تەنها سەردانێکدا بۆ ئەو بازاڕە ٨ جوت پێڵاوی لە مارکەی ڤیراگامۆس کڕیوە. پاش چەند مانگێکی کەم دیبۆراو کۆندی سەردانی هەمان بازاڕ دەکەنەوە، لەو کاتەدا سەرجەم فرۆشیارەکان توشی سەرسوڕمان بوون. دیبۆرا دەڵێت: "هەر کەچووینە ناو بازاڕەکەوە یەکێك لە فرۆشیارەکانمان لەوپەڕی بازاڕەکەوە بینی بەسەر کورسییەکاندا بازیدا بۆ ئەوەی بگاتە کۆندی!، ئەو ڕۆژە زۆر پێکەنینو بەکۆندیم وت: "کۆندی تۆ بەم کارەت دەیانکوژیت!" بێگومان فرۆشیارەکان لەنێوان خۆیاندا باسیان لەوە کردبوو کەهەر ڕۆژێك کۆندی سەردانیان بکات، ئەو ڕۆژە ڕۆژی خۆشحاڵییانە".

کۆندۆلیزا رایس بە بەردەوامی پارێزگاری لە بەرنامەیەکی چالاك دەکرد کە ڕاهێنانی بەهێزبوونی لەخۆدەگرتو لەلایەن چەند ڕاهێنەرێکی تایبەتی بەشی وەرزشی زانکۆی ستانفۆردەوە، سەرپەرشتی دەکرا. هاوڕێکانی واڕاهاتبوون لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر چاویان پێدەکەوت، بەڵام خۆی سووربوو لەسەر ئەوەی خودی خۆی ئەو پیاوانە هەڵبژێرێت کە چێژ لە هاوڕێیەتیکردنیان دەبینێت. کۆندی هاوڕێیەتی ڕاهێنەرێك لە زانکۆکەو میوانێکی دانپیانراوی کۆمپانیای فۆرچن ٥٠٠ کە لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتەوە پەیوەندی بە زنجیرەوانەکانی خوێندنی زانکۆی ستانفۆردەوە کردبوو لەگەڵ چەند کەسێکی تر، دەکرد. بەهەرحاڵ یاری

فوتبۆڵ ئەویندارییە خوازراوەکەی کۆندی بوو و باس لەوە دەکرێت کە درێژترین ماوەی هاورێیەتی لەگەڵ یاریزانێکی یانەی فۆرتی نایزەر بووە بەناوی جین واشنتۆن. ئەو پیاوە زانکۆی ستانفۆردی تەواوکردووەو لە ساڵی ۱۹٦۹ تا ۱۹۷۷ یاری بۆ یانەی سان فرانسیسکۆ کردووە. واشنتۆن لە چەند رۆڵێکی دیاردا وەك ئەستێرە دەرکەوتووە کە هەندێکیان خودی خۆی رۆڵەکەی بەرجەستەکردووە، هەروەها لە چەند فیلمێکی تەلەفزیۆنیدا لەوانە ئەڵقەکانی ساڵی ۱۹۷۲ لە باناسیك دەرکەوتووە. ئەم پیاوەو کۆندی لە دوو لایەنی سەرەکیدا هاوبەش بوون، هەردووکیان حەزیان لە فوتبۆڵ بوو، هەردووکیشیان لەبیرمنگهامەوە هاتبوون. کارسۆن دەڵێت: "هەردووکیان ماوەیەکی زۆر هۆگری یەك بوون بەشێوەیەك کاتێکیش لەیەك جیابوونەوە وەك هاورێ مانەوە واراهاتبوون کە پێکەوە لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکان لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر ئامادەدەبوون" ئێستا جین یەکێکە لە بەرپرسە باڵاکانی یەکێتی نیشتمانی بۆ تۆپی پێ‌و بەرێوەبەری کارەکانی تۆپی پێیە.

فوتبۆڵ جێگەیەکی بەرچاوی لەکاتی کۆندی گرتووە تەنانەت جارێکیان لەو بارەیەوە وتویەتی ئەگەر رومالکردنی تەلەفزیۆنی بۆ بابەتەکانی تر نەبوایە، ئەوا کاتێکی زیاتری بۆ ئەو یاریە تەرخان دەکرد.

کۆندی وتاری بەشەیدابوونەوە دەنووسی‌و لە رۆژنامەو چاپەمەنییە سەرەکییەکاندا بڵاویدەکردنەوە. لەکاتێکیشدا لە زانکۆی ستانفۆرد بوو سێ کتێب دادەنێت، یەکەمیان ناوی **هاوپەیمانی تەمومژاوی.. یەکێتیی سۆڤیەت‌و سوپای چیکۆسلۆڤاکیا** بوو، کە هەروەك لەبەشی پێشوودا باسمان کرد، فراوانکردنی تێزی دکتۆراکەی بوو. کتێبی دووەمی ناوی **چەرخی گۆرباتشۆف** بوو کە بریتییە لە کۆمەڵێك وتار سەبارەت بەمێژووی روسیاو سۆڤیەت کە لەگەڵ ئەلیکساندەر دالین پێکەوە نووسیویانە، کە لە زانکۆی ستانفۆرد پرۆفیسۆری بواری مێژووی نێودەوڵەتی بوو، دالین لێکۆڵەرێکی دیاری بواری لێکۆڵینەوە لەسەر سۆڤیەت‌و ئەوروپای رۆژهەڵاتیشە. خزمەتگوزارییە چاپەمەنییەکانی دەرچووانی زانکۆی ستانفۆرد ئەم کتێبەی لە ساڵی ۱۹۸٦دا بڵاوکردووەتەوە.

کتـێبی سـێیەمی کۆنـدی ئـەڵمانیای یـەکگرتوو و ئـەورووپای گـۆڕاو: لێکۆڵینەوەیەك لە هونەری حوکمڕانیدایە کە بەهاوبەشی لەگەڵ فیلیپ زیلکاو نووسـیویەتی، کـە لـە سـەردەمی دوبـارە یەکگرتنـەوەی هـەردوو ئـەڵمانیادا ئەندامێکی ئیدارەکەی بوشی باوك بووە. چاپخانەی زانکۆی هارڤارد ئەم کتێبەی لە ساڵی ١٩٩٥دا بڵاوکردووەتـەوەو کاتی خـۆی پێشـوازییەکی باشـی لێکراوەو بـە تێڕوانینێکی وردبینانە بۆ پرۆسەی یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا لەقەڵەم دەدرێت. ئەم دوو دانەرە سودیان لە ئەزموونی خۆیان لەو ماوەیـەداو ئـەو هـەزاران بەڵگەنامـە حکومییـە نهێنییانـە وەرگرتـووە کـە جـێ پەنجـەی خۆیـان جێهێشـتووە. لێـرەدا پارچـەیەکی کاریگـەر لـەو کتێبـە وەردەگـرین سـەبارەت بـەو ڕۆژەی کـە دیـواری بەرلینی تێدا ڕوخا:

"کردنەوەی دیواری بەرلین بەبۆنەیەکی سۆزداریی ورووژێنەر لەقەڵەمدەدرێت کە جیهانی توشی شۆك کرد، ڕوداوێك بوو کە جیهـان لـە مـاوەی چـەندین سـاڵی رابـردوودا بەخۆیـەوە نـەیبینیبوو. هەرچـەندە ڕوخـانی دیـواری بـەرلین چـەند پرسیارێکی بەپەلـەی لەسـەر سیسـتمی نـوێی جیهانی پـاش جـەنگەو داهـاتووی ئەڵمانیا ورووژاند، بەڵام ئەم پرسیارگەلە لەڕووی گرنگییەوە تـەنها شـتێك نـەبوو کە لەو سەردەمەدا باوو بوو. چەندین وێنەی کاریگەر دەرکەوتن کە گوزارشـتیان لە زاڵبوونی ئەڵمانیا بەسەر دابەشکردندا دەکرد، ئەم وێنانە چەندین ڕەهەنـدی مرۆڤایەتییان وەرگرتبوو و دووبارە بەیەکترشادبوونەوەی چەندین خانـەوادەیان پاش چـەندین سـاڵ لـە لێکجیابوونـەوە، دەگێڕایـەوە. جیهـان بـۆ یەکـەمین جـار گوزرشتی سەر دەموچاوی هاوڵاتییە ئەڵمانییـە ڕۆژهەڵاتییـە شـلەژاوەکانیان بـینی کـە بۆیەکـەمین جـار ڕووبـەڕووی ئـەو دیاردانـەی تایبـەت بەدەوڵەمەنـدیی دەبوونـەوە کـە ئەڵمانییـە خۆرئاواییـەکان بـەکارێکی لێبێبەشـکراویان لەقەڵـەم دەدا. ڕۆژهەڵاتییەکان بەچاوی خۆیان چەندین جۆر کاڵایـان بینی کـە پێشـتر لـە شاشەی تەلەفزیۆنەکانی ئەڵمانیای خۆرئاواوە نەبێت نـەیان بینیبـوو. سـەرباری ئەوەش هەستە نەتەوەییەکانو ئینتیما بۆ نەتەوەی ئەڵمانیا بەزەقی دەرکەوتو لـەناخی سـەرجەم ئەڵمانییـەکانی هـەردوو بەشـە دابەشـکراوەکەی ئـەڵمانیادا

تەقییەوە. تەنها لە حەفتەی یەکەمدا نزیکەی ٩ ملیۆن کەس لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە سەردانی بەشە خۆرئاواییەکە دەکەن.

ئەم کتێبە لەگەڵ دوو کتێبی تردا خەڵاتی ئەگیرا ئیرییە بۆ کتێبی نێودەولەتی مێژوویی لە ماوەی ١٩٩٤-١٩٩٥ بەدەستدەهێنن. ئەم خەڵاتە ڕێزلێنانێکە کە دامەزراوەی پاسفیك کویست وەك داننان بەسەرکەوتن لە لێکۆڵینەوەی بواری مێژووی جیهانیدا دەیدات بەو کەسانەی بەدەستیدەهێنن. لەلایەکی ترەوە کتێبی ئەڵمانیای یەکگرتوو خەڵاتی کتێبی ناوازەی بۆ دیبلۆماتی ئەمەریکی بەدەستهێنا، هەروەك ئاماژەی سەرکەوتنی بۆ کتێبی واقعی تایبەت بەکاروباری نێودەولەتی بەدەستهێنا کە ئاماژەیەکە یانەی نێودەوڵەتی لە ئەمەریکا دەیبەخشێت.

کۆندی هەستدەکات کە پەرۆشیی بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر سۆڤیەت و فێرکردن و ژیانی لە ستانفۆرد لە چەند ئاستێکدا دەوڵەمەندە. چەندین ئەرکی جیاجیای هەبوو لەوانە وانە وتنەوە، ئامۆژگاری پێشکەشکردن، ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە، نووسین، ژەنینی پیانۆ، ڕاهێنانی کێشی قورس، ڕاهێنانی وەرزشیی، هاوڕێیەتیکردن و بەشێوەیەکی ئێجگار زۆریش لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە سەیری یاری فوتبۆڵی دەکرد. لە ساڵەکانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا ڕێڕەوی ئەکادیمیی کۆندی دوو گۆڕانکاریی گەورە بەخۆوە دەبینێت. یەکەمیان ئەوەبوو کە بەپیر ئەو بانگهێشتەی واشنتۆنەوە چوو بۆ وەرگرتنی پۆستێك لە کۆشکی سپی، دووەمیشیان بازێکی گەورەبوو لە پلەپەیژەی ئەکادیمیدا.

# بەشی حەوتەم

## بوشی باوک

**کونـدی کەسـێکی لێهـاتوو بـوو، بـەوە جیادەکرایـەوە کـە خـاوەنی سـتایل‌و ئامادەبوونێك بوو دەیتوانی بەهۆیانەوە گەورەترین کەسایەتی چەك بکات، بۆ؟ لەبەرئەوەی ئەو کەسایەتییانە دەیانزانی کۆندی سەبارەت بە چی قسەدەکات.**

### جۆرج بوشی باوک– سەرۆکی پێشووتری ئەمەریکا

لە سالّی چوارەمیدا لە سـتانفۆردو لـە ڕۆژێکـی تایبـەت بەدەرچووندا داوا لـە کۆندی دەکرێت قسە بۆ دەرچوانی زانکۆکە بکات کۆندی. پرۆفیسۆری یاریـدەدەر، کە لەتەمەنی سی سالّیدا بوو، ڕێـك وەك ئـەو کچـە خوێندکارانـەی لەتەمـەنی ٢٢ سالّیدابوون دەردەکەوت، بەلاّم ئەو ئامۆژگارییانـەی کۆنـدی کردنـی دەریخسـت کـە خـاوەنی شـارەزاییەکی قولّـە. لەسـەر ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو کێشـانەی لـەکاتی شەڕی ساردا بەجیهانەوە لکاون، قسەیان بۆ دەکات بـەلاّم تێیـدا قـولّ نابێتـەوە، هەر بەشداریکردنێك لـە چارەسـەکردنی ئـەو کێشـانە ئەگەرچـی بچووکیش بێـت بـەگرنگ لەقەلّەمـدەدات. لـە وتـاری ئـەو ڕۆژەی کۆندیـدا هـاتووە: "ئـەوەی لەسەرتانە بەرامبەر بـەو کێشـە گـەورەو زەبـەلاح‌و مەترسـیدارانەی ڕووبـەڕوومان

دەبنەوە، ئەوەیە کە پشکێك پێشکەش بکەن بۆ چارەسەکردنیان، بەڵام ئەگەر لەبری پێشکەشکردنی پشکێك بۆ چارەسەکردنی کێشەکان، پێداگریی زۆرتان لەسەر چارەسەکردنی کێشەکە کردەوە، ئەو کاتە مەترسی ئەوە هەیە هەست بەبێتوانایی لەبەرامبەر گەورەیی ئەرکەکە بکەن‌و ناتوانن هیچ کارێك بکەن. دەڵێن کات بەسەر هەمواندا هەنگاودەنێت. زۆرچاکە، رەنگە لەم وتەدا کەمێك راستی هەبێت... هەموو ئەوەی لەتواناماندایە بیکەین ئەوەیە کە هیوادارین کاتمان هەبێت‌و بەجێگیری کاریکەین بۆ ئەوەی گرەنتی ئەوە بکەین کە بەباشی سودمان لە کاتەکەمان وەرگرتووە"

سەبارەت بە کۆندی، سودوەرگرتن لەکات خزمەتگوزاریی گشتی لەخۆدەگرێت. کۆندی لە بیرمنگهام گەورە بووە، دایك‌وباوکی بینیوە کە چۆن ژیانیان بۆ منداڵان تەرخان کردووە جا لە دەرەوەی پۆلەکانی خوێندن بێت یان لەناوەوە. ستراتیژیەتی ئەم دایك‌وباوکە بۆ رووبەڕووبوونەوەی نادادوەریی لەکۆمەڵگەدا، خۆی لە پڕچەککردنی تازەپێگەیشتووان بە متمانە، زانست، بەرەخساندنی هەل لەبەردەمیان دەبینییەوە. دایك‌وباوکی بەئارامگرتن‌و بەردەوامیی‌و سوربوون لەسەر ئامادەکردنی تازەلاوان بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم جیهانە ستەمکارە، خۆیان رازاندبوویەوە. ئەم هەست بە بەرپرسیارێتیکردن‌و پابەندبوونە لەناخی کۆندیدا چێنراوەو هیواخوازیوو ئەو زانیارییەی هەیەتی بیکاتە پشکێك بۆ کارەکانی ئەو بڕیارانەی ئاسایشی نەتەوەییان لێ پێکدەهێنرێت.

لەو ساڵەی کە کۆندی لەپێنتاگۆندا بەسەربرد بیرۆکەیەکی لەسەر چۆنیەتی گۆڕینی سیاسەت بۆ کردار پێ بەخشی، خۆشی کەسێکی پەرۆش بوو بۆ ئەوەی دەستی لەم پرۆسەیەدا هەبێت. کۆندی گرنگی نەدەدا بەسیاسەتی حیزبیی بەڵام توانی ژیانی ئەکادیمی بۆ لێکۆڵینەوەی چارەسەرکردنی قەیران‌و ستراتیژییە سەربازییەکان بگۆڕێت. هیواخوازبوو رۆژێك لە رۆژان ئەم چانسەی بۆ رێبکەوێت کە شارەزاییەکەی لە واشنتۆن بەکاربهێنێت. لەم کاتەدا کۆندی سەرقاڵی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگە تایبەتەکەی دەبێت لە ستانفۆرد، کالیفۆرنیا.

له ساڵی ١٩٨٦ کۆندی پەیوەندی دەکات بە ئەنجوومەنی ئیدارەی یەکێتیی ناوەندی نیمچەدورگەی ستانفۆرد، کە ڕێکخراوێکبوو لە بوارەکانی تەندروستی، نیشتەجێکردن، فێرکردنو دامەزراندنی کۆمپانیای بچووکو چەندین پرسی تردا پارمەتی کەمینەکانی دەدا. یەکێتییەکە بەشێوەیەکی تایبەتی پارمەتی بەڕێوەبردنی ئەکادیمییەکانی نیمچە دورگەکەی دەدا کە ئەمیش لەلایەن خۆیەوە ڕاهێنانی پیشەیی و ئەکادیمی پێشکەش بەو خوێندکارانە دەکرد کە ڕووبەڕووی مەترسی وازهێنان لە خوێندنی دواناوەندی دەبوونەوە. ئەم ئەکادیمیایانە لە ساڵی ١٩٨١ بەئامانجی باشکردنی ئاستی خوێندکارانو یارمەتیدانیان بۆ بەدەستهێنانی پلەیەکی بەرزترو پەرەپێدانی هەڵوێستە پۆزەتیڤەکانیان بەرامبەر زاستو دابینکردنی زانیاری لەسەر کارو بەرپرسیارێتیی بۆیان دامەزراون لەپێناو بەباشی ئامادەکردنیان بۆ کارکردن یان بۆ زانکۆ. جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ بیرمنگهام، لەوێ جۆن رایس لە سەردەمی لاوێتیدا هەوڵیدەدا لە ڕێگەی بەرنامەی پارمەتیدانی نەوجەوانانەوە کە لە کڵێسەی وێست مینستەر دایهێنابوو، هەمان شت بکات. شایانی باسە کۆندی بۆ ماوەی سێ ساڵ لە ئەنجوومەنی کارگێڕیی یەکێتییەکە مایەوە.

لە ساڵی ١٩٨٨ کۆندی بەسەرۆکی ڕێکخراوێکی تری تایبەت بەهاندان بۆ زاست بەناوی KQED هەڵبژێردرا کە تۆڕێکی پەخشی گشتی بوو لە سانفرانسیسکۆدا. ئامانجی ئەم تۆڕە تەلەفزیۆنیو ڕادیۆییە هاندانبوو بۆ "فێرکردن تا مردنو هێزی ئایدۆلۆژیاو گرنگی ڕاژەی گشتیو بەشداریکردنی شارستانیانە". کۆندی لە نامەی کاندیدکردنیدا بەم شێوەیە باسی ئەو پێشمەرجانە دەکات کە بەدیدی ئەو دەتوانن خزمەت بە ئەنجوومەنی ئیدارەی تۆڕەکە بکەن:

**ڕادیۆو تەلەفزیۆن ڕۆڵێکی گرنگو ڕەنگە گرنگترین ڕۆڵ ببینن لە ناساندنی ئەو کێشەو هەلانەی ئێمە وەك بەرپرسەکان ڕووبەڕوویان دەبینەوە، بە ئەمەریکییەکان. پێویستە وەك نوێنەری بەرپرسی جەماوەری بینەر، بڕوانینە ئەندامانی ئەنجوومەنی کارگێڕی، واتە پێویستە ئەوان چێژ لە توانای**

دیــاریکردنی ئــەو بوارانــە وەربگــرن کــە لــە ڕێگەیانــەوە پەخشــی گشــتی ئەنجامـدەدرێت، پێویسـتە جیـاوازی لـەلای بیسـەرانیان دروسـتببێت ئـەویش لـە ڕێگـەی زانیـاریو دۆزینـەوەی بیرۆکـەوە، ئەمـەش هـەڵقوڵاو لـە بیروبۆچـوونی جیــاوازەوە ئــەنجام بــدەن. بەڕاســتی ناوچــەی دورگــەی ســان فرانسیســکۆ کۆمەڵگەیەکی نێودەوڵەتییە کەپشـکێکی گـەورەی داهاتووی ئـابوریو سیاسـیی ئەمەریکای لە جیهاندا لە ئەستۆدایە. پێویستە لەسەر KQED بۆ پەرەپێدانی بەرپرســیارێتییەکەی، چــەندین بەرنامــەی هاوتــەریب پێشــکەش بکــات. وەك پرۆفیسۆرێکی سیاسەتی نێودەوڵەتیو پرسـی یـەکێتیی سـۆڤیەت، بەشێوەیەکی تایبەتی هەستدەکەم پابەنـدم بەرووبەڕووبوونـەوەی ئـەم تەحەددایـە. دەتـوانم گرنگیدانو شارەزایی لەم پرسە گرنگانەدا بۆ ئەنجوومەنی کارگێڕیی بهێنم".

کۆندی بۆ سـەرۆکایەتیکردنی ئەنجوومـەنی کـارگێڕیی هەڵدەبـژێردێت، بـەڵام پاش تەنها مانگێك پۆستێکی لە ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی لـە واشـنتۆن وەردەگرێــت. بــەوەش کۆنــدی پــێش ئــەوەی چانســی ئامــادەبوونی تــەنها کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی کارگێڕیشی هەبێت، دەست لەکاردەکێشێتەوە.

لـە گـەرەکی ناوچـەی کەنـداو کـە تێیـدا داوای لێکـرا وتارێـك لـە یانـەی کۆمۆنوێلس پێشـکەش بکـات، کۆنـدی دەتوانێـت سـەرنجی جەماوەرێکی فراوانـی بینەران بەتـەواوەتی رابکێشـێت. یانەکـەش تایبـەت بـوو بـەتاووتوێکردنی پرسـە گشــتییەکانو ســاڵانە لــەپێناو دۆزینــەوەی ئاســۆی سیاســیو کۆمەڵایــەتیو رۆشنبیریو چەندین پرسی هەنوکەیی تردا، میوانداریی سەدان کـەس دەکـات. لـە ساڵی ١٩١١دا ئـەم یانەیـە بـە پێشکەشـکردنی زنجیرەیـەك گفتوگۆی گشـتی لەگـەڵ تیدی رۆزڤێلت دەستپێدەکات، دواتـریش لـە لیسـتی ئـەو کەسـانەی لـەوێ وتاریـان پێشکەشــکردووە چــەندین کەســایەتی سیاســیو نیشــتمانیی لــەخۆگرتووە وەك مارتن لۆسەر کینگی کوڕ، رۆناڵد ریگان، ئیریـن برۆکـۆڤیچو بیـڵ گـەیتس. لـە ٩/٥/ ١٩٨٨ لە چوارچێوەی بەرنامەی یانەی فرایدەی لانشۆن لە ئوتێل شیراتۆن پالاس لــە سانفرانسیســکۆ، کۆنــدی وتارێــك بــەناوی پەیوەندییــە ئەمــەریکی-ســۆڤیەتییەکان: چــەرخی گۆرباتشــۆف پێشکەشــدەکات. وتارەکـە لـە ڕێگـەی

گواستنەوەی رادیۆیی راستەوخۆوە بەسەرتاسەری ولاتدا بلاوكرایەوە.

پرۆفیسۆر رایس كە لەوكاتەدا تەمەنی ٢٣ ساڵبوو، لەمیانەی بەرنامەی گفتوگۆكانیدا دوو وتار پێشكەش دەكات. لە نۆڤەمبەری ١٩٨٧دا رایس وەك لێكۆڵەرێكی میوان بۆ ماوەی چەند رۆژێك بۆ زانكۆی مێشیگان لە ئان ئاربور بانگهێشت دەكرێت. لەویَ كۆندی چەند وانەیەك پێشكەش دەكات و سەرۆكایەتی زنجیرەوانەیەكی خوێندنی خوێندكارانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی روسی و ئەوروپای رۆژهەلات دەگرێتەدەست كە سەر بەزانكۆكەبوو، وتارێكیش سەبارەت بە گۆرباتشۆف پێشكەش دەكات. لە بەهاری داهاتوواو بەدیاریكراوی لە نیسانی ١٩٨٨دا كۆندی سەردانێك بۆ یەكێتیی سۆڤیەت ئەنجامدەدات و لەویَ وتارێك لە بارەگای حەوانەوەی بالیۆزی ویلایەتە یەكگرتووەكان پێشكەش دەكات.

خواستی راستگۆیانەی كۆندی بۆ ئەنجامدانی رازەی كۆمەلایەتی ئەو پالنەرەبوو كە هانی دەدا چالاكی لەو ژینگەیەدا ئەنجامبدات كەتێیدا دەژیا. هاوكارەكانی لەم تایبەتمەندییەی كۆندی بێئاگا نەبوون. لەم بارەیەوە جۆن رازیان كە بەرێوەبەری دامەزراوەی هۆڤەرە لە ستانفۆرد دەلێت: "من خەلكی بۆ دوو جۆر پۆلێن دەكەم. جۆری یەكەمیان گرنگی بەو سیاسەتانە دەدات كە رێكخراوێكی دیاریكراو پەیرەویان دەكات و بەشێوەیەكی ستراتیژی لەكاتی سەركەوتنی بە پلەپەیژەی پیشەییدا، بیردەكاتەوە، جۆری دووەمیش ئەوەیە كە بە چاوپۆشین لەو شوێنەی كە چانسەكە بۆی دادەنێت لەو پلەپەیژەییەدا، دەڕاونێتە چانسی هێنانەدیی شتی جیاواز. پێمەوایە كۆندی سەربە جۆری دووەمە". ئەم پیاوە پێی وایە كۆندی لەو جۆرە كەسانەیە كە ئەگەر لەیەك كاتیشدا چەندین كار جێبەجێ بكەن سەركەوتنێكی بەرچاو بەدەستدەهێنن، كۆندی وێڕای فێركردن و نووسین و ئەنجامدانی لێكۆلینەوە، "هەمیشە خاوەنی گرنگیپێدان و توانای راوێژكاریی بووە.. ئەو زۆر سەرقال بووەو بەرنامەی كاری هەمیشە بەردەوامیی پێوە دیاربووە"

لە سالی یەكەمیدا لە ستانفۆرد بەرنامەكەی بەتێروتەسەلی دەستپێدەكات، واتە كاتێك دەستدەكات بە بەشداریكردن لە چالاكییەكانی چەند لیژنەیەكی

زانکۆیی‌و چەند ڕێکخراوێکی کارگێڕیی تێردا. چالاکییەکانی لە لیژنەکان پەیوەندیکردن بەلیژنەی ئاراستەکردنی سەنتەری خزمەتگوزاریی گشتی، لەخۆدەگرت کە لە دوو ماوەدا سەرۆکایەتی ئەم لیژنەیەی کردووە: یەکەمیان لە ساڵی ١٩٨٧و ماوەی دووەمیشیان لە ساڵی ١٩٩١ەوە بۆ ١٩٩٩ درێژەی کێشا. کۆندی پەیوەندیشی کردووە بەلیژنەی وەرگرتنی خوێندکارانی نوێ‌و یارمەتییە داراییەکان کە بۆ دوو ماوەش سەرۆکایەتی ئەم لیژنەیەی کردووە. ماوەی یەکەم لەنێوان هەردوو ساڵی ١٩٨٢و ١٩٨٥دا بوو، دووەمیش لەنێوان هەردوو ساڵی ١٩٨٨و ١٩٨٩دا بووە. هەروەها لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٨ بۆ ١٩٨٩و ١٩٩١ بۆ ١٩٩٣ پەیوەندیکردووە بەلیژنەی جێبەجێکاری ئینیستیتیوی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتییەوە. هەروەك پەیوەندیشی کردووە بەلیژنەی کارگێڕیی دەرچوان لەنێوان هەردوو ساڵی ١٩٩١و ١٩٩٢دا سەرۆکایەتی کردووە. کۆندی وەك بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەی دەرچوونیش کاری کردووەو لە ساڵەکانی ١٩٨٨و ١٩٨٩ ئەندامی ئەنجوومەنی راوێژکاریی کۆلێژ بووە. ئەنجوومەنی راوێژکاریی کۆلێژ کارە کارگێڕییە ناوخۆییەکانی زانکۆی هەر لەدانانی سیاسەتی زانکۆوە تا دەگاتە یاسادان‌و بنەمای نوێی تایبەت بەپرۆگرامەکانی بروانامەی زانکۆیی، جێبەجێدەکات. دواتریش پشنیازەکانی ئەنجوومەنی راوێژکاریی بۆ ئەنجوومەنی ئەمینداران بەرزدەکرێتەوە بەمەبەستی پەسەندکردنی.

لە ساڵی ١٩٨٥دا کۆندی بەخشیشێکی نەتەوەیی لە پەیمانگای هۆڤەر لەسەر بابەتەکانی جەنگ، شۆڕش‌و ئاشتی بەدەستدەهێنێت کە بەپێی ئەو دەستکەوتە ڕێگەی پێدرا ماوەیەکی کەم لەناو هۆڵەکانی خوێندندا لە کارەکەی پشوودات بۆ ئەوەی ساڵێکی تەواو بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە تەرخان بکات. ئەم پەیمانگایە لە ساڵی ١٩١٩ لەسەر دەستی هێربەرت هۆڤەر دامەزراوەو یەکێکە لە ناوەندە سەرەتاییەکانی لێکۆڵینەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەم پەیمانگایە توانیویەتی یەکێك لە گەورەترین ناوەندەکانی بەڵگەنامەو کتێبخانەکان لەجیهاندا کۆبکاتەوە کە هەموویان تایبەتن بەپرسە سیاسیی‌و ئابوری‌و کۆمەڵایەتییەکانی سەدەی بیستەم. ئەم ئینیستیتیوتە لەمیانەی باسکردنی

ئامانجەكانیدا خۆی بەرێكخراوێكی تایبەت بەلێكۆڵینەوە دەناسێنێت كە پابەندە بە"هێنانەكایەی ئەو ئایدۆلۆژیایانەی شێوەی كۆمەڵگەی لیبراڵ دیاریدەكەن... و بەشداریكردن لەو هەوڵانەی ئامانجیان دەستبەركردنی ئاشتیو پاراستنیەتی، ئەمە سەرەڕای باشكردنی رەوشی مرۆڤایەتیو سنوردانان لە دەستێوەردانی حكومەت لە ژیانی تاكەكاندا".

ئەم پەیمانگایە چانسی لێكۆڵینەوە بۆ لێكۆڵەران پێشكەشدەكات لەوانە پرۆگرامی نەتەوەیی زەمالە كە پشتگیری ئەو لێكۆڵەرە نوێیانە دەكات كە پرۆژەی لێكۆڵینەوەكانیان كۆتایی پێدەهێنن. لەو ساڵەدا كۆندی بۆ بەدەستهێنانی ئەو بەخشیشە هەڵبژێردراو یەكێكیش بوو لەو چواردە كەسەی لە سەرتاسەری وڵاتدا ئەو مینحەیەیان پێدرا. دواتر كۆندی دووبەخشینی تر لە دامەزراوەی هۆڤەرەوە وەردەگرێت كە لەو ساڵانەی لەستانفۆرددا بەسەریبردن، بەدەستیهێنابوون. كۆندی هاوڕێ لەگەڵ ئەلیكساندەر داڵان كتێبی چەرخی گۆرباتشۆف تەواودەكات كە یەكێكە لە سێ كتێبەكەیو ئەم كتێبەی وەك بەشداربوویەكی پرۆگرامی نەتەوەیی زەمالە نووسیبوو. شایانی باسە كاتێك داڵان لە تەموزی ٢٠٠٠ كۆچیدواییكرد، پرۆفیسۆری فەخریی بابەتی زانستە سیاسییەكان بوو لە ستانفۆرد. هاوكارەكانی لە سەنتەری لێكۆڵینەوەی روسیو سۆڤیەتیی سەر بە زانكۆكە بە"زانایەكی ناوازەو ئەو جۆرە مرۆڤانەی بەبوونی دانایی ناسراون"وەسفی دەكەن. كۆندی پێیوایە تەنها كاركردنی لەگەڵ داڵان لە دانانی ئەو كتێبەدا خۆی لەخۆیدا سەربەرزییە بۆ ئەو. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە داڵان یەكێكبوو لە پسۆڕە یەكەمینەكانی وڵات لە كاروباری یەكێتیی سۆڤیەتو هاوكات یەكێكیش بووە لەدەرچووە سەرەتاییەكانی پەیمانگای روسی تایبەت بەزانكۆی كۆڵۆمبیا.

كتێبی چەرخی گۆرباتشۆف بەوە جیادەكرێتەوە كەپێكهاتووە لە كۆمەڵێك وتاری چەندین كەسایەتی دیاری بواری لێكۆڵینەوە لەسەر سۆڤیەتو لەنێویشیاندا چەندین نووسەری ستانفۆرد هەن. ئەم وتارانە لەمیانەی بەرنامەیەكی هاوینە كە لە هاوینی ١٩٨٥ لە ستانفۆرد پێشكەشكرا، دەركەوتن.

کۆندی وێڕای بژارکردنی کتێبەکە، بەدوو وتار لەم کتێبەدا بەشداریکردووە. دوو وتارەکەی کۆندی ناویان **پەرەسەندنی هێزی سەربازیی سۆڤیەت‌و سیستمی هاوپەیمانێتیيە سۆڤیەتییەکان** بوون. دالانیش بەدوو وتار بەشداری لەکتێبەکەدا کردووە بەناوەکانی **میراتی رابردوو، ئایا پلانێکی ناوازەی سۆڤیەتی لە ئارادیە؟ و پلانە مەزنەکەی بوونی نییە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.**

هەروەها هاوسەری دالان کە ئەمیش پسپۆرێکی بواری کاروباری سۆڤیەتەو لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە بێرکلی کاردەکات، دوو وتاری لەکتێبەکەدا هەیە. هاوسەری دالان بەم شێوەیە باس لە دەستپێکی ئەم پرۆژەیە دەکات: "یەکێتی دەرچووانی ستانفۆرد داوایان لە ئەلیکس کرد کە زنجیرە وانەیەك بنووسێت بۆ ئەوەی لە پرۆگرامی هاوینەی یەکێتییەکە پێشکەشیان بکات، ئەو کاتە هێشتا چێرنینکۆ سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی بوو. لەو کاتەی وانەکان پێشکەشدەکران گۆرباتشۆف دەسەڵات لەوڵاتەکەیدا دەگرێتەدەست. گۆرباتشۆف ئەرکە نوێکانی بەئەنجامدانی چەند گۆڕانکارییەکی گرنگ لە یەکێتیی سۆڤیەت دەستپێدەکات. بەشەکانی کتێبەکە باس لە سروشتی ئەو قەیرانە جیاوازانە دەکەن کە رووبەرووی رژێمی سۆڤیەت دەبنەوە، لەوانە قەیرانی ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، سەربازیی، یان سیاسەتی دەرەوە. هەروەها ئەم کتێبە بە یەکێك لە هەوڵە سەرەتاییەکان لەقەڵەم دەدرێت کەبەشدارییان لە پێشبینیکردنی ئەو رێڕەوانەدا کردووە کە رەنگە سیاسەتی سۆڤیەت لەژێر سایەی حوکمی گۆرباتشۆفدا پێیاندا بڕوات" دکتۆر لابیدۆس لە نووسینی دوو بەشی ئەم کتێبەدا بەشداریکردووە ئەوانیش: **کۆمەڵگەی سۆڤیەت لە ماوەی گۆڕانداو پرسی نەتەوەیی سۆڤیەتن.** د.لابیدۆس باس لەوە دەکات کە کۆندی زۆر بەرێکوپێکی کاری لەگەڵ مێردەکەیدا دەکرد هەرچەندە لەرووی سیاسەتەوە بیروبۆچوونیان جیاوازبوو. لەو بارەیەوە دەڵێت: "زۆر ئاشکرابوو کە ئەو دوانە کاروباری نێودەوڵەتی‌و یەکێتیی سۆڤیەتیان لە دوو دیدی سیاسیی جیاوازەوە تاوتوێ دەکرد، بەڵام ئەم جیاوازییانە نەدەبوونە کۆسپێك لەبەردەم رێگای پەیوەندییە کەسایەتی‌و دۆستانەکەی نێوانیاندا، سەرباری ئەوەش لەکاتێکدا دالان کۆچی

دوایی کرد، کۆندی لەمیانەی ئەو نوێژە یادەوەرییەی کە لە باخچەکەمان بۆمان ڕێکخستبوو بەلاوانەوەیەکی زۆر کاریگەر بەشداری کرد"

دوورکەوتنەوەی کۆندی لە دایكوباوکی لە ساڵی ١٩٨٥دا سەختترین بەشی ژیانی بوو. لە دێنیڤەر دایکی بەدەست شێرپەنجەی مەمکەوە دەیناڵاند، بەڵام هەر ئەو ساڵەو لە تەمەنی ٦١ ساڵیدا کۆچی دواییکرد. بۆیە کۆندی بەفڕۆکە گەڕایەوە بۆ ماڵی دایكوباوکی بۆ ئەوەی لە بەخاکسپاردنو پرسەو ماتەمینیدا هاوڕێ لەگەڵ باوکیو خزمەکانی کە لەشوێنە جیاکانەوە هاتبوون، ئامادەبێت. هاوڕێیانی باس لەوە دەکەن لەکاتێکدا لە ماڵی خێزانی رایسدا بەهێمنی یادی ئەنجێلینایان دەکرد، ئامادەبووان نوقمی موزیك دەکرێن کە تەوەری ژیانی ئەنجیلینا بوو. ئیڤلین گلۆڤەر کە هاوڕێیەکی خێزانەکەبوو لە بیرمنگهام، دەڵێت: "هەرگیز ئەو رۆژەم بیرناچێتەوە کە لە پرسەی دایکی کۆندی گەڕاینەوە. کاتێك چووینە ژوورەوە کۆندۆلیزا لەگەڵ هەمووانـدا نوێـژی کـرد وتی: باهەندێك لەو سرودانە بخوێنین کە دایکم حەزی لێدەکردن". دواتر دەستیکرد بە پیانۆژەنین".

کۆندی ساڵی یەکەمی بەدەستهێنانی بەخشینی هۆڤەری بەکارکردن لەسەر کتێبێك دەربارەی مێژووی هەردوو لیژنەی ئەرکانی جەنگ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانو یەکێتیی سۆڤیەتو پەرەپێدانیان، دەستپێکرد. پاش ئەوەی گەڕایەوە بۆ وانە وتنەوە، کۆندی بەردەوام دەبێت لەسەر کتێبەکە بەڵام بەسستی ئەویش بەهۆی ئەو بەرپرسیارێتییانەی تـرەوە بـوو کـە لەئەستۆیدا بوون. پاش دوو ساڵ کۆندی کتێبەکە بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو دوادەخات. لە مانگی شوباتی ١٩٨٩ کۆندی پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەکەسێکەوە پێدەگات کە ماوەیەکی زۆربوو دەیناسی، ئەویش بێرنت سکۆکرۆفت بوو. بێرنت توانی کۆندی قایل بکات کە مۆڵەت لە خوێندن وەربگرێتو شارەزاییەکەی لە کاروباری سۆڤیەتیدا بخاتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە.

سکۆکرۆفت پێش پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە، تازە پۆستی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆکی تازەهەڵبژێردراوی، وەرگرتبوو و دەیویست کۆندی ببێتە بەشێك لە تیمەکەی کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بوو. ئەم پیاوە

کۆمارییەکی میانڕەوبوو و ماوەیەکی زۆر کاری لەگەڵ سوپاو لە بواری ئەکادیمیدا کردبوو بۆیە سەیر نییە کەکاریگەرییەکی گەورەی لەسەر پەرەسەندی کۆندی وەك پسپۆڕێکی کاروباری دەرەکی، هەبوبێت. ئەم دوانە هەردووکیان پەرۆشی کاروباری سۆڤیەت بوون، هەردووکیشیان کاری ئەکادیمیان لە وانە وتنەوەی مێژووی سۆڤیەتدا کردووەو زۆربەباشی زمانی روسی دەزانن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هەردووکیان دیدێکی سیاسیی بەهێزیان هەیە سەبارەت بەپەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

بێرنت لە وەرگرتنی پۆستی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییدا هەستی بەهیچ قورسییەك نەکرد، چونکە پێشتر لە ئیدارەکەی سەرۆك جیراڵد فۆرددا کاری لەم پۆستەدا کردووە. هەر لەو ئیدارەیەدا هێنری کیسنجەر راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییو وەزیری دەرەوەش بوو لەیەك کاتدا، بێرنت ـیش لە پرسەکانی ئاسایشی نەتەوەییدا جێگرو دەستەڕاستی بوو. لەکاتێکدا کیسینجەر وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی دەستی لەکارکێشایەوە بۆ ئەوەی هەموو کاتو وزەکانی وەك وەزیری دەرەوە تەرخانبکات، بێرنت وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی جێگەی گرتەوە.

بێرنت وا باس لەخۆی دەکات کە ئارەزوومەندە دوور لە چاوی کامێراکان بمێنێتەوەو وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی خوازیاری بە دیداری رۆژنامەوانیی نەدەکرد. ئەم پیاوە رۆژانە ١٨ سەعات لە کۆشکی سپی دەوامی دەکردو خاوەنی رێزێکی زۆربوو بەوپێیەی کەسێکی لێهاتوو بوو لە بەدەستهێنانی کۆدەنگیو رێکخستنی کاری پسپۆڕاندا. لە ماوەی حوکمی فۆرددا هەمووان لەوە گەیشتبوون کە کیسنجەر وێنەی سیاسەتی ئەمەریکا دەکێشێت، لەو کاتەدا کاری سکۆکرۆفت بەڕێوەبردنو رێکخستنو هەماهەنگیکردنی ئەم سیاسەتە بوو لەنێوان ئاژانسە حکومییە جیاکانو نووسینگەی کۆشکی سپیدا.

لێهاتوویی بێرنت لە بواری سیاسەتدا بەڕوونی دیاربوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵسوکەوتی خۆبەزلزانینی نەبوو، هاوکات لە سوپاو هەردوو وەزارەتی دەرەوەو بەرگریدا خاوەنی تۆمارێکی درێژبوو. بێرنت لە ئۆگدین لە ویلایەتی

یوتا لەدایکبووە، سەربە هۆزی مۆرمۆنە لەبەرئەوە نە جگەرە دەکێشێت، نە مەی دەخواتـەوە. لـە سـاڵی ١٩٥١ لەگـەڵ ژنێکـدا بـەناوی ماریـان ژیـانی هاوسـەرگیری پێکـەوە نـاوەو کچێکیان هەیـە. بێرنـت پلانـی وادانـابوو کـە پـاش تـەواوکردنی زانکۆی وێست پۆینت، ببێتە فرۆکـەوان، بەڵام لەکاتێکدا لـەناو فرۆکەیەکدا بـوو لەئاسمانـدا، فرۆکەکـە هەڵەیـەکی تـەکنیکی تێدەکـەوێت ئـەوەش دەبێتـە هـۆی ئـەوەی لـە چانسـی فرۆکـەوانیی بێبەشـی بکات. بێرنـت هەوڵدەدات لـە زانکۆی کۆڵۆمبیا بڕوانامەی ماستەر لـە پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەکانـدا بەدەسـتبهێنێت، دواتر وەك پرۆفیسیۆری مێژووی روسیا، دەگەڕێتـەوە بـۆ زانکـۆی وێسـت پۆینـت. زۆر بەباشـی بـەزمانی روسـی قسـەدەکاتو لـە زانکـۆی جـۆرج تـاون لـە واشـنتۆنی پایتەختیش زمانێکی سلاڤی تری خوێنـدووەو لەکاتێکدا پۆسـتێکیش لـە ڕێـڕەوی دەرەوە لــە باڵیۆزخانــەی ویلایەتــە یــەکگرتووەکان لــە بــەلگرادی پایتــەختی یۆگۆسلاڤیا وەردەگرێت، هەموو ئەم لێهاتووییانەی دەخاتەکار.

بێرنـت لـە سـەرەتاکانی شەسـتەکانی سـەدەی رابـردوودا وەك پرۆفیسـیۆری بەشداری زانستە سیاسییەکان لە ئەکادیمیای ئەمەریکی فرۆکەوانیی لە کۆلاوراد‌ۆ کـاریکردووە، دواتـریش بووەتـە پرۆفیسـۆری لێـبڕاوو سـەرۆکی بەشـەکە. ڕێـڕەوەی پیشەیی پاش بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا لە پەیوەندییـە نێودەوڵەتییـەکان لە زانکۆی کۆڵۆمبیا، پـەرەپێ دەسێنێت. دواتـر بێرنـت وەك مامۆسـتا لـە کۆلێژی جەنگی نیشتمانیی وانەی ستراتیژیی سەربازییو ئاسایشـی سـەربازیی بەپلـەدارە باڵاکـانی سـوپا دەڵێتـەوە. پـاش ئـەوەی پۆسـتێك لـە پلانـدانانی دوورمـەودا لـە سـەرکردایەتیکردنی فرۆکـەوانیی لـە واشـنتۆن دەگرێتەدەسـت، سـەرباری چـەند پۆستێکی تـری ئاسایشـی نەتـەوەیی لـە پێنتـاگۆن، ڕێـڕەوەی پیشـەیی بێرنـت لـە هەردوو بواری ئەکادیمیو حکومیدا بەردەوامی بەخۆوە دەبینێت.

لـە سـاڵی ١٩٧١دا بێرنـت دەگاتــە پلـەی کۆڵۆنێـلو دەکرێتــە یـەکێك لـە یاریدەدەرە سەربازییەکانی سەرۆك نیکسۆنو لـە دیـاریکردنی هەڵوێسـتی سیاسـی دیبلۆماسی واقعبینانە لەگەڵ چیندا، یارمـەتی سـەرۆك دەدات. ئـەم هەڵوێسـتەی لەو سـەردانەی نیکسـۆندا بـۆ چـین بـەدیار دەکـەوێت کـە لەهـەمان سـاڵدا (١٩٧٢)

ئەنجامی دەدات. پاش سەردانەکە پلەکەی بێرنت بۆ عەمید بەرزدەکرێتەوە. پاش ئەوەش وەك سەرۆکی ئەو تیمەی کە ڕێکارە پێویستییەکانی گەشتەکەی ساڵی ۱۹۷۲ ی نیکسۆنی بۆ یەکێتیی سۆڤیەت دانا، ڕوودەکاتە مۆسکۆ.

بێرنت یاریدەدەرێکی دارشتنی پەیماننامەی ساڵت دوو بوو، یەکێکیش بوو لە داڕێژەرانی سیاسەتی چەکی ناوکی لە سەردەمی حوکمڕانیی نیکسۆندا. هەروەك ئەرکی ڕێکخستنی کشانەوەی ئەمەریکییەکان لە سایگۆن لەکاتی بەجێشهێشتنی ئەو شوێنە لە نیسانی ۱۹۷۵دا، دەدرێتە دەستی ئەم پیاوە.

بەپێچەوانەی ئەو ستراتیژە تەباخوازەی لە سەردەمی نیکسۆن-کیسنجەردا لە بەرامبەر یەکێتیی سۆڤیەتدا باوبوو، ریگان بەرنامەیەکی دژایەتیئامێزیی بەرامبەر ئەو وڵاتە پەیڕەو دەکرد، بەهۆی ئەمەوە بێرنت نە وەزارەتی بەرگری نە وەزارەتی دەرەوە وەرناگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئیدارە نوێکە پێویستی بەشارەزایی سەربازیی بێرنت هەبوو بەتایبەت لەبواری شیکردنەوەی ئەو چەکە جەنگییە فرەکڵاوانەی تازە پەرەیان پێدرابوو و بەشێکبوون لە تەرسانەی گەشەکردووی ریگان. بەمەبەستی شیکردنەوەی چۆنیەتی بەکارهێنانی چەکە ستراتیژییەکان، بێرنت سەرکردایەتی دەستەی ئەو چەکانەی پێدەدرێت. هەروەك ئیدارەکە سود لە ئەزموونەکانی پێشووی بێرنت لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی وەردەگرێت ئەمەش پاش ئەوەی کە ریگان وەك سەرۆکی لیژنەی تاوەر دایدەمەزرێنێت، کە تایبەت بوو بەلێکۆڵینەوە سەبارەت بەڕۆڵی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە پرسی ئێران-کۆنترادا. بێرنت لەراپۆرتەکەیدا گەورەترین سەرزەنشت دەداتەپاڵ سەرۆکی ئەرکان لە ئیدارەکەی ریگاندا، هاوکات رەخنەش لەخودی ریگان دەگرێت بەوەی چاودێری کارو چالاکییەکانی ئەندامانی ئەنجوومەنەکەی نەکردووە. بێرنت دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە کێشەکە لە پێکهاتەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا نییە، بەڵکو لەو کەسانەدایە کەکاریان تێدا دەکرد.

لە ئێوارەخوانێکی ساڵی ۱۹۸۷دا کە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ستانفۆرد سازیکردبوو، بێرنت چاوی بەکۆندی دەکەوێت. بێرنت شوێن کۆندی

دەكەویت‌و لە یەكێك لەكلاسەكانیدا دادەنیشێت. ئەو وانەیەی كۆندی كەباسی لە موشەكی MX دەكات، بێرنت دەگەیەنێتە ئەو بڕوایەی كە كۆندی دەبێتە كەسێكی زۆر یارتیدەر لە تیمە نوێكەی ئاسایشی نەتەوەیی كە ئیدارەی نوێی بوش دروستیكردبوو. لەمیانەی كۆبوونەوەیەكی تایبەت بە داڕشتنی ستراتیژی سیاسەتی دەرەوە كە لە ئەسپن، كۆلاورادۆ ئەنجامدرا، بێرنت زۆر قسە بۆ كۆندی دەكات‌و ئەوەندەی پێناچێت داواشی لێدەكات ئامادەی كۆبوونەوەكانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ببێت.

بێرنت بەو پێیەی راوێژكاری ئاسایشی نەتەوەیی بوو، ئەركی كۆكردنەوەی بیروبۆچوونە جیاوازەكانی وەزیرەكانی پێدرابوو سەبارەت بەسیاسەتی دەرەوە، لەوانە دیك چینی وەزیری بەرگری، جێمس بەیكەر وەزیری دەرەوە، كۆلن پاوڵ سەرۆكی دەستەی گشتی ئەركان. ئەو سێ پیاوە ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بوون كە گرووپێكی راوێژكاریی بوو و پرسەكانی سیاسەتی دەرەوەی تاووتوێ دەكردو وێنەی ستراتیژی جێبەجێكردنی ئەو سیاسەتەشی دەكێشا. ئەركی سكۆكرۆفت پێشكەشكردنی بیرۆكە جیاوازەكانی ئەندامانی ئەنجوومەنی بۆ سەرۆك، لەخۆدەگرت‌و یەكێك لەكارە هەرە لە پێشینەكانی چاودێریكردنی ناكۆكییەكانی ناو ئەنجوومەنەكە بوو لەپێناو دەستەبەركردنی بەڕێوەچوونی كارەكاندا. كۆندۆلیزا رایس لە كتێبە هاوبەشەكەی لەگەڵ فیلیپ زیلكاو سەبارەت بەیەكگرتنەوەی ئەڵمانیا نووسیویەتی: "سكۆكرۆفت‌و بەیكەر زۆر گرنگییان بەهاوكاری نێوانیان دەدا. ئەم دوو پیاوە سەرنجیاندابوو كە ناكۆكییە تاڵەكانی نێوان وەزارەتی دەرەوەو ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە ساڵەكانی شەستەكانەوە ببووە دیاردەیەكی روون بۆ سیاسەتداڕێژەرانی واشنتۆن". سكۆكرفت واڕاهاتبوو كە زۆر بەبایەخەوە دەیڕوانییە خاڵەكانی هاوكاریكردن‌و خاڵەكانی جیاوازی پشتگوێ دەخست، هەرچەندە جیاوازی بەشێكی سروشتی بووە لەسەرجەم بەشەكانی ئیدارەی واشنتۆن". كۆندی‌و فیلیپ دەڵێن: "بەبەردەوامی كێشەو جیاوازی دروستدەبوون، بەڵام بەخێرایی چارەسەردەكران".

لە کانونی دووەمی ١٩٨٩دا کۆندی دەبێتە بەڕێوەبەری کاروباری سۆڤیەت و ئەوروپای ڕۆژهەڵات لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی. بێرنت دەڵێت: "کۆندیم بۆیە هەڵبژارد لەبەرئەوەی خاوەنی زانیارییەکی قوڵە لە مێژوو و سیاسەتی سۆڤیەتداو لەبەرئەوەی خاوەنی وردبینییەکی بابەتیانەیە لە هەڵسەنگاندنی ئەوەی ڕوودەدات، دیدێکی تیژو ویستێکی توندوتۆڵی بۆ بیرکردنەوەی ستراتیژیی و چەمکئامێز هەیە.. ئاگاداری دواگۆڕانکارییە سەربازییەکانە". بێرنت هەستی بەوەش کردبوو کە کۆندی لەکاتێکدا ئەرکەکەی قورس دەبێت، دەتوانێت پارێزگاری لە ئارامیی خۆی بکات. بێرنت لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: "کۆندی خاوەنی هێزێکی سەرنجڕاکێش و سادەییەکی مەزنە، بەڵام دەشیتوانی لەکاتی پێویستدا زۆر توند بێت". پاش چوار مانگ پۆستەکەی کۆندی بەرزدەکرێتەوەو دەبێتە بەڕێوەبەرێکی نایابی کاروباری سۆڤیەت، هەروەها وەك یاریدەدەری تایبەتی سەرۆك بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی دادەمەزرێت. ئەڵقەی هاوکارە نزیکەکانی کۆندی هەریەك لە فیلیپ زیلیکاو بەڕێوەبەری سیاسەتی ئەوروپا، دینیس ڕۆس کە ئەمیش پسپۆڕێکی کاروباری سۆڤیەت و بەڕێوەبەری پلاندانانی سیاسەت بوو، لەخۆگرتبوو. مێژووی یەکترناسینی کۆندی و دێنیس دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کالیفۆرنیا کە لەو کاتەدا دێنیس وەك پرۆفیسۆر لە زانکۆی بێرکلی کاری دەکرد. ئەم سیانە لەژێر دەسەڵاتی ڕۆبەرت بلاکوێلدا کاریان دەکرد کە بەڕێوەبەری باڵای کاروباری ئەوروپاو سۆڤیەت بوو.

ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی کە سەر بەسەرۆك بوو لەخودی سەرۆك، ئەو ئەندامانەی لەسەرەوە باسمانکردن، جێگری بێرنت کە ڕۆبێرت گەیتس بوو، روبێرت هاچینکز کە سەرۆکی هەردوو بەشی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپاو ئەڵمانیا بوو لە ئەنجوومەنەکە، پێکهاتبوو. بازنەی ئەو کەسایەتییانەی کە کۆندی کاری لەگەڵدا دەکردن چەند کەسێکی وەك ڕۆبێرت زولیك لە وەزارەتی دەرەوەو پۆل ولفوویتز لە وەزارەتی بەرگری، لەخۆگرتبوو.

وەك یەكێك لە ئەندامانی ئاسایشی نەتەوەیی كۆندی بەرپرسیارێتی سێ ئەركی لە ئەستۆدابوو، كاری یەكەمی یارمەتیدانو هەماهەنگیكردن بوو لە بڕیاردان لە ڕێگەی كۆكردنەوەی زانیاری لەوانەی لە پلەی یاریدەدەری وەزیر یان گەورە یاریدەدەرانی وەزیربوون. لەمیانەی كاری دووەمیدا وەك یاریدەدەری بێرنت سكۆكرۆفت، كۆندی لە هەڵبژاردنی ئەو بەرپرسانەی كە پێویستبوون بێرنت چاوپێكەوتنیان لەگەڵدا ئەنجامبداتو ئامادەكارییەكان بۆ سەردانەكان، یارمەتی بێرنتی دەدا. لەم بارەیەوە كۆندی دەڵێت: "ئێمە دەڕۆشتین بۆ ئەم كۆبوونەوانە، من لێكۆڵینەوەیەكم دەنووسیو تێیدا ئەو پرسانەم پێشنیاز دەكرد كە شیاوی وروژاندن بوون. سەبارەت بەو پرسانەش كە لە چوارچێوەی دەسەڵاتەكانی مندا نەدەتوانرا تاووتوێبكرێن، واتە ئەوانەی لە دەسەڵاتی سكۆكرۆفت، بەیكەر، چینی، یان پاوڵدا بوون، لەو كاتەدا بەرپرسیارێتی من دڵنیابوون بوو لە ئامادەیی سكۆكرۆفت بۆ ئەو پرسانە". لە چوارچێوەی كاری سێیەمیدا كۆندی وەك كارمەندێكی تایبەتی سەرۆك لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا كاری دەكرد. كۆندیوا راهاتبوو كە لێكۆڵینەوەی كورتی لەسەر ئەو پرسانە دەنووسی كە پێویستە لەو كۆبوونەوانەی سەرۆك لەگەڵ سەرۆكی وڵاتانی تردا ئەنجامیان دەداتو تایبەتبوون بە بڕیاردانی سیاسەتی دەرەوە، بوروژێنرێن.

یەكەم پرس كە رووبەرووی كۆندی بۆوە وەك یەكێك لە گەورە دارێژەرانی سیاسەتی سەرۆك، پرسی ئەو كێكەبوو كە كێشەكەی ٥٠٠ پاوەند بوو. لە مانگی كانونی دووەمداو لە یەكەم رۆژی كاری فەرمی ئیدارەی نوێدا لە كۆشكی سپی، ئیدارەكە سندوقێكی گەورەی بەدەست دەگات كە مۆری پۆستی یەكێتیی سۆڤیەتی پێوەبوو ،بەڵام زانیاری تر لەبارەیەوە نەدەزانرا. تیمی بۆمبی تایبەت بەهەواڵگریی، بەپەلەو بەوریاییەوە ئەم سندوقە دەگوازێتەوەو لە شوێنێكی ئارامو دژە تەقینەوەی بۆمبدا دایدەنێن. پاشان لەوێ بەوریاییەوە دەیكەنەوە، دەبینن كێكێكی گەورەی تێدایە كە بەشێوەیەكی جوان رازێنراوەتەوە، بەڵام هەندێك لەت ببوو. كۆندی رادەسپێردرێت كە بەدواداچوون بۆ نێرەری ئەم

سندوقە بکات، بەهۆی ئەوەی لەسەر قوتووەکە جگە لە لۆگۆی پۆست هیچی تری لەسەر نەبوو، خودی کۆندی بەدواداچونێکی چڕوپڕ دەکات تا بۆی دەردەکەوێت کە لە هاریکاری فڕنەکان لە شارێکی بچووکی سۆڤیەتەوە هاتووە. ئەم هاریکاریە ئەو کێکەی وەك پیرۆزباییەك بەبۆنەی دەستبەکاربوونی بوشەوە ناردبوو.

ئەم دەستپێشخەرییە زۆر کاردەکاتە سەر سەرۆك هەربۆیە داوادەکات خۆی‌و خێزانەکەی لە نزیك کێکەکەوە وێنەیەك بگرێت‌و بینێرێت بۆ هاریکاریەکە. سەرۆك داواشدەکات کێکەکە بنێردرێت بۆ کۆمەڵەیەکی خێرخوازیی‌و لەوێشەوە دابەشبکرێت بۆ ئەوەی هەموان لێی سودمەند بن. ڕێکخستنی وێنەگرتنەکە چەند ڕۆژێك دەخایەنێت‌و کاتێکیش کاتی ناردنی کێکەکە بۆ کۆمەڵە خێرخوازییەکە دێت، بۆیان دەردەکەوێت کە مشکەکانی کۆگای تیمی هەوالگریی چوونەتە ناو زۆربەی بەشەکانی کێکەکەوە.

لە مانگی ئازاردا کۆندی یەکەمین ئەرکە سەختەکانی وەردەگرێت، کە ئەرکێکبوو دەیخاتە ناو دڵی پرۆسەی داڕشتنی سیاسەتەوە. ئەو کاتە سەرۆك تازە راپۆرتێکی کورتی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە سەبارەت بەمێژووی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت، بەدەستگەیشتبوو. لە ڕێگەی ئەم راپۆرتەوە سەرۆك دەیەوێت دەستبکات بەداڕشتنی بەرنامەیەکی تایبەت لەبەرامبەر گۆرباتشۆفدا. بێرنت سکۆکرۆفت پێیوابوو راپۆرتەکە لەرووی وردەکاریی‌و ئایدۆلۆژیاوە زۆر کەموکورتە هەربۆیە داوا لە کۆندی دەکات بەئامانجی ئامادەکردنی "دەقێکی فیکری" کەزیاتر باس لە گۆرباتشۆف‌و سیاسەتەکانی پێشووی‌و بیرۆکەکانی بۆ داهاتوو بکات‌و سەرۆکایەتی تیمێك لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بگرێتەدەست.

تا ئەوکاتە کۆندی زۆری لەسەر گۆرباتشۆف نووسیبوو و چەندین وتاریشی لەبارەیەوە لەرۆژنامەکاندا بڵاوکردبوویەوەو هەر لەسەر ئەم بابەتە کتێبێکیشی دانابوو، هەروەها پیاچوونەوەی بە لێکۆڵینەوەیەکیشدا کردبوو کە خودی خۆی لەسەر یەکێتیی سۆڤیەت نووسیبووی. لە ڕێگەی ئەم ئەرکەوە کۆندی بۆ یەکەمین جار چانسێکی دۆزییەوە بۆ ئەوەی زانیارییەکانی لەسەر گۆرباتشۆف‌و

رژێمی سۆڤیەت بخاتە قۆناغی جێبەجێکردنەوەو بەوەش بووە بەشداریکی دارشتنی سیاسەتی ئەمەریکا. ئەو بەڵگەنامەیەی لە گرووپەکەی کۆندی هەڵقوڵابووە بنچینەی سیاسەتی ئیدارەکەی بوش بەرامبەر بەیەکێتیی سۆڤیەت. دواتر سکۆکرۆفت لەوبارەیەوە دەنووسێت: "ئەو یاداشتەی کۆندی ئامادەیکرد ئەو پلەپەیژانەی چەسپاند کەپێم وایە ستراتیژێکی گشتگیری تایبەت بە یەکێتیی سۆڤیەت ئاراستە دەکات، هەر لەم یاداشتەوە پرۆگرامێکی چوار بەشیی بۆ مامەلەکردن لەگەڵ گۆرباتشۆفدا، هەڵقوڵا"

سکۆکرۆفت بەم شێوەیە باس لەو چوار هەنگاوە دەکات:"وێنەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا بەهێزدەکات لەبەرئەوەی بەرنامەیەکی روونی سیاسی متمانەبەخش دەخاتەکار، دڵنیابوون لەوەی کە هاوپەیمانەکانی ئەمەریکا لە مانای پابەندبوونی هاوڵاتی ئەمەریکی بە ئاسایشیانەوە تێدەگەنو ئەمەریکا پابەندە بە سنوردانان بە پرچەککردنەوە، هەنگاونانی پێویست لە ئەوروپای رۆژهەڵات، لەوانە پێشکەشکردنی کۆمەکی ئابوری، ئەویش لەپێناو بەهێزکردنی ئەو ئاراستە سەربەخۆخوازییەی ریفۆرمەکانی گۆرباتشۆف پەیرەویکردووە، کارکردن بەوپەری پەرۆشییەوە بۆ هاندان بۆ سەقامگیریی ناوچەیی لەجیهاندا لە رێگەی هاوکاری نێوان ئەمەریکاو سۆڤیەتەوە"

ئەم پلانە سەرەتاییەی کۆندی بۆ سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا ئامادەیکرد، یاداشتێکی لاوەکی لەخۆگرتبوو کەتێیدا ناکۆکییە ناوخۆییەکانی سۆڤیەتی تاووتوێکردبوو. سکۆکرۆفت نووسیویەتی، ئەم پرۆگرامە ئەوە دەستەبەردەکات کە "بەبایەخەوە بروانینە ئاراستەی گۆرینی هەڵسوکەوتی یەکێتیی سۆڤیەت لەناوەو دەرەوەشدا"

ئەرکی دواتری کۆندی پێویستی بەدوورکەوتنەوەی زیاتر لە پرسی کێکەکە هەبوو. ئیدارەی ئەمەریکا بەهۆی دیارینەکردنی پێگەی خۆی لە سیاسەتی دەرەوەو رانەگەیاندنی ئەو ئامانجو ستراتیژانەی کە گوزارشت لە سیاسەتی حکومەت دەکەن، چەندین رەخنەی ئاراستە کرا. بەهۆی ئەوەوە بریاردرا لە وەرزی بەهاری داهاتووەوە خشتەی وتارەکانی سەرۆك دابنرێت تا بەهۆیانەوە

سیاسەتەکانی روونبکاتەوە. بەڵام رووداوێک لە ئەوروپای رۆژهەڵات بووەهۆی ئەوەی ئیدارەکە پەلە بکات لە جێبەجێکردنی ئەو خشتەیەدا. لە مانگی نیساندا سەندیکای هاریکاریی لەپۆڵەندا وەك سەندیکایەکی یاسایی (شرعی) راگەیەندرا بەوەش پۆڵەندا لە ٤٥ ساڵ حوکمی شیوعی رزگاری دەبێت. ئیدارەی ئەمەریکا لەم قەڵەمبازە نوێیەی پۆڵەندا بەئاراستەی دیموکراسی، پرسێکی دۆزییەوە کەبووە تەوەری سەرەکی سیاسەتەکەی بەرامبەر بە ئەوروپای رۆژهەڵات. ئیدارەکە بەباشی دەزانێت کە سەرۆك ئەو وتارەی پەیوەندی بەو سیاسەتەوە هەیە کە ئیدارەی ئەمەریکا لەبەرامبەر پۆڵەنداو ئەروپای رۆژهەڵات پەیرەوی دەکات، لە ٧ ی نیسان لە هامترامك لە ویلایەتی میشیگان پێشکەشی بکات. بێرنت هامترامك بە بژاردەیێکی سروشتی ناودەبات بۆ پێشکەشکردنی ئەو وتارە ئەویش بەهۆی "بوونی چەند کۆمەڵگەیەك تێیدا کە پەیوەندییان لەگەڵ ئەوروپای رۆژهەڵات بەگشتیو پۆڵەندا بەتایبەتی هەیە... ئەوێ شوێنێکی گونجابوو بۆ قسەکردن لەسەر گۆڕانکاری لەناو یەکێتیی سۆڤیەتو تێڕوانینمان سەبارەت بە ئازادی پۆڵەندا"

یاریدەدەرانی بوش لەماوەی دوو هەفتەدا زۆر بەهەستکردن بە بەرپرسیارێتیو خێراییەوە کار لەسەر وتارەکەی بوش دەکەن. داوا لە کۆندی دەکرێت بە پەلە کار لەسەر لێکۆڵینەوە لەسەر دارایی ناو بەرنامە حکومییەکان بکات، کە رەنگە بۆ پێشکەشکردنی کۆمەکی ئابوری بۆ پۆڵەندا، سودی لێ وەربگیرێت. دیاربوو ئەم ئەرکە قورسە، بەتایبەت کە هاوکاتبوو لەگەڵ کەشێکی بودجەی توندو کورتهێنانێکی توندی داراییدا. هەروەها، دەبوو سەرۆك بڕیار بدات کە کۆمەکە ئابورییەکان بەشێکی گرنگ دەبن لەسیاسەتەکەیدا یان نا. ئەو کۆبوونەوەیەی کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تەرخانیکردبوو بۆ تاووتوێکردنی ئەو بابەتە دوو دیدی جیاوازی لێکەوتەوە: دیدی یەکەم پێی وابوو کە ناردنی دارایی بۆ پۆڵەندا کارێکی پڕ لەمەترسییە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە رەنگە وڵات نەتوانێت دواتر سوودی لێ ببینێت. یەکێك لە ئەندامانی ئەنجوومەنەکە مشتومڕ لەسەر ئەوە دەکات کە پێشتریش ویلایەتە

یەكگرتووەكان لە ساڵەكانی حەفتاكاندا كۆمەكی ئابوری پێشكەش بەپۆڵەندا كردووە لەپێناو پشتگیریكردنی هەندێك گۆڕانكاری سیاسی بەڵام، لەبەرئەوەی ژێرخانەكە ئامادەنەبووە، ئەم كۆمەكانە لە دروستكردنی گۆڕانكارییدا سەركەوتوو نەبوون. ئەو ئەندامە دەیوت ئەم كارە جارێكی تر دووبارە دەبێتەوە. بەڵام دیدی دووەم كە هی سەرۆك بوش و جێمس بەیكەر وەزیری دەرەوەی بوو، پێداگریی لەسەر ئەوە دەكردەوە كە ئەمجارەیان پۆڵەندا هەنگاوی گەورەی ئابوری بۆ پێشەوە ناوەو ئەم رەوشەی ئێستا تەواو جیاوازە. دەبوو سەرۆك بریاری تایبەتی خۆی بدات، ئەوەبوو لەكۆتاییدا بریاریدا هەوڵبدات ئەوەی لەتوانایدا بێت لە كۆمەكی دارایی بیخاتە چوارچێوەی سیاسەتەكانی بەرامبەر بەو وڵاتە.

پرسی ئەوەی كە كێ وتارەكەی سەرۆك بنووسێت مشتومڕێكی توندی لەنێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەلایەكو وتارنووسەكانی سەرۆك لەلایەكی ترەوە، لێدەكەوێتەوە. بێرنت هەستدەكات ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بژاردەی لۆژیكییە بۆ نووسینی وتارەكە لەبەرئەوەی زیاتر لە ناوەرۆكی پرسە وروژێنراوەكەوە نزیكە، لەبەرامبەردا نووسەرانی وتارەكانی سەرۆك مشتومڕیان لەسەر ئەوە دەكرد كە بێگومان ئەوانیش دەتوانن گوزارشت لە ناوەرۆكی وتارەكە بكەنو پێیان خۆش نییە هیچ كەسێك دەست لەم پرسە وەربدات. دواتر بێرنت دەگاتە چارەسەرێكی ئەم كێشەیە ئەویش بەوەی كە كۆندۆلیزاو نووسەری وتارەكان مارك داڤیس پێكەوە رەشنووسی یەكەمی وتارەكە بنووسن. دواتر بوش سەرنجەكانی خۆی لەسەر دەنووسێتو جێپەنجەی تایبەتی خۆی پێوە دیاریدەكات بەشێوەیەك كە وتارەكە كتومت رەنگدانەوەی دیدوبۆچوونی خۆی بێت.

لە تەموزی ١٩٨٩دا كۆندی لەگەڵ سەرۆك بوش و بێرنت سكۆكرۆفتو وەفدێكی یاوەریان سەردانی پۆڵەنداو هەنگاریا دەكات كە بریاربوو لەوێ سەرۆك وتارێك پێشكەش بەجەماوەر بكاتو تێیدا بەڵێنی پشتگیریكردنی ئابوریی بزووتنەوە دیموكراسیخوازەكانی ئەوروپای رۆژهەڵات بدات. وەفدەكە لە وارسۆو

گدانسك چاوی دەکەویت بە چەند سەرکردەیەکی سەندیکای هاریکاری لەوانە: لیش ڤالیساو جەنەراڵ فۆسۆڤیچ یارۆزلسکی، دواتر بوش وتارێك لە ئەنجوومەنی نیشتمانی پێشکەش دەکات. دواتر وەفدەکە لە بوداپێست چاوی دەکەویت بەچەندین سەرکردەی کۆمۆنیست لەوانە میکلۆس نیمیس سەرۆك وەزیران کە تابلۆیەکی یادگاری وەك ئاماژەیەك بۆ گۆڕانکارییە گەورەکانی داهاتوو، پێشکەش بە سەرۆك دەکات. سکۆکرۆفت لەبارەی ئەم سەردانەوە دەڵێت: "نیمیس تابلۆکەیەك پێشکەش بەسەرۆك دەکات کە پێکهاتبوو لە پارچەیەکی بچووك لەتەلی لێکئالاو کە لە بەربەستی ئەو تەلە لێکئالاوەی کردبووەوە کە سنورەکانی هەنگاریاو نەمسای لێك جیادەکردەوە، ئەم پارچەیە ئاماژەبوو بۆ بەربەستی ئاسنین". هەنگاریا سنورەکان لەگەڵ نەمسادا دەکاتەوە، هەرچەندە ئەم پرسە قەیرانێك لەگەڵ ئەو ئەڵمانییە رۆژهەلاتییانەدا دروستدەکات کە هەوڵیان دەدا لە رێگەی هەنگاریاوە بەرەو ئەڵمانیای رۆژئاوا هەڵبێن، بەڵام ئەم کارە وا لەهەنگاریا دەکات کەوەك رووناکییەك لە ئەوروپای رۆژهەلاتدا سەیربکرێت.

لە پایزی ١٩٨٩دا کۆندی رووبەڕووی هەڵوێستێك دەبێتەوە کە سەلماندی بیروبۆچوونی بێرنت سەبارەت بەم ژنە بەوەی کە دەتوانێت رووبەڕووی هەڵوێستە سەختەکان ببێتەوە، زۆر راستە. ئەرکی بەخێرهێنانی بۆریس یەلتسین بۆ دەروازەی کۆشکی سپی کە بەرپرسێکی سۆڤیەتی زۆربلێ بوو، دەدرێتە کۆندی. یەلتسین زۆریش مادده کهولییەکانی دەخواردەوە، دواتر دەبوایە بە هاورێیایەتی خۆی بیبردایە بۆ کۆبوونەوەیەك لەگەڵ سەرۆکدا. ئەو کاتە یەلتسین ئەندامێکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی سۆڤیەتو یەکێکبوو لە توندترین بەرهەڵستکارە ئاشکراکانی گۆرباتشۆفو سەبارەت بەسستی بەڕێوەچوونی بزووتنەوەی چاکسازی ئابوری، زۆر بەئاشکرا رەخنەی لێدەگرت. لەمیانەی ئەو گەشتەیدا بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە مانگی سێپتەمبەردا، یەلتسین بەهۆی تورەبوونە توندەکانی کە دەبوونە هۆی سورهەڵگەڕانی دەموچاویو کەسایەتییە کاریگەرەکەیەوە، ببووە هۆی ئەوەی میدیاکان هەمیشە شوێنی بکەون.

سەرۆك و سكۆكرۆفت دەبوو بڕیاری ئەوە بدەن کە ئایا یەڵتسین شیاوی ئەوەیە بانگهێشتی کۆشکی سپی بکرێت یان نا، چونکە چوارچێوەی پەیوەندیدار بەبینینی میوانانی سیاسی بێگانە زۆر بەوردی پلانی بۆ دادەنراو سێ ئاستی لەخۆدەگرت. دیداری سەرۆك بەرزترین سەردانە لەرووی ئاستەوە، بەدوای ئەودا راستەوخۆ چاوپێکەوتنی بێرنت دێت کە هاوکاتە لەگەڵ چاوپێکەوتنێکی بە پەلەی سەرۆکدا. ماوەی ئەم بینینە خودی سەرۆك دیاریدەکات. جۆری سێیەمیش تەنها دیداری بێرنتە. پرسێکی تریش بەهەند وەردەگیرێت ئەویش چۆنیەتی چونەناوەوەی کۆشکی سپییە. ئەگەر میدیاکان بیانەوێت پەیوەندی بە میوانەکەوە بکەن لەوکاتەدا میوانەکە پێویستە لە دەروازەی خۆرئاوای کۆشکی سپییەوە، بچێتە ژوورەوە. بەڵام ئەگەر ویسترا میوانەکە دوور لە چاوی میدیاکان بێت، لەو کاتەدا لە رێی دەرگاکانی قاتی خۆرئاوای زەمینیەوە دەکرێتە ژوورەوە.

بوش دەیەوێت لەگەڵ یەڵتسیندا کۆببێتەوە، بۆیە داوا لە بێرنت دەکات کۆبوونەوەیەکی کتوپڕ لە نووسینگەکەی بێرنت رێکبخات تا یەڵتسین ببینێت. لە ۹ی سێپتەمبەر داوا لە یەڵتسین دەکرێت ئامادەی دەروازەی قاتی زەمینی بێت و لەوێدا کۆندی چاوەڕێی دەکات. یەڵتسین بەمەرجێك ئامادەبوو لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزێت و بەپێی بڕوات کە کۆندی بەڵێنی پێ بدات بیباتە کۆشکی سپییەوە. بەرووی کۆنیدا هاواردەکات و دەڵێت: "ئەمە ئەو دەرگایە نییە کە دەتوانم لێوەی بچمە ژوورەوەو سەرۆك ببینم". کۆندیش دەستبەجێ بەبیریهێنایەوە کە کۆبوونەوە بڕیاردراوەکەی لەگەڵ راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییدایە نەك سەرۆك بوش. لەو کاتەدا جارێکی تر یەڵتسین بەرووی کۆندیدا دەتەقێتەوەو دەڵێت:"هیچم لەبارەی ژەنەراڵ سکۆکرۆفتەوە نەبیستووەو پۆستەکەی ئەوەندە گرنگ نییە تا دیدار لەگەڵ مندا ئەنجامبدات". یەڵتسین زۆر توڕەدەبێت و هەردوو دەستی بەلێکئالاویی دەخاتە سەرسنگی و لەئۆتۆمبێلەکەیدا دادەنیشێت و لە دوورەوە چاوی توڕەیی دەبڕێتە کۆندی. لەبەرامبەردا کۆندیش چاوی دەبڕێتە یەڵتسین، بەڵام هیچ وشەیەك نادرکێنێت. ئەم چاو لەیەك سورکردنەوە دورەی

نێوان یەڵتسینو کۆنـدی بـۆ مـاوەی پێـنج خولـەك بەردەوامـدەبێت، دواتـر کۆنـدی خـۆی بـۆ رۆیشـتن ئامادەدەکـاتو بـەتۆنێکی کاریگـەرەوە پێـی دەڵێـت دەتوانێـت بگەڕێتـەوە بـۆ هۆتێلەکـەیو ئـەمیش لەلایـەن خۆیـەوە بـە جەنـەڕاڵ دەڵێـت میوانەکـە ئامادەنابێـت. دواتـر یەڵتسـین نەرمـدەبێتو ڕەزامەنـدی لەسـەر کۆبوونەوە لەگەڵ سکۆکرۆفت دەردەبڕێت، پاشان لە ئۆتۆمبێلەکەی دێتەخوارەوە، کۆندیش قۆڵ دەخاتە ژێر بنباڵییەوەو بە بێدەنگیی پێشی دەکەوێت بۆ سەرەوە.

ئامـادەبووان سـەریان لـە نەترسـانی کۆنـدی سـوردەمێنێت لـەو هەڵوێسـتەدا. هەمووان دەیانزانی کە کۆندی خاوەنی متمانە بەخۆکردنێکی توندە، بەڵام تـا ئـەو ساتە هەستیان بەوە نەکردبوو کەئەوەندە سورە لەسەر هەڵوێستەکانی.

لەکاتێکـدا سـەرۆك پەیوەندیـدەکات بەکۆبوونەوەکـەو چـەند خولـەکێکی لەگەڵدا بەسـەربرد، یەڵتسـین زۆر خۆشـحاڵ دەبێت. لەکاتێکدا یەڵتسـین کۆشـکی سپی بەجێدەهێڵێت کۆمـەڵێك رۆژنامـەنووس دەبینێت کە زۆر بەپەلـە راپۆرتیـان دەنووسـی. یەڵتسـین بەپەلـە لـە ئۆتۆمبێلەکـەی دێتـەخوارەوەو سـەرنجی کۆمەڵـە رۆژنامەنووسـەکە رادەکێشـێت، ئەوەنـدەی پێناچـێت دەسـتدەکات بەقسـەکردن بۆیـان. ئەمـە ئـەوە نـەبوو کـە بێرنـت کتومـت پلانـی بـۆ دانـابوو، بـەڵام ئـەوەی کەرووی دا هیچ زیانێکی نەبوو و دواتریش یەڵتسین دەگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ.

چـەند مانگێـك پـاش ئـەم روداوە دیـواری بـەرلین دارمـا، ئەمـەش بەڵگـەی گۆڕانکارییـە هەژێنـەرەکانی ئـەوروپای رۆژهـەڵات بـوو. پـاش تێپـەڕبوونی چـەند هەفتەیـەك بەسـەر ئـەو روداوە پرشـنگدارەدا، کۆنـدی بـەیاوەری سـەرۆك بـوشو وەفدی ئاسایشی نەتەوەیی سەر بەبوش دەچـنە لوتکـەی مالْتـا کەتێیـدا وەفدەکە هەڵوێستی ئەمـەریکا لەبـەردەم گۆرباتشـۆفدا روونـدەکاتـەوە. وەك پێشـتر لەبەشـی شەشـەمدا باسمان کرد ئەم کۆبوونەوەیە یەکەم کۆبوونەوەیەی کۆندی بـوو لەگـەڵ گۆرباتشـۆفو بەرپرسـانی بـاڵای سـۆڤیەتدا. ئـەو کاردانـەوە سەرسـوڕهێنئامێزەی سـەرۆکی سـۆڤیەت پـاش دیداری لەگـەڵ کۆنـدی دەریـبڕی یەکـەم کاردانـەوەی لـەو شێوەیە نـەبوو، بـەڵکو پێشـتریش کاردانـەوەی هاوشـێوە لەلایـەن چـەند کەسـێکی تـرەوە بـۆ کۆنـدی هـەبووە. لـەم بارەیـەوە کۆنـدی دەڵێـت: "پێموایـە روسـەکان

جارجاره بەم شێوازە بیردەكەنەوەو دەڵێن: "كچێكی وەك تۆ لەنێو گفتوگۆی تایبەت بەبۆمبو گولله چی دەكات؟"" جگە لەوە كۆندی لە ڕاستی هەستی كۆڵەكەكانی دەسەڵاتی سۆڤیەت بەرامبەری هیچ دڵنیا نەبوو. لەم بارەیەوە دەڵێت: "لەسەرەتادا روسەكان هەستیانكرد قبولكردنی بوونی من لەنێوانیاندا زۆر قورسە. نەمتوانی لەوە دڵنیابم كە هۆكاری ئەوە ئەوەیە كە مێیینەم یان رەشپێستم یان گەنجم، بەڵام دواتر پلەبەپلە كارەكەیان قبولكرد". پرۆگرامی كۆندی رێگەی پێنەدەدا كە لەم كارەدا دوودڵ بێتو بەدڵنیاییەوە بەهیچ شێوەیەك هەستی ترسنۆكیی نەیدەتوانی بیشڵەژێنێت، لەو بارەیەوە دەڵێت: "لەو بارودۆخەدا نەهەستم بەتەنیایی دەكرد نە بە بێتاقەتبوون لەبەرئەوەی خۆم وا دەبینییەوە كە پەیوەندیدارم بە بەرنامەی كاركردنێكەوە كە ماوەكەی رۆژانە ١٤ یان ١٥ سەعاتە".

بەهۆی ئەوەی سەربە كەمینەی رەشپێستەكانەو ژنێكە لە ناوجەرگەی داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەوەدایە، كۆندی لەكاتێكەوە بۆ كاتێكی تر رووبەڕووی هەندێك كێشە دەبوویەوە. لە ساڵی ١٩٩٠دا كۆندی وەك سەرۆكی ئەو وەفدە ئەمەریكییە هەڵبژێردرا كە یاوەریی گۆرباتشۆڤی دەكرد لەكاتی یەكەم سەردانیدا بۆ شوێنە جیاكانی ویلایەتە یەكگرتووەكان كە چەندین شاری لەخۆدەگرت. لەكاتێكدا وەفدەكە گەیشتە سانفرانسیسكۆ، كارمەندێكی نهێنی هەوڵدەدات نەیەڵێت كۆندیو بەشی كۆتایی وەفدەكە بچنە حەوشەی زانكۆوە، شتێكی زۆر سەیربوو كە دیاربوو ئەم كارمەندە نەیدەزانی پۆستەكەی كۆندی چییە. كۆندی ئەم رووداوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "میدیاكان لەسەر ئەم رووداوە بەشێوەیەك قسەیان كرد كەبووەهۆی شەرمەزارییەك بۆ كارمەندە نهێنییەكان. پێویستە بوترێت ناتوانین وێنەی ئەو كارمەندە سپیپێستە كە رێ لە تەنها كەسی رەشپێستی یاوەری وەفدەكە دەگرێت لەگەڵ گرووپی یاوەری سەرۆكی یەكێتیی سۆڤیەتدا بڕوات، بەوێنەیەكی باش بۆ پەیوەندییەكانی نێوان نەژادە جیاوازەكان لە ئەمەریكا لەقەڵەم بدەین. كۆندی باس لەوە دەكات كە لەم جۆرە هەڵوێستانەدا "كچێكی وەنەوشەیی شەرمن" نییە.

پاش چەند ساڵێکی کەم روداوی دووەم دێتەپێش کە مانایەکی سەبارەت بە جیاوازیی رەگەزیی لەنێوان هەردوو رەگەزەکەدا لەخۆگرتبوو و هەموو ژنێك کە کار لە بواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا دەکات، رووبەرووی دەبێتەوە. ئەمەش لەکاتی کارکردنی کۆندی لە ئیدارەکەی جۆرج بوشی کوڕدا روویدا. لەو سەردەمەدا سەردانێکی فەرمی بۆ ئیسرائیل ئەنجامدەدات، ئەو کاتە ئاریل شارۆن کاندیدی پۆستی سەرۆك وەزیران بوو. شارۆن بە رۆژنامەنووسانی رادەگەیەنێت: "دەبێت دان بەوەدا بنێم کە کۆندی لەبەرئەوەی خاوەنی دوو لاقی زۆر جوانە، هەستمدەکرد لەکاتی گفتوگۆکانمدا لەگەڵ کۆندۆلیزا رایس، زۆر خەیاڵم لای گفتوگۆکان نەبوو". یەکێك لە ژنە رۆژنامەنووسەکان باس لەوەدەکات بەهۆی بڵاوبوونەوەی دیاردەی گیانی سەربازیی نێرینەیی لە ئیسرائیل، ئەم جۆرە قسانە زۆربەی جار لەو وڵاتە پشتگوێدەخرێن. رۆژنامەنووسەکە دەڵێت: "ئەو کەسانەی ماوەیەکی زۆر لەسوپادا خزمەت دەکەن بەم شێوازە دەڕواننە کارەکان". لوتکەی ماڵتا کە لە کانونی یەکەمی ١٩٨٩دا بەسترا، گفتوگۆکردن لەسەر دووبارە یەکگرتنەوەی ئەڵمانیای لە ریزی پێشەوەی کارەکانی دانابوو، سۆڤیەتیش زۆر لەوە دەترسا ئەم پرسە ببێتە هۆی "هەڵکەندنی دڵی سیستمی ئاسایشی سۆڤیەت". گۆرباتشۆف پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە پێشنیازەکانی سەبارەت بەپێدانی ئازادییەکی ئابوری زۆرتر بەو وڵاتانەی لە چەرخی یەکێتیی سۆڤیەتدا دەسوڕێنەوە، ببنە هۆی خۆپیشاندانی بوێرانەو کردنەوەی سنورەکانو بەپیرەوەچوونی بەگوڕ رووەو ئەو سەربەخۆییەی شیاوی ئەم وڵاتانەیە. باس لەوە دەکرێت کە کۆندی یەکێکبووە لەو گرووپە بچووکەی ئەو سیاسەتەی دارشت کەبووە بنچینەیەك بۆ دانووستانەکانی بوش لە ماڵتاو ئەو لوتکە ئەوروپییانەی تر کە لەو ساڵەدا بەستران. گرووپی دارشتنی سیاسەتەکان بەرامبەر بەیەکگرتنەوەی ئەڵمانیا، پێکهاتبوو لە کۆندی، فیلیپ زیلکاو (کەدواتر پێکەوە لەگەڵ کۆندی کتێبێکیان لەسەر یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا دانا)، رۆبێرت بلاکوێڵ، پیتەر زۆلیك‌و دێنیس روس. واتە گەورەترین یاریدەدەرانی سکۆکرۆفت ئەم گرووپەیان دروستکردبوو.

گرووپەکەی کۆندی سیاسەتی ئەمەریکا بەرامبەر ئەڵمانیاو ئەورووپای نوێ دادەڕێژن کە مافی دیاریکردنی چارەنووسی ئەڵمانیاو پابەندبوونەکانی ئەو وڵاتە بەرامبەر بەناتۆی لەخۆگرتبوو. ئەم سیاسەتە پێداگریی لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە هەموو گۆڕانکارییەکان بە "ئاشتی، پلەبەپلە" بن و ببێتە بەشێك لە پرۆسەیەك کە هەنگاو بە هەنگاو بەرەوپێشەوە بڕوات". گرووپەکە ئامانجێکی تریشی دانا ئەویش هێنانەدی یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا بوو پێش ئەوەی یەکێتیی سۆڤیەت بتوانێت لە ڕێگەی پێشکەشکردنی چەند دژەپێشنیازێکی فەرمیەوە کۆسپ بخاتە بەردەم پرۆسەکە. کۆندی لە داڕشتنی ئەم بەشەی سیاسەتدا ڕۆڵێکی سەرەکی بینی، لەیاداشتێکدا کە لە سەرەتای ساڵەکانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا ئاراستەی سکۆکرۆفتی، دەکات باسی لەوە کردووە کە ئەو پلانە پێنج قۆڵییەی ڕاوێژکاری ئەڵمانیا هێلمەت کۆڵ ڕایگەیاندووە زۆر سستە لەبەرئەوەی پلانەکە کاتێکی زۆر دەدات بە یەکێتیی سۆڤیەت بۆ دەستێوەردان و ڕۆڵبینینێکی کاریگەر تێیدا. کۆندی دەتوانێت سکۆکرۆفت و تیمەکەی بەوە قایل بکات کە کات هۆکاری سەرەکییە لەپرسەکەدا. لەو بارەیەوە فیلیپ زیلکاو دەڵێت: "هەنگاوێکی پڕ لە مەترسی بوو بەڵام دەرکەوت لە جێی خۆیدایە".

گۆڕانکارییە گەورەکە بەخێرایی لەئەڵمانیادا ڕوویدا، ئەوەبوو لە ئازاری ١٩٩٠دا یەکەم هەڵبژاردنی ئازاد لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی ئازاددا ئەنجامدراو تێیدا ئەو حیزبانەی پشتگیری یەکگرتنەوەی ئەڵمانیایان دەکرد زۆربەی کورسییەکانیان بردەوە. لە مانگی سێپتەمبەردا سەرکردە ئەورووپییەکان لە مۆسکۆ بەمەبەستی ئیمزاکردنی پرۆتۆکۆڵی چارەسەری کۆتایی پرسی ئەڵمانیا کۆبوونەوە کە دانی نا بە یەکێتی هەردوو ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا. ئەو کاتە سکرتێری ڕۆژنامەوانی کۆشکی سپی مارلین فیتزواتەر دەڵێت: "ئەم ڕێککەوتننامەیە دیاردە دەرەکییەکانی دامەزراندنی ئەڵمانیای یەکگرتوو ڕێکدەخات، گەیشتن بە ئەڵمانیایەکی یەکگرتوو، ئازادو دیموکراسی دەکاتە هەنگاوێك" لەوێنەیەکدا کە لە کتێبەکەی کۆندی بەناوی **ئەڵمانیای یەکگرتوو و ئەورووپای گۆڕاودا** بڵاوکراوەتەوە، کۆندی دەبینرێت کە لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی

زۆردا لەپشت مێژی ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکەوە لەم بۆنە مێژووییە ڕاوەستاوە. لەم وێنەیەدا نزیکەی ٣٥ کەس هەن کەتەنها دوانیان ژنبوون، یەکێکیان کۆندیبوو. دواجار هەردوو ئەڵمانیا لە سێی ئۆکتۆبەری ١٩٩٠دا پرۆتۆکۆڵی فەرمی یەکگرتنەوەکە ئیمزادەکەن.

دارمانی دیواری بەرلین بووەهۆی ئەوەی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات یەکێتیی سۆڤیەت لەدەستبدات، ئەمەش بۆ جیهان، شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو. کۆندی تا ئازاری ١٩٩١ کە تێیدا دەستبەرداری پۆستەکەی بوو، لەناوجەرگەی سیاسەتی ئەمەریکادا مایەوە. لە کانونی دووەمی ئەو ساڵەدا لەمیانەی خەباتی لیتوانیاو لاتیڤیا بۆ سەربەخۆیی، چەند کارێکی توندوتیژی لەو دوو وڵاتەدا ڕوویاندا، ئەوەش یەکێکبوو لەو ڕوداوە کەمە خوێناوییانەی لە چوارچێوەی گۆڕانی گشتگیری ناوچەکەدا ڕوویاندا. بەدوای ئەو دوو وڵاتەدا چەندوڵاتێکی تری کۆمارەکانی بەڵتیق، هەروەك یاری دۆمینە داوای سەربەخۆی دەکەن، ئەوەندەی پێنەچوو ڕێگەش بەڕوسیا درا کەبۆ یەکەمین جار سەرۆکی تایبەتی خۆی هەڵبژێرێت. یەڵتسین وەك سەرۆکی روسیا هەڵبژێردراو گۆرباچۆڤیش وەك سەرۆکی یەکێتیی سۆڤیەت مایەوە. لە مانگی کانونی یەکەمی ئەو ساڵەدا سەرکردەکانی ئۆکرانیا، روسیا، روسیای سپی بەئامانجی دروستکردنی ئەوەی ناونرا **یەکێتیوڵاتە سەربەخۆکان**، بەشێوەیەکی نهێنی کۆدەبنەوەو بەوەش بەتەواوەتی یەکێتیی سۆڤیەت هەڵوەشێنرایەوە. لە ڕۆژی کریسمسدا گۆرباتشۆف دەستلەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەشکردو ئاڵای نوێی روسیای فیدراڵ کە لە ڕەنگی سپیو شینو سور پێکهاتبوو، لە شوێنی ئاڵای سۆڤیەت کە لە ڕەنگی سورو داسە زەردەکە پێکهاتبوو، بەرزکرایەوە.

لەکاتی ئەرکەکەی کۆندیدا کە دوو ساڵی خایاند، توانی پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ سەرۆك بوشو هاوسەرەکەی کە ناوی باربێرا بوو، دروستبکاتو لەوەش زیاتر کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر تەواوی کارمەندەکانی تری بوش، جێهێشت. چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کارەکانی کۆندی ئێجگار کاردەکاتە سەر بوش لەبەرئەوە سەیر نەبوو کە بوشی کوڕ پاش ئەوەی یەکەم هەڵمەتی سیاسی بۆ بردنەوەی

پۆستى حاكمى ويلايەتى تەكساس بردەوە، داواى لێ بكات بيبينێت. بوشى باوك شێوازى ديبلۆماسى كۆندىو توانا ئايديۆلۆجييەكانى بەرزنرخاندووە، لەو بارەيەوە لە ياداشتێكدا بۆ رۆژنامەنووسان لە سالّى ٢٠٠٠دا نووسيويەتى:

**كۆندى لەئەركەكەيدا زۆر لێهاتوو و زرنگ بوو، بەلّام هەرگيز هەولّى نەدەدا لەو كۆبوونەوانەى ئەو لەگەلّ سەركردە بيانييەكاندا ئامادەيى بۆ دەكردن، خۆى بەو لێهاتووييەوە هەلّبكێشێت، هەلّسوكەوتى بەوە ناسراو بوو كە خاوەنى شێوازێكى سەرسوڕهێن بوو لە گونجان لەگەلّ خەلّكداو پێشكەشكردنى بەلّگەكانى بەبێ ئەوەى ببێتە هۆى بێزاركردنى ئەوانەى لەديدو بۆچووندا لەگەلّيدا جياوازبوون... خاوەنى ستايلّو ئامادەبوونێك بوو بەشێوەيەك كە گەورەترين كەسايەتى لەچەك دادەمالّى. بۆچى؟ لەبەرئەوەى كۆندى دەيزانى قسە لەبارەى چييەوە دەكات**

چەندين كەسى تر كەپێشتر كاريان لەگەلّ كۆنديدا كردووە لەسەر ئەوە كۆكن كە كەسايەتييە دیناميكييەكەىو زيرەكييەكەى پێكەوە ببوونە هۆى دروستكردنى كۆمەلّێكى زۆر لە ئاكار كە ئەمانيش لەلايەن خۆيانەوە ببوونە پشكێك بۆ سەركەوتنى. جۆرج برێنكلّ، كە لە زانكۆى نۆتەردام مامۆستاى كۆندى بوو، بەكورتى باس لەم ئاكارانەى كۆندى دەكاتو دەلّێت: "كۆندى كەسێك نەبوو كەتەنها خاوەنى تموحو تواناى فكريى ناوازە بێت، بەلّكو ئەو خاوەنى كەسايەتييەكى سەرسوڕهێنيش بوو بەشێوەيەك كەئەم كەسايەتييەى رۆلّى لەپێشكەوتنيدا هەبووە".

كۆندى ئەو دوو سالّەى لەگەلّ ئيدارەى بوشدا بەسەريبرد، بە ئەزموونێكى ژيانى ناودەبات كە پێى وانييە هەرگيز شتى وا دوبارەببێتەوەو دەلّێت: "كاتێكى چێژبەخش بوو، سەيرنەبوو كاتێك شەوێك دەچوويتە جێگا بۆ خەوتن، بەيانى كە هەستايتايە بتبينيايە ولّاتێك لەنێوان ئێوارەو بەيانييەكدا سيستەمە كۆمەلّايەتييەكەى گۆڕيبێت، بەوەش ديموكراسييەكى نوێت بۆ دروست دەبوو بۆ ئەوەى مامەلّەى لەگەلّدا بكەيت" كۆندى هەستى بەپێزانين دەكرد بەوەى كە بەشێك بووە لە ئيدارەيەك كە يارمەتى ئاسانكردنى پرۆسەى گۆڕانى ئەلّمانياى

داوەو ئەو وڵاتەی کردووەتە گۆڕنکارییەکی پۆزەتیف بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی. کۆندی دەشڵێت:"ئایا بەدڵنیاییەوە دەبوو ئەڵمانیا بەپێی چەند بنچینەیەکی نامۆ بەتەواوەتی لە چوارچێوەی پەیمانی ناتۆدا یەکبگرێت؟ ئایا پێویستبوو ئەم پێودانگانە سۆڤیەتییەکان بگەڕێنێتەوە بۆ وڵاتەکەیانو بەوەش کەرامەتیان بەبێ هیچ روداوێك پارێزراوبێت، ئایا بەپێی ئەم بنچینانە دەبوو هێزە ئەمەریکییەکان لەئەڵمانیادا بمێننەوەو سەرجەم وڵاتەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات رزگاربکاتو بیلکێنێت بەکوتلە رۆژئاواییەکەوە؟ نەخێر ئەمە کارێکی حەتمی نەبوو.. ئەم کارەش دەرگاکەی بەکراوەیی بۆ هونەری بەڕێوەبردنی وڵات، دەهێڵێتەوە"

کۆندی هەستیشی بەپێزانین دەکرد لەبەرامبەر ئەو کەسانەی لە هونەری حوکمکردندا کاریان لەگەڵ کردووە. لە ساڵی ١٩٩٥ دا کۆندی بەئاشکرا دەڵێت: "هاوکارەکانم زیرەکترین کەسبوون کە بەدرێژایی ژیانم بینیومن، لەبەرئەوەی پێکەوە دەستمانکرد بەچارەسەرکردنی ئەو پرسانەی کەدەمزانی گرنگترین بەهایان هەیە لە بواری لێکۆڵینەوەی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا. پرسیارم لەخۆم دەکرد کە ئایا جارێکی تر ئەو هەلەم بۆ دەڕەخسێنرێت کە لەناو ئەم گرووپە زۆرەی هێزو روداوو لەناو ئەم کەسایەتییانەدا کاربکەمو کە لەنێوانیاندا سەرۆك کۆمار جۆرج بوش هەیە کە زۆر رێزم بۆی هەیەو ئەو کەیسە گەورانەی لە کۆتایی شەڕی سارددا دەرکەوتن لە ریزی هەرەپێشەوەی کارەکانیدا بوو"

کۆندی کارکردنی لەگەڵ سەرۆکە راستەوخۆکەیدا بە گرنگترین بەشی تایبەتی کارەکەی دادەنا. لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەو کارەی کە زۆرترین ئاسودەیی لەرووی تایبەتییەوە پێبەخشیوم کارکردنبوو لەگەڵ سکۆکرۆفت".

کۆندی هەستیدەکرد کە کارکردن لە واشنتۆن لە سەردەمی یەکێك لە گرنگترین کاتەکانی پڕ لە ڕوداو لە مێژووی سیاسیدا کارێکە کە زۆر ئەوینداریی بۆی هەیە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو توانیویەتی رۆڵێکی ئەکتیف ببینێت لەم پرۆسەیەدا. کۆندی پێشبینی ئەوەی نەدەکرد لە داهاتوویەکی نزیکدا بگەڕێتەوە بۆ کۆشکی سپی. پاش چەند ساڵێك سەرۆك بوش لەوتارێکدا

رازیبوونی خۆی لەو تیمی کارە دووپاتکردەوە کە لەو ماوە پڕلە گۆڕانکارییەدا یارمەتییان داوە، ئەوەش ئەو تیمەبوو هاوڕێی خۆشەویستی خۆی کۆندۆلیزا رایس یەکێك بوو لە ئەندامەکانیو دەڵێت:

وشەی سەرکەوتن زیاتر بەسەر ئەو کەسانەدا جێبەجێ دەبێت کە لەگەڵمدا بوون. بوونی ئەو کەسانە چێژبەخشو پڕ خێرو بەرەکەتبوو بۆ من.

لێرەدا پێویستە بە هەڵە حوکم لەسەریان نەدەین، لەبەرئەوەی ئەوان کەسانێکی باشو خاوەن پەروەردەیەکی جوان بوون، هاوکات خاوەنی پێداگرییەکی پێویستو دیدێکی بەهێزیش بوون، پێکهاتبوون لە چەند ژنو پیاوێکی پێگەیشتوو، لەوە دەگەیشتن کە دەسەڵات پێویستە ئامانجێکی هەبێت. کاتێك دەمبینین پێکەوە کاردەکەن هەستمدەکرد کە ڕێز لەیەکتر دەگرن. کاتێك پێکەوە گفتوگۆمان لەسەر کەیسێك دەکرد، زۆربەی جار ئەندامانی تیمەکە بە توندی مشتومڕیان لەسەر دەکرد، بەڵام هەر کە سەرۆك بڕیاری گونجاوی لەبارەیەوە دەدا، هەموو شتێك دەگەڕایەوە باری سروشتی خۆیو گفتوگۆکە هێوردەبوویەوە. پێویستە ئاوا کارەکان بەڕێوەببرێن".

# بەشی هەشتەم

## بەرەو لوتکە

**هەمیشە بە قوتابییەکانم دەڵێم: ئەگەر بینیتان ئەوانەی هاوڕێیەتیان دەکەن لەهەموو شتێکدا هاوڕاتان بوون، ئەوە بزانن کە ئەو کەسانە گونجاو نین بۆتان**

### کۆندۆلیزا رایس ۱۹۹۳

بەهاری ۱۹۹۱ هات، پرۆسەی یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا تەواوبوو. کۆندی توانی لێهاتوویی خۆی بۆ سکۆکرۆفت بسەلمێنێت هەربۆیە داوای لێکرد لە پۆستەکەی بەردەوام بێت. لەیەکی ئازار شەڕی کەنداو کۆتاییهات بەوەش پەردەی لەسەر بەشێکی تری ئیدارەکەی بوش لادا. کۆندی بڕیاریدا کە کاتی ئەوە هاتووە دەستبەرداری لە واشنتۆن بێتو بگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئەکادیمی. وەك سکۆکرۆفت دەڵێت کۆندی پێی خۆش نەبوو ئەوەی کە کۆندی ناوینابوو پۆستێکی ماندوکەر، بگاتە قۆناغی ماندوبوون، بەڵام ئەو کاتی بایۆلۆجی بەهەند وەردەگرت. تەمەنی کۆندی دەگاتە ۳٦ ساڵ هەربۆیە دەیەوێت جێگیر ببێتو خێزان دروستبکات. خودی کۆندی ئەم لێکدانەوە پشتڕاستناکاتەوە، بەڵکو دەڵێت دەیەوێت پێشرەوی

بدات بەپیشە فێرکارییەکەی نەك شتی تر دەڵێت: "بڕیارێکی ئاسان نەبوو، هەستمکرد ئەگەر لەماوەی دوو ساڵدا نەگەڕێمەوە بۆ پیشەی فێرکارییەکەم ئەوکاتە پارێزگاریکردنم لەو پیشەیە شتێکی قورس دەبێت"

کۆندی لە گرنگی پۆستە باڵاکەی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تێدەگەی، بەڵام هەستیشی دەکرد پێویستە راژەی ئەکادیمیو راژەی گشتی بەیەکسانی لە دوو تای تەرازوویەکدا دابنێت. کۆندی بەردەوام دەبێتو دەڵێت: "ئێمە بەختیارین کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەژین کەتێیدا دەتوانین دەست لەکارێك هەڵبگرینو دواتریش بتوانین بچینەوە سەری. پێموایە بە پلەی یەکەم خۆم وەك ئەکادیمییەك دەبینم. ئەمەش پێویستی بەوەیە کە مرۆڤ بە بێگەردیی بمێنێتەوەو بە توندی پابەندی پیشەکەی بێت". دوورکەوتنەوەی کۆندی لە خوێندکارەکانی بەشە باڵاکان بۆ ماوەی دوو ساڵ، شتێکی قورس بوو بۆ ویژدانی ئەم خانمە. لەم بارەیەوە دەڵێت: "هەوڵمدا لە قۆناغەکانی دەرچووندا پەیوەندیم لەگەڵ خوێندکارەکانمدا بمێنێت، بەڵام هەستمکرد ئەوە کارێکی قورسە... ناتوانیت بۆ ماوەیەکی زۆر دوور بکەویتەوە".

کۆندی بۆی دەردەکەوێت کە بەردەوامبوونی لە پۆستەکەی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ ماوەی دوو ساڵی تر پێویستی بەجۆرێك لە کارکردن هەیە کە بێ کۆتایەو رۆژانە دەگاتە ١٤ سەعات، ئەمە سەرەڕای نەبوونی کاتی پێویست بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە بچووكو ئاساییانەی هاوسەنگیی شێوازی ژیان رادەگرن. لەمبارەیەوە دەڵێت: "دەمویست بۆ خۆم بژیم". کۆندی هەستدەکات کە زۆر بەختیارە بەوەی لە یەکێك لە گرنگترین سەردەمەکانی پڕ گۆڕانکاری لە سیاسەتی ئەوروپا، کاری لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا کردووەو پێیوابوو کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێتەوە بۆ چێژی کەرتی فێرکاریو ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەو پیانۆژەنینو بازاڕکردن. ئەو زۆر شێلگیرانە کاریکردبوو بۆ گەیشتن بەناوەندی ئەکادیمی هەربۆیە نەیدەویست ئەم ناوەندەی لەپێناو پۆستێکدا هەرچەندە باڵا بێت، بخاتە مەترسییەوە. کۆندی دەڵێت: "کاتێك داوام لێکرا لەپۆستەکەمدا بمێنمەوە، بیرم لەوە کردەوە کە ئەگەر بمێنمەوە پێویستە تا

کۆتایی ماوەی سەرۆکایەتی بمێنمەوە، ئەو کاتە پێموانەبوو ئامادەییم بۆ ئەوە تێدا بێتو گەیشتبوومە بارێکی ماندووبوونەوە.. ئەم پۆستە زۆر ماندووکەرە، لەکەمی ژمارەی کارمەندانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە بۆت دەردەکەوێت کە ئیشکردن لە کۆشکی سپی چەندە ماندووکەرە...هەموو فەرمانبەرانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ٤٠ کەس بوون، بەراستی پۆستێکی ماندووکەرە".

هاوکات لەگەڵ هەستی پەرۆشبوون بۆ گەڕانەوە بۆ ئامێزی زانکۆو کارلێکردنی ئەزموونەکانی لەگەڵ خوێندکاراندا، کۆندی دەست لە کارکردن لە واتەرگەیت هەڵدەگرێتو دەگەڕێتەوە بۆ کەناری خۆرئاوا. ئەزموونی پێش گەڕانەوەی، زۆر شتی پێبەخشی بوو کە پێشکەشی خوێندکارەکانی بکات بەتایبەت لەو پرسانەی پەیوەندییان بە باکگراوندی پشت رووداوە جیهانییەکانەوە هەیە. کۆندی لەکاتی وانە وتنەوەی بۆ خوێندکارەکانیدا واڕاهاتبوو کە پێداگری لەسەر گرنگی توخمی مرۆڤ دەکردەوە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، واتە هەڵوێستو هاوسۆزییو ئەو پەیوەندییانەی بنچینەی رووداو دروستدەکەن. گەیشتبووە قۆناغێك کە دەیتوانی ئەو زانیارییانەی لە شارەزایی راستەوخۆی خۆیەوە وەریگرتبوون بخاتە بەردەستی خوێندکارەکانی. دەستبەجێ پاش گەڕانەوەی بۆ زانکۆی ستانفۆرد رایگەیاند: "هەمیشە هەوڵمداوە هەندێك لە دیاردەکانی بڕیاردانی سیاسی بلێمەوە.. پێموایە ئێستا تێگەیشتنێکی باشترم بۆ ئەم پرسە هەیە.. بەبۆچوونی من زۆر گرنگە لەوە تێبگەین کەخەڵك چۆن بیردەکاتەوە.... پێم‌وایە لەتوانامدایە لە گۆشەیەکی باشترەوە تیشکێکی زیاتر بخەمە سەر سروشتی ئەم کارە".

کۆندی پاش ئەوەی لە ئازاری ١٩٩١واشنتۆنی بەجێهێشت نەیدەزانی کە رووداوەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بەو شێوە خێرایە دەگۆڕێن. پاش چەند هەفتەیەکی کەم لە گەڕانەوەی بۆ زانکۆی ستانفۆرد، دەڵێت: "پاش ماوەیەکی تر رووداوەکانی یەکێتیی سۆڤیەت دەردەکەون، پێموانییە مانەوەم لەواشنتۆن ببێتە هۆی چارەسەری کێشەکانی یەکێتیی سۆڤیەت لەم ماوەیەدا". کاتێك پێش

کۆتاییهاتنی ئەو ساڵە، ئەو سیستمە بەتەواوەتی داڕما، کۆندیش هەروەك هەمووولایەکی تر توشی سەرسوڕمان هات. لە مانگی دیسەمبەردا کۆندی وتارێکی جەماوەری پێشکەش کردو تێیدا باسی لەو گۆڕانکارییانە کرد کە لەوکاتەوەی ئەو کچە خوێندکارێکی سەرەتایی بواری زانستە سیاسییەکانی زانکۆی دێنیڤەر، بوو روویانداوە. ئەو رۆژە بەئاشکرا وتی: "هەروا بەئاسانی هەموو ئەو تیۆرانەی لەسەرەتادا خوێندمن راست دەرنەچوون، بۆ نموونە ئەو تیۆرە کۆنانەی دەیانووت ئەوروپا بۆ هەمیشە بە دابەشبوویی دەمێنێتەوەو کێشەی رۆژهەڵات لەگەڵ رۆژئاوا پێکهێنەرێکی جێگیری سیستمی جیهانییەو هێزەکانی سۆڤیەت لەناوجەرگەی ئەوروپای رۆژهەڵاتدا دەمێننەوە..... هەموو ئەم بیردۆزانە راست نەبوون، لەبەرئەوەی گەورەترین هێز کە یەکێتیی سۆڤیەتە داڕما".

هەر کە کۆندی لە ستانفۆرد جێگیر بوو، دەستدەکاتەوە بە بڵاوکردنەوەی بابەتو وتارێك بۆ ژمارەی ئەیلولی ١٩٩١ی گۆڤاری تایم دەنووسێت. چوار هەفتە پێش بڵاوبوونەوەی وتارەکە چوار کەس لە توندڕەوەکانی سۆڤیەت کودەتایەکیان لە مۆسکۆ ئەنجام دابوو. ئامانجی کودەتاکە روخانی گۆرباتشۆف بوو کە ئەو کاتە سەرقاڵی ئیمزاکردنی رێککەوتننامەیەك بوو کە ئازادی زیاتری دەدا بە کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەت. پاشگەزبوونەوەی هێزە سەربازییەکان لە پشتگیریکردنی کودەتاکە وێڕای ناڕازیبوونێکی جەماوەریی فراوان، توندڕەوەکانی ناچارکرد پاشگەزببنەوە. کۆندی وتارێك بەناوی **سوپایەکی نوێ بۆ وڵاتێکی نوێ** دەنووسێت کەتێیدا باس لە رۆڵی سوپا لە کودەتاو ئەو تەرسانەیە دەکات کە کەرتی سەربازیی گۆرباتشۆف هەیەتی بەوپێیەی فەرماندەیەکی نوێی وڵاتێکی نوێی ناکۆمۆنیستییە. لەم وتارەدا هاتووە: "هێشتا سۆڤیەت لەتوانایدایە رۆڵی خۆی لە وڵاتێکی دیموکراسی جێگیر کە ببێتە میراتگری یەکێتیی سۆڤیەتی کۆمۆنیستی، بدۆزێتەوە. ئەگەر ئەمە روویدا ئەوکاتە گۆڕینی کەسەکان بەس نین، لەبەرئەوەی دیموکراسیی جێگیر پێویستی بەدامەزراوەی بەهێزو پێویست هەیە نەك تەنها کەسایەتی بەهێز".

پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ کۆندی لەبەردەم جەماوەرێکی زۆردا دەرکەوت کە ئەمەش دووەم دەرکەوتنی بوو لە یانەی کۆمۆنویڵس، لەوێ وتارێك بەناوی کۆتایی شەری سارد: ئاستەنگی بەردەم سیاسەتی ئەمەریکا پێشکەش دەکات. هەروەك وتارەکەی پێشووی، ئەمەشیان راستەوخۆ پەخشکرا، ئەم وتارەی بەشێك بوو لە پرۆگرامی نیوەڕۆ خوانی هەینیو لە ١٣-١٢-١٩٩١ لە هۆتێل سانت فرانسیس لە سانفرانسیسکۆ پێشکەشی کرد. لەم وتارەدا باس لەو ئاستەنگە ترسناکانە دەکات کە ڕووبەڕووی یەکێتیی سۆڤیەت دەبنەوە هەر لە هەوڵەکانییەوە بۆ دامەزراندنی ئابوری بازاڕ بیگرە تا پشێوییە سیاسییەکانی. هەر لەو وتارەدا کۆندی هەموو ئەو تێگەیشتنو دیدانەی خۆی نیشاندەدات کە لەماوەی دوو ساڵی کارکردنیدا لە ئیدارەکەی بوش بەدەستی هێنابوون. هەروەها وتارەکەی وێنەیەکی چالاکی گۆرباتشۆڤ لەبەرامبەر گەلەکەیدا لەخۆگرتبوو. پاش کۆتاییهاتنی وتارەکە یەکێك لە ئامادەبووان داوای لێدەکات هۆکاری جیاوازی نێوان دیدی جیهان سەبارەت بە گۆرباتشۆف کە پێی وایە ئەو دڵسۆزە مەزنەیە کە شکستی بە کۆمۆنیزم هێناو دیدی گەلی سۆڤیەت کە سەرزەنشتی دەکەن بەهۆی ئەوەوە رەوشەکە بەرەو خراپتر چووە، ڕوونبکاتەوە. کۆندی بەم شێوەیە وەڵامدەداتەوە:

خەڵك لە یەکێتیی سۆڤیەت گۆرباتشۆف بەقۆناغی پەرتبوونی ناوخۆیی وڵاتەوە، دەبەستنەوە، پێیان وایە ئەو هۆکاری ئەوەبووە کە سێ یان چوار ئەوەندەی ئەو کاتەی کە پێشتر لەسەری راهاتبوون بۆ چاکسازیی، چاوەڕێ بکەن. لەمەدا خەڵك ئەوەی پشتگوێ خستووە کە هۆکاری ئەم کێشانە ئەو سڕبوونەیە کە لەسەردەمی برژنێفەوە باڵی بەسەر وڵاتدا کێشاوە. لەکاتێکدا گۆرباتشۆف حوکمی وڵاتی گرتەدەست، لەکێشە ئابوریەکان وەك پێویست تێنەدەگەیشت بۆیە هەوڵیدا پێگەی زیادکردنی بەرهەمهێنان بەهێز بکات، بەڵام بۆی دەرکەوت کەکۆی سیستمەکە سیستمێکی بۆگەن کردووە، هەربۆیە هەوڵیدا سیستمەکە هەڵبووەشێنێتەوە، بەڵام بوێریی پێویستی بۆ بازدان ڕووەو سیستمی بازاڕ پێنەبوو. بەهۆی نەبوونی ئەم ئازایەتییەوە پرۆسەی گۆڕانی خراپتر کرد.

**دەتوانین هۆکاری لەدەستدانی بنکەی جەماوەریی بگەڕێنینەوە بۆ وابەستەبوونی ناوەکەی بە پێریسترۆیکا یان ئەو سیاسەتی کرانەوەیەی هاوکات بوو لەگەڵ کەرتوپەرتبوونی ئابوری سۆڤیەتدا. لەگەڵ ئەمەشدا روسەکان دەڵێن ئەو باوکی شتێکی گرنگ بووە. ئەوان بەم شێوەیە سەرزەنشتی دەکەن: بەم دواییانە چی بۆ کردووین؟.**

لەماوەی هەشت ساڵی یەکەمیدا لە زانکۆی ستانفۆرد کۆندی ١٥ وتار دەنووسێت، ئەم وتارانە لەرۆژنامەکاندا یان لە بڵاوکراوەکانی مێژووی سیاسەتی دەرەوە بەرامبەر یەکێتیی سۆڤیەتدا بڵاودەکرانەوە. لەماوەی شەش ساڵی پاش گەڕانەوەی لە واشنتۆنیشدا پێنج وتاری تر، دەنووسێتو بەشداریشی لە کتێبی سێیەمدا دەکات کە ناوی **ئەڵمانیای یەکگرتوو و ئەورووپای گۆڕاو: لێکۆڵینەوە لە هونەری حوکمڕانیدا،** بوو.

کۆندی دەستدەکاتەوە بە کارکردن لە ڕاژەی گشتیدا کە ئەمەش رۆڵبینینی لەو دەستە راوێژکارییەدا لەخۆگرتبوو کە حاکمی ویلایەتی کالیفۆرنیا لە ساڵی ١٩٩١ بۆ دابەشکردنەوەی ویلایەتەکە، دروستیکردبوو. بیتی وێلسۆن کە حاکمی تازە هەڵبژێردراوی کالیفۆرنیا بوو لە ساڵی ١٩٩٠داو سەر بە کۆمارییەکان بوو، کۆندی دەناسێتو لە لیستی کاندیدەکان بۆ کورسی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا دایدەنێت کە ئەمەش کورسیەك بوو بەهۆی ئەوەی وێلسۆن لەو ساڵەدا بەحاکمی ویلایەت هەڵبژێردرابوو، بەتاڵ ببوو. لەکاتی ئەرکی فەرمیدا لەواشنتۆن کۆندی بەحاکم دەڵێت ئەرکی فەرمی گەیشتن نییە بەئەنجوومەنی پیران، ئەوەندەی پێ نەچوو کەبەمیدیاکانیشی راگەیاند کە پێی‌وا نییە بەهیچ شێوەیەك توانای ئەوەی هەبێت ئەو کورسییە بەدەستبهێنێت. ویلسۆن، جۆن سایمۆری کەکورسییەکی لە ئەنجوومەنی پیرانی ویلایەتەکە هەبوو، بۆ ئەنجوومەنی پیران کاندید دەکات. لەمیانەی بەشداریکردنی لە دەستەی راوێژکاریی ویلسۆندا لە ساڵی ١٩٩١ کۆندی چەندین بیرۆکە پێشکەش دەکات. تەوەرە سەرەکییەکانی ئەم بیرۆکانە سەبارەت بە دروستکردنەوەی پێکهاتنی ئەنجوومەنی ویلایەتو ئەنجوومەنی پیرانی سەر بەویلایەتو دارشتنی سنورەکانی هەرێمەکان بوون.

كۆندى ئەركێكى ترى حكومى دەخاتە ئەستۆى خۆى كە بەپێى ئەم ئەركە، دەبوو چەند گەشتێكى كورت لەماوەى چەندين هەفتەدا ئەنجامبدات، هاوكات سەرقاڵى دارشتنى سياسەتى سەربازيش بوو. لە ساڵى ١٩٩٧دا لە ليژنەى راوێژكاريى فيدراڵى بۆ كاروبارى تێكەڵكردنى هەردوو رەگەز لە مەشقە سەربازييەكان دامەزرێندرا، كە لەلايەن وەزيرى بەرگرى ويليەم كۆهينەوە پێكهێنرابوو. ئەم گرووپە مەدەنييە پێكهاتبوو لە ١١ ئەندام كە لەنێوانياندا ئەدميراڵێك و سێ جەنەراڵى خانەنشينكراوى لەخۆگرتبوو. ئەم ليژنەيە لەميانەى هەوڵەكانيدا بۆ نرخاندنى بەرنامەكانى ئێستاى مەشقكردن لەگەڵ سەدان كەس لە ئەندامانى سوپا، هێزە دەرياييەكان، چەكى ئاسمانىو پيادەرەوى دەريايى (مارينز)، بەمەبەستى برياردان لەسەر باشترين شێوازى مەشقپێكردنى ئەو هێزە خۆبەخشانەى هەردوو رەگەزەكە لەخۆدەگرێت، كۆدەبێتەوە ئەمەش لەپێناو دڵنيابوون لە ئامادەبوونو كاريگەريىو رێكوپێكى ئەم شێوازە. ئەم ليژنەيە ليستێكى فراوانى پيشاندەدرێت كە چەندين راسپاردەى لەخۆگرتبوو لەوانە باشكردنى راهێنانى عەريفەكانو چاكسازيى لە ياساكانى بەسەربازيكردنو توندوتۆڵكردنى مەشقى بنچينەيىو فراوانكردنى ليستى تەشقەڵەى سێكسىو دابيكردنى سەربازگەى جيا بۆ ژنو پياوو دامەزراندنى ژنە راهێنەرى زياتر.

دياربوو كە سودێكى زۆرى لە باگراوندى زانيارييەكانى سەبارەت بە سيستمە سەربازييەكان وەرگرتبوو، بەڵام تەوەرى سەرەكى پرۆژەى كۆندى سەنتەرى نەوەى نوێ بوو كە پێكهاتبوو لە پرۆگرامێكى يارمەتيدانى پاش دەوامى قوتابخانە، كۆندى لە بەرژەوەندى منداڵانى ئەو گەرەكە هەژارانەى قوتابخانەى هەريمى رافينزۆدى لە پالۆ ئالتۆى رۆژهەڵات تێدەكەوێت، بەشدارى لە دامەزراندنيدا كردبوو. بيرۆكەى دامەزراندنى ئەم سەنتەرە پاش گفتوگۆكردنێك لەگەڵ باوكيدا لەميانەى نانى ئێوارەدا، دروستبووە. لە ساڵى ١٩٨٢دا پاش ئەوەى ئەنجێلينا كۆچى دوايى دەكاتو باوكى لە كاركردن لە زانكۆى دێنيڤەر خانەنشين دەبێت، جۆن ماڵ دەگوازێتەوە بۆ كاليفۆرنياو ژنێكى تازە بەناوى كلارا بايلى رايس دەهێنێت. كلارا دەڵێت: "من لە قوتابخانەى ناوەندى مينلۆ ئۆكس

بەڕێوەبەربووم، ڕۆژێك كۆندی هاتە لام بۆ ئەوەی لە ئاهەنگێكی دەرچووندا كە قوتابخانەكە ڕێكیخستبوو، قسەبكات. خوێندكارە تازە دەرچووەكان بۆ چوونەناو قوتابخانەی دواناوەندی لە ئامادەباشیدابوون، هەربۆیە ئاهەنگێكی نوێژخوێندنی بچووك ڕێكدەخەن. داوام لە كۆندی كرد قسە لەو ئاهەنگەدا بكات. ئەو بەچۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو نوێژە لەلایەن خودی خوێندكارەكانەوە، سەرسامبوو، كە چۆن توانیویانە بە پشتبەستن بە داهاتێكی كەم ئەو ئاهەنگە ڕێكبخەن. پرسیاری لێكردم كە هەرێمەكە لەپێناو دەستەبەركردنی سەركەوتنی ئەم مندالانەدا، چ جۆرە پشتگیرییەك پێشكەش دەكات"

جۆن لە پێشكەشكردنی هەندێك ڕاوێژ لە زانكۆی ستانفۆردو بەشێوەی خۆبەخشیش لە قوتابخانەكەی كلارادا كاریكردووە. هەروەك كۆندی، جۆنیش گرنگی بە خوێندكارانی مینلۆ ئۆكس دەدا. سەرەڕای گرنگیدان بەدەوروبەری قوتابخانەكەو ژینگەكەی، كاری لەسەر باشكردنی ئەو جۆرە فێركردنە كردووە كە قوتابخانەی پالۆ ئالتۆی ڕۆژهەلات دابینیكردبوو. كلارا دەڵێت:"جۆن شێوەی رووبەرەكانی دەوروبەری قوتابخانەكەو یاریگاكانی بەدڵ نەبوو، بۆیە چەند كەسێكی نارد كە دووبارە گژوگیای ئەو شوێنانە بدوورنەوە". كلارا كە ١٧ ساڵ لەجۆن بچووكترە، لەكاتێكدا یەكتریان ناسی كە جۆن لە قوتابخانەكاندا كاری خۆبەخشی دەكرد، ئەوەندەی پێنەچوو ئەم دوانە لەوێ لە بیرمنگهام چەند هاورێیەكی هاوبەش دەدۆزنەوە. كلارا پێش ئەوەی ببێت بەبەڕێوەبەر وەك مامۆستای زانستو ماتمتیكی قۆناغی ناوەندی وانەی وتۆتەوە. دواجار جۆنو كلارا لە تەموزی ١٩٨٩دا ژیانی هاوسەرگیری پێكدەهێنن.

سەرباری خانەنشینبوونی، بەلام چالاكییەكانی جۆن لە كالیفۆرنیا كەمنەبوونەوە. كاركردنی جۆن لە بواری ڕاژەی گشتیدا كورسییەكی لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی حاكمەكانی زانكۆكانی ناوچەی كالیفۆرنیا، لەخۆگرتبوو كە لەلایەن بیتی ویڵسنەوە دامەزرێندرابوو. لە ساڵی ١٩٩٥دا جۆن ڕێزلێنانێكی گەورەی پێدەدرێت ئەویش وەرگرتنی خەلاتی ئەفسانەی زیندوو بوو كە یەكێتی نیشتمانی مامۆستا ڕەشپێشتەكانی قوتابخانەكان دەیدا بەوانەی ئەو

ڕێزلێنانە دەیانگرێتەوە. هەمان ساڵ زانکۆی دانیاڵ هایل لە شیکاگۆ بڕوانامەی دکتۆرای فەخریی پێدەدات، بەهۆی ئەمەشەوە هەندێك لە هاوڕێیانی بە دکتۆر رایس بانگی دەکەن.

کۆندی زانیاری ئەوەی پێدەگات کە قوتابخانەی هەرێمی راڤینزۆد بەرنامەیەکی پاڵپشتیکراو بەدارایی باش، بۆ ئەو خوێندکارانەی ئاستی خوێندنەوەیان نزمە رێکدەخات، بەڵام جگە لەوە هیچ شتێکی تر بۆ یارمەتیدانی ئەو خوێندکارانە بۆ ئامادەکردنیان بۆ خوێندنی زانکۆیی، دابین ناکات. کۆندی ئەوەش دەزانێت کە هیچ یەکێك لەخوێندکارانی قوتابخانەکە نەیانتوانیوە بچنە زانکۆی ستانفۆردەوە هەرچەندە گەیشتن بەو زانکۆیە تەنها پێنج خولەکی پێویستە. دیاربوو ئەم پرسە لای کۆندی یەکلاکەرەوەی هەڵوێست بوو. کلارا لەم بارەیەوە دەڵێت: "شەوێکیان لەکاتێکدا لەسەر مێزی نانی ئێوارە دانیشتبووین، هەرسێکمان جۆن، کۆندی‌و من بیرۆکەی دامەزراندنی سەنتەرێکی خوێندنی پاش دەواممان بەخەیاڵدا هات".

سەنتەری نەوەی نوێ لەو قوتابخانەیە دامەزرێندرا کە کلارا کاری تێدا دەکرد. سەنتەرەکە دەرگای بەڕووی ئەو کوڕانەدا کردەوە کە لە پۆلەکانی ٣ تا ٨ بوون‌و تێکڕای ناوەندی پلەکانیان لە C کەمتر نەبوو و راسپاردەی مامۆستاشیان لەگەڵدابوو. خوێندکاران بۆ یەکەمین جار خولی زمانی بێگانەو راهێنان لەسەر کۆمپیوتەریان بۆ دەکرێتەوە. ئەوانەی وانەیان لەم سەنتەرەدا دەووتەوە خوێندکاری زانکۆی ستانفۆرد بوون‌و لەلایەن جۆن رایسەوە بۆ ئەم کارە هەڵبژێردرابوون. کلارا دەڵێت: "جۆن کاتێك خانەنشین بوو هەموو وزەکانی خستە خزمەتی سەنتەرەکەوەو کاری لەسەر دڵنیابوون لە بەدەستهێنانی هەموو ئەو داهاتانەدا دەکرد کە سەنتەرەکە پێویستی پێیەتی". جۆن تیمێك رێکدەخات بۆ ئەوەی ببێتە بەشێك لە بەرنامەی هونەرە موزیکییەکان‌و دارایی پێویست بۆ کڕینی ئامێرو جلوبەرگ دابین دەکات، هەروەك بەرنامەیەك بۆ گواستنەوەی خوێندکاران لەقوتابخانەکەوە بۆ سەنتەرەکەو بەپێچەوانەشەوە رێکدەخات، توانیشی هەندێك لە بازرگانان قایل بکات کە بۆ دابینکردنی خواردن‌و ژەمەخۆراکی خێرا Fast Food پارە ببەخشن.

کۆندی بەفەرمی لەگەڵ سوزان فۆردو بەڕێوەبەری دامەزراوەی ساند هیڵدا بەشداری لە دامەزراندنی سەنتەرەکەدا دەکات، سوزان یەکێك بوو لەگەورە خۆبەخشەکانو چالاکییەکانی زیاتر لەبواری بازرگانیو پزیشکیدا بوون. شایانی باسە بەرنامەکە لەماوەی ساڵی خوێندنی ئاساییدا خزمەتگوزاریی پێشکەش بە ١٠٠ تا ١٢٠ خوێندکار دەکات، بەڵام لە وەرزی هاویندا خزمەتگوزارییەکانی دەگەیشتنە نزیکەی ١٥٠ خوێندکار. لەو کاتەدا سەنتەرەکە توانی پەیوەندییەکی فەرمی لەگەڵ زانکۆی ستانفۆرد دروستبکات کە سەرباری چەند پسپۆڕێکی فێرکاری کە یارمەتیدەری دانانی پرۆگرامی خوێندن بوون، چەند خوێندکارێکی خۆبەخشی پێشکەش بەسەنتەرەکە کردبوو. جۆن گرووپێك لە ڕاوێژکارانی قوتابخانەکان ڕێکدەخات بۆ ئەوەی لەکاتی پەیوەندیکردنیان بە قوتابخانەی دواناوەندیو دڵنیابوون لە پێشکەشکردنی پشتگیریو هاندانی پێویست بۆ دەرچوون، چاودێری خوێندکارەکان بکات.

پێشتر جۆن لە ڕێگەی ئەو گردبوونەوە نەوجەوانانەی لە بیرمنگهام دایمەزراندبوو، کۆندی بە چالاکییەکانی ئەم جۆرە بەرنامانە ناساندبوو. سەنتەری نەوەی نوێ سەرکەوتنێکی ناوازەی بەدەستدەهێنێت، دوان لەدەرچوانی توانیان لە زانکۆی ستانفۆرد وەربگیرێنو ئەوانی تریش پەیوەندی بەکۆلێژو زانکۆکانی ترەوە دەکەن. لە ساڵی ١٩٩٦ کۆندی هەستدەکات ئەرکەکانی لە زانکۆی ستانفۆرد ڕێگەی پێنادەن کاتی پێویست لەسەنتەرەکە بەسەر ببات، هەربۆیە لەگەڵ بەرپرسانی یانەی کوڕانو کچان لە پێنینسولا کۆدەبێتەوەو پێکەوە سەبارەت بەپرسی گرێدانی یانەو سەنتەرەکە گفتوگۆ دەکەن. ئیدارەی یانەکە لەسەر گرتنەخۆی سەنتەرەکەو بەڕێوەبردنی کارەکەی ڕێکدەکەوێت. کۆندی بۆ ئەوەی بەوردی سەرپەرشتی سەنتەرەکە بکات، لە پۆستی جێگری سەرۆکی یانەی کوڕانو کچاندا دەمێنێتەوە. لە ساڵی ١٩٩٨دا بەهۆی ئەو پشتگیرییە بێوێنەیەی پێشکەشی کوڕانو لاوانی دەکەن، کۆمەڵەکە ڕێزلێنان دەبەخشێتە کۆندیو سوزان فۆرد. ئەم ڕێزلێنانەش لەمیانەی ئێوارەخوانێکدا بۆ هاووڵاتییە دیارەکان، ئەنجامدرا. شایانی باسە لەو ئێوارەیەدا باوکی کۆندی

پارانەوەیەك ئەنجامدەدات و تیمی موزیکی سەربە سەنتەری نەوەی نویش چەند پارچەموزیکێك لەبەردەم میوانەکاندا پێشکەش دەکەن.

تازە لاوانی سەنتەرەکە ببوونە خێزانە گەورەکەی کۆندی و زۆر گرنگی بە کارەکانی ئەوێی دەدا. شایانی باسە جارێك کۆندی بەباوکی دەڵێت: "ئەم ١٢٥ کورە وەك کوڕی خۆم تەماشا دەکەم" کۆندی پێدانی هەندێك کاتی سەرگەرمی بەو منداڵانەی بەدەست ڕەوشی هەژارییەوە دەناڵێنن، خستبووە سەرشانی و لەمبارەیەوە دەڵێت: "هەرکە وازم لەزانکۆ هێنا هەوڵەکانم لەکاتی دەرەوەی کارکردندا، لەسەر پێدانی ئەو چانسانەی شیاوی ئەو منداڵانەن، چڕکردەوە".

کەسێکی نزیکی کۆندی بەناوی کۆنی رای دەڵێت کە ئەو دڵسۆزییەی کۆندی پیشانی دەدات لە فەلسەفەی بۆ ژیانەوە، هەڵقوڵیوەو دەشڵێت: "کۆندۆلیزا هەمیشە هەستی بەوە کردبوو کە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت کەسێکی تێروتەسەل بێت پێویستە خۆی بۆ پرسێك یەکلایی بکاتەوە".

هەوڵەکانی کۆندی لەگەڵ منداڵە نیشتەجێکانی پالۆ ئالتۆی رۆژهەلات وایانکردبوو کە هەندێك کەس بە نموونەیەکی منداڵانی کەمینەکان ناویان دەبرد. کۆندی بەم ناوبردنە بێزارنەبوو، بەڵام دەیویست منداڵان گرنگی بەرەگەزو ئیتنیك نەدەن و چاو ببڕنە ئەو کەسانەی ئەمان بە نموونەی خۆیان دەزانن و دەڵێت: "هەرگیز ئەم چەمکەم قبوڵنەکردووە، بەوەی کە پێویستە چاوەڕێی کەسێك بیت لە ئاستی خۆتدا بۆ ئەوەی ئەو کارانە بکات کەبەلای تۆوە گرنگن". لێرەدا پێویستە باسی ئەوە بکەین کە فیلمی **کەسایەتییە هاوسۆزەکان** باس لە سەنتەری نەوەی نوێ دەکات و لەکاتی بەستنی کۆنگرەی نەتەوەیی پارتی کۆماری لە ٢٠٠٠ دا، نمایشکراوە.

گرووپێکی تر لە کالیفۆرنیا کە **کۆنگرەی ژنان بۆ هەڵبژاردنی کاندیدانی** سەربە ویلایەتەکەیە، کۆندی بە نموونەیەکی پێشەنگ ناودەبات. لە ساڵی ١٩٩٢دا بەهۆی گرنگی کارەکەی لەگەڵ ئیدارەی بوش و ئەو پلەبەرزەی لەنیشتماندا بەدەستیهێناوە، بە ژنی ساڵ هەڵدەبژێردرێت. سیناتۆری ویلایەتەکە پیکی مۆرگان کە بەدەستهێنانی خەڵاتەکەی راگەیاند دەڵێت: "کۆندی هەموو

ئەو شتانەی هەیە کە ژن دەتوانێت پێیان بگات: زیرەکی، روونیی لەهەڵوێستدا، توانای رێزگرتنی قوڵ و بە نموونەیەکی پێشەنگی لاوان دادەنرێت".

ئەو دەستڕۆییەی کۆندی لە واشنتۆندا هەیەتی رێگەی پێدابوو سەرنجی میدیاکان بەلای خۆیدا رابکێشێت و پلەیەکی بەرزی پێدابوو لە ناوەندەکانی پارتی کۆماریدا، هەروەك رێی پێدابوو بچێتە ناو چەندین رێکخراوی دیار کە کاریان دیاریکردنی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتبوو. لەوانە بۆ نموونە ئەو دیدارە تەلەفزیۆنیانەیە کە لەمیانەی هەواڵەکانی ABC لە ساڵی ۱۹۹۱دا وەك راوێژکاری کاروباری سۆڤیەت ئەنجامیداوە. ئەم دیدارانەی بیرۆکەیەکیان سەبارەت بەو پلەیە دەدا بەدەستەوە کە لەداهاتوودا وەك ئەستێرەیەکی راگەیاندن بەدەستیدەهێنێت. لە ساڵی ۱۹۹۲داو لەمیانەی کۆنگرەی نیشتمانی پارتی کۆماری کە لە هیویستن رێکخراو تێیدا سەرۆك جۆرج بوش بۆ هەڵبژاردنەوەی دیاریکرا، وتارێك پێشکەش دەکات. کۆندی هاورێ لەگەڵ بات بوکانان و چەند سەرکردەیەکی تردا پێکەوە لەسەر شانۆ دەردەکەون کە ئەمانە بەرنامەی نوێی پارتەکەیان بەوپێیەی پرۆتۆکۆلێکە لەپێناو ئەمەریکادا، پێشکەشدەکەن.

پەیوەندیکردنی کۆندی بەبواری سیاسەتی دەرەوە درێژەدەکێشێت تادەبێتە ئەندام لەیانەی لینکۆڵن بۆ کالیفۆرنیای باکورو یەکێتی ئەمەریکی بۆ زانستە سیاسییەکان و پەیمانگای ئەسپین کەتێیدا لەساڵی ۱۹۹۱ تا ۱۹۹۵ بەشداری لەچالاکییەکانی گرووپی ستراتیژی ئەسپیندا دەکات. کاری گرووپی ئەسپین رێکخستنی بەرنامەی سیاسی ناحیزبییە بۆ بەرپرسانی هەردوو کەرتی گشتی و تایبەت، هەروەك بەتێروتەسەلی کار لەسەر رۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەماوەی پاش شەری ساردو پەیوەندییەکانی نێوان ئەمەریکاو سۆڤیەت و دەستپێشخەریی بەرگری ستراتیژی، دەکات. شایانی باسە سەرۆکی پێشووی کۆندی لە کۆشکی سپی بێرنت سکۆکرۆفت لە ساڵی ۱۹۸٤ەوە بەشداریی لە سەرۆکایەتیکردنی گرووپی ستراتیژی ئەسپیندا کردووە.

لە ساڵی ۱۹۹۱دا کۆندی دەگەرێتەوە بۆ زانکۆی ستانفۆردو چەند ئەرکێکی کارگێری دەگرێتەدەست لەوانە لە بەرژەوەندی راهێنەرێکی فوتبۆڵی زانکۆی

ستانفۆردو راگری وەرگرتنی داواکارانی پەیوەندیکردن بە زانکۆو سەرۆکی زانکۆ، بەشداری لەچەند لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەدا دەکات. ساڵی دواتر دەبێتە ئەندامی لیژنەی کارگێڕی کە گرنگی بەو ناوەندانەی ژنان رایاندەپەڕاندو دارشتنی سیاسەتی زانکۆکەو دەستەی پلاندانان، دەدا.

بەهۆی راژەکانی لە کۆشکی سپیو فراوانبوونی پەیوەندییەکانی لەناوەندەکانی پارتی کۆماری، پەرەسەندنێکی گەورە لەژیانی کۆندیدا روودەدات ئەویش چوونەناوەوەی ئەنجوومەنەکانی کارگێڕیی چەندین کۆمپانیا بوو. شایانی باسە ئەندامانی ئەنجوومەنی کارگێڕیی بەپێی شارەزاییو لەبەرئەوەی وەك پسپۆرێك کە دەتوانن جێ پەنجەی پۆزەتیڤ لەسەر کۆمپانیاکە بەجبهێڵن پۆلێن دەکران، هەڵدەبژێردران، ئەمە سەرەڕای توانایان لەسەر هەڵسوکەوتکردن بەهەماهەنگییەکی تەواو لەگەڵ سەرجەم ئەندامانی تری ئەنجوومەنی کارگێڕیدا.

ئەو کەسانەی وازیان لە پۆستە حکومییەکان دەهێنا نارەزوومەندبوون کورسییەك لە ئەنجوومەنە کارگێڕییەکان بەدەستبهێنن و پێیان وابوو ئەو رێگەیە هۆکارێکە بۆ مانەوەیان لەسەر شانۆی دەسەڵات، ئەمە وێڕای ئەوەی سوود لەو پەیوەندییانەیان وەردەگرن کە لە واشنتۆنەوە دەستیان کەوتووە. وەك زۆربەی ئەو ژنانەی پەیوەندییان کردووە بە ئەنجوومەنە کارگێڕییەکانەوە، کۆندی پەیوەندیکردووە بە کۆمپانیاکانی چیڤرۆن، ترانس ئەمەریکا، هیوڵێت باکاردو چەند کۆمپانیایەکی ترەوەو لەگەڵ خۆیدا باکگراوندێکی زۆر جیاوازی دەبرد بۆ ئەو کۆمپانیایانە، جیا لەوەی ئەو پیاوە سپیپێستانەی پۆستی بەڕێوەبەریان لە کۆمپانیاکان دەبرد بەڕێوە. ئەلبێرت کانێللای کوڕ کە لە کۆلێژی کارگێڕیی کاری سەر بەزانکۆی تەکساس A&M، پرۆفیسۆری یاریدەدەر بوو، شیکردنەوەیەك لەسەر جیاوازی نێوان ئەو رێڕەوانەی ژنانو تاکەکانی کەمایەتییەکان دەیگرنەبەر لەپێناو بوون بەئەندام بۆ ئەنجوومەنە کارگێڕییەکان لەلایەكو ئەو رێڕەوانەی پیاوە سپیپێستەکان بۆ هەمان مەبەست دەیگرنەبەر، ئەنجامداوە. ئەلبێرت دەڵێت هەمیشە پیاوانی سپیپێست لە زنجیرەیەك پلە

بەرزکردنەوەی ناو کۆمپانیاکە سودمەند دەبن، بەڵام چەندین کۆسپی ناڕوون ڕێ لەو ژنانەی ئاستی کارگێڕی دەگرن، کە لەم پلە بەرزکردنەوانە سودمەند بن. ئەم پیاوە بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "پیاوان توانا پیشەییەکانیان دەسەلمێنن‌و پلە بەرزکردنەوەکان بەدەستدەهێنن، بەڵام ژنان‌و خاوەن کەمایەتییەکان ئەم پلە بەرزکردنەوانەیان دەستناکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا چەند ڕێگەیەك لەبەردەستدا ماون بۆ ژنان‌و تاکەکانی کەمایەتییەکان کە بەهۆیەوە پلە باڵاکانی ئەنجوومەنە کارگێڕییەکان بەدەستبهێنن، ئەوانیش خۆیان لەپارێزەریی‌و خزمەتگوزاریی حکومیی‌و بوارە زانکۆییەکاندا دەبیننەوە، بەڵام ئەگەر توانیان بڕوانامەی دکتۆرا بەدەستبهێنن" کۆندی خاوەنی باکگراوندێکی باش بوو لەبواری زانکۆو کۆشکی سپیدا هەربۆیە توانای ئەوەی هەبوو باڵاترین پۆستە کارگێڕییەکان بەدەستبهێنێت‌و هاوکات پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ خاوەن پۆستە باڵاکانی کۆشکی سپیدا بکات. دکتۆر کانێلا دەڵێت: "کۆندی پەیوەندییەکی زۆری هەبوو، و زۆر شتی لەبارەی ئەو کەسانەوە دەزانی کە کار لەحکومەتدا دەکەن، هەمیشەش ئەنجوومەنە کارگێڕییەکانیش بەگرنگییەوە دەیانڕوانییە ئەمە. کۆمپانیاکان بەتایبەت بۆ ئەو کەسانە دەگەڕێن کە پێشتر لە ڕاژەی حکومیدا کاریانکردووە تا پەیوەندیان پێوە بکەن، چونکە ئەم کۆمپانیایانە لەژێر سایەی یاساو سانسۆرێکی زۆری حکومیدان"

دکتۆر کانێلا لێکۆڵینەوەیەکی سەبارەت بەو ڕێڕەوە جیاوازانە پێشکەشکردووە کە پیاوان‌و ژنان لەپێناو بوون بە بەڕێوەبەر لە کۆمپانیاکان، دەیانگرنەبەر. دکتۆر کانێلا لە شیکردنەوەکە بەردەوامدەبێت‌و باس لەوە دەکات کە کۆمپانیاکان دەگەڕێن بۆ کەسانی دەرەوەی خۆیان بۆ ئەوەی پەیوەندییان پێوە بکەن بەمەرجێك سەرباری هەبوونی دەسترۆیی لەکۆمەڵگەدا، پیسۆری بواری کارگێڕیی‌و بەدەستهێنانی پشتگیریی بۆ کۆمپانیاکە بن. دانانی کۆندی لەگەڵ کۆمەڵەی سێیەمدا دەگونجێت، واتە ئەو کەسانەی لەکاتی کێشەو قەیراندا، ئەنجوومەنی کارگێڕی بەو بیروبۆچوونانە دەوڵەمەند دەکەن کە بازرگانی نین‌و بیرۆکەو شارەزایی سەبارەت بەکاریگەرێخستنەسەر گرووپە

بەهێزەکانی کۆمەڵگا دەدەنە کۆمپانیا. هەمیشە ئەم کۆمەڵەیە سیاسەتمەداران‌و ئەکادیمی‌و پیاوانی ئاینی‌و ئەو کەسایەتییانەی تر لەخۆدەگرێت کە لەکۆمەڵگەدا دیارن. کۆمەڵەی یەکەم واتە پسۆڕە کارگێڕییەکان لەو سپیپێستانە پێکدێت کە توانیویانە بە پلەپەیژەی کارگێڕیدا سەربکەون، بەڵام دوو کۆمەڵەکەی تر زۆربەیان ئەو ژن‌و کەمیایەتییانە لەخۆدەگرن کە لەبواری زانکۆدا پلەی پێشکەوتوویان هەیە یان شارەزاییەکی سیاسییان هەیە. ژمارەیەکی زۆر لە تاکەکانی ئەم دوو کۆمەڵەیە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆران واتە ٥٦٪ ی ئەو ژنە رەشپێستانەی لێکۆڵینەوەکەیان لەسەر کراوە، خاوەنی بڕوانامەی دکتۆران، لەبەرامبەردا ١٩٪ی پیاوە بەڕێوەبەرە سپیپێستەکان هەمان بڕوانامەیان هەیە. (بۆ نموونە سەرۆك‌و بەڕێوەبەری جێبەجێکاری ئێستای کۆمپانیای چیڤرۆن دەیڤد ئۆ رایلی خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە ئەندازیاریی کیمیاویدا).

لێکۆڵینەوەکەی کانێلا دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ژنان‌و تاکەکانی سەربە کەمایەتییەکان حەزدەکەن لەیەك کاتدا چەند پۆستێکیان لە ئەنجوومەنە کارگێڕییەکاندا هەبێت، ئەمەش پێچەوانەی زۆربەی پیاوە سپیپێستەکانە کە لەیەك کاتدا پۆستی کەمتر دەگرنەدەست. ئەم قسەیە بەسەر کۆندۆلیزاو کچە هاوکارێکی بەناوی کارلا هیزدا راستە. کارلاش کتومت وەك کۆندی بە باکگراوەندێکی حکومییەوە پەیوەندی دەکات بە ئەنجوومەنی کارگێڕیی چیڤرۆنەوەو پێشتر لە ئیدارەکەی بوشی باوکدا وەك نوێنەری بازرگاری ئەمەریکی کاریکردووە کە ئەو کاتە کوندی ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بوو، پێشتریش لەسەردەمی ئیدارەی سەرۆك فۆرددا وەزیری نیشتەجێکردن‌و پەرەپێدانی شار بووە، پێش ئەوەش وەك یاریدەدەری داواکاری گشتی لە لۆس ئەنجلوس کاریکردووە.

هەر کە لە ساڵی ١٩٩١دا گەڕایەوە بۆ زانکۆی ستانفۆرد، کۆندی پەیوەندی دەکات بە ئیدارەی کۆمپانیای چیڤرۆنەوە کە کۆمپانیایەکی فرە ڕەگەزەو کارە نەوتییەکانی، ٢٥وڵات لەخۆدەگرێت. لەوێ سود لە شارەزاییەکانی سەبارەت بەو کۆمارانەی یەکێتیی سۆڤیەت پێکدەهێنن، وەردەگرێت‌و لە کۆماری کازاخستاندا

ئەم شارەزاییەی دەخاتە خزمەتی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی کۆمپانیاکەوە. کۆندی زۆر ماندوونەناسانە کار لەسەر ئەم پرۆتۆکۆلانە دەکات لەوانە پلانێکی کۆمپانیاکە بۆ یارمەتیدانی بنیاتنانی هێڵی ئەو بۆرییە نەوتانەی لە کێڵگەی نەوتی تینگیزەوە دەستپێدەکاتو بەناو باشوری روسیادا دەڕواتو دەگاتە بەندەرێکی روسیا لەسەر دەریای رەش.

هاوشێوەی جۆرج شۆڵتز کە لە پەیمانگای هۆڤەر هاوکاری بوو، کۆندی داهاتەکەی لە زانکۆی ستانفۆرد زیاددەکات ئەویش بەو موچەیەی کە لە کۆمپانیای چیڤرۆن وەریدەگرت کە ٣٥ هەزار دۆلار بوو، ئەمە سەرەڕای ١٥٠٠ دۆلار بۆ هەر کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی کارگێریی کە ئامادەی بێت. کۆندی دەبێتە خاوەنی سێ هەزار پشك لە پشکەکانی چیڤرۆن کە بەهاکەیان دەگەیشتە ٢٤١ هەزار دۆلاری ئەمەریکی. هەروەك توانی ببێتە خاوەنی بارهەڵگرێکی زەبەلاحی نەوت کە بەناوی خۆیەوە ناونرا SS کۆندۆلیزا رایس کەبارهەڵگرێك بوو کێشەکەی دەگەیشتە ١٣٦ هەزار تۆن.

کارکردنی کۆندی لە پرۆژە نەوتییەکانی کازاخستان بەشێك لەوەبەرهێنانە دەرەکییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی بواری وزە نەبێت، هچی تر نەبوو. شایانی باسە کارکردن لە دروستکردنی هێڵی بۆرییە نەوتەکانی کازاخستان کە درێژییەکەی دەگاتە ٩٣٥ میل، کارێکی هاوبەش بوو لەگەڵ یەکێتی هێڵی بۆرییە نەوتەکانی دەریای خەزەرو ساڵی ١٩٩٩ دەستپێکردووە. لە نۆڤەمبەری ٢٠٠١دا یەکەم برەنەوتی هاتوو لە کێڵگەی نەوتی تینگیز لە بارهەڵگرێکی سەرەکی لە بەندەری روسی نۆڤۆرۆسیسیك، بەتاڵکرا. هەر لەو مانگەدا بەیاننامەیەکی رۆژنامەوانیی کۆشکی سپی رایگەیاند کە یەکێتی هێڵی بۆرییەنەوتەکانی درەیای خەزەر "گەورەترین وەبەرهێنانی تاقانەی ئەمەریکایە لە ڕوسیادا"، بەیاننامەکە باس لەوەش دەکات کە کۆمپانیا نەوتییە ئەمەریکییەکان لەسەروو هەمووشیانەوە چیڤرۆنو ئیکسۆن ٦ ملیارو ٢٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی واتە نیوەی تێچووی هێڵی بۆرییە نەوتییەکانیان لەئەستۆگرتووە.

کۆندی بۆ ماوەی دەیەیەك لەگەڵ کۆمپانیای چیڤرۆن کاردەکات، بەلام

چارەنووسى وابوو كە كاركردن لەگەڵ ئەو كۆمپانيايەدا كۆتايى پێبهێنێت ئەويش بەهۆى پەيوەنديكردنى بە ئيدارەى جۆرج بوشى كوڕەوە. كاركردنى كۆندى لە ئيدارەى بوشى كوڕدا تەنها بەوەوە نەوەستا كە پێچەوانەى بەرژەوەندييەكانى چيڤرۆنە لە رۆژهەڵاتى ناوەڕاستو باشورى رۆژهەڵاتى ئاسياو ئەفريكا، بەڵام بووشە هۆى رووبەڕووبوونەوەى داوايەكى ياسايى كە پەيوەندى بە پێشێلكردنى مافى مرۆڤەوە هەبوو لەنێجيريادا. ئەوكاتە بەهۆى ئەوەى يارمەتى هێزەكانى پۆليسى نێجيرياى دابوو لە داپلۆسينى ئەو خۆپيشاندانە جەماوەرييانەى لەدژى خراپ سوودلێوەرگرتنى ناوچەى دەلتاى ئەو وڵاتە، هەڵگيرسابوو، كە ناوچەيەك بوو زۆريەى نەوتى پەدەكى لەخۆگرتبوو، حوكمێك لەدژى كۆمپانياكە دەدرێت.

كۆندى لە ليژنەى سياسەتى گشتى كۆمپانياى چيڤرۆن كاريدەكرد، ئەو ليژنەيە بەرپرسى دياريكردنى كێشە كۆمەڵايەتىو سياسىو ژينگەييەكانى كۆمپانياكە بوو لەناوەوەو دەرەوەى وڵاتدا، هەروەها سەرۆكايەتى ليژنەكەشى دەكرد. شايانى باسە جارێكيان لەميانەى هەڵمەتى هەڵبژاردنە سەرۆكايەتييەكەى ٢٠٠٠داو لەكاتى وروژاندنى بابەتى پەيوەندى كۆندى بە كۆمپانياى چيڤرۆنەوە، لەلايەن يەكێك لە تۆڕە تەلەفزيۆنييە هەواڵييەكانەوە پرسيارى لەسەر پەيوەندى جۆرج بوش لەگەڵ كۆمپانيا نەوتييە گەورەكانو چۆنيەتى كاريگەرى ئەم پەيوەندييانە لەسەر ئيدارەكەى لێ دەكرێت، كۆندى لەوەڵامدا دەڵێت: "كۆمپانيا نەوتييە گەورەكان گرنگييەكى گەورەيان بۆ ئاسايشى ئێمە هەيە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەى ئەم كۆمپانيايانە سەرەڕاى ئەوەى ئاسايشى ويلايەتە يەكگرتووەكان لەبوارى وزەدا دەپارێزن، لەدەرەوەى وڵاتو لێرەش لە ويلايەتە يەككگرتووەكان، توانای دۆزينەوەى نەوتمان پێدەبەخشن"

پرسى داپلۆسينى خۆپيشاندانە بەرگريكارەكانى ژينگەى ئەفريكا لەديدارەكەدا، باس نەكرا، بەڵام كۆندى ساسەتەكانى كۆمپانياكەى لە ويلايەتە يەكگرتووەكان بەرزنرخاند ووتى: "كۆمپانيا نەوتييەكان هەنگاوێكى گەورەيان لە سياسەتى ژينگەدا ناوە. لەڕاستيدا ئەم سياسەتانەش گەيشتوونەتە ئاستى

پشــتگیریکردنی دارایــی پــرۆژە ژینگەییــەکان لەسەرتاســەری جیهانــدا. ئــەم کۆمپانیایانــە هــاولاتی بــاش لــەخۆدەگرن، ئێمــە نــاتوانین بــەبێ نــەوت بــژین و پێویســتە لەســەرمان جێبــەجێکردنی ئــەم کارانــە بخەینــە ئەســتۆی کۆمپانیــا نەوتییــە ئەمەریکییــەکان، مــن شــانازی بــەوەوە دەکــەم کــە پەیوەنــدیم لەگــەڵ کۆمپانیــای چیڤرۆندا هەیــە... هــەروەك پێشــم وایە کــە پێویســتە لەســەرمان زۆر شانازی بکەین بەو کارانەی کۆمپانیا نەوتییــەکان لــەبواری دۆزینــەوەی نــەوت لــە دەرەوەو ناوەوەی وڵاتدا ئەنجامیدەدەن و دڵنیابوون لەوەی ئەوەی پێویستمانە لە وزە دەستمان دەکەوێت"

لــە ١٥-١-٢٠١١ لەکاتێکــدا بــوش وەك راوێــژکاری ئاسایشــی نەتــەوەیی لەئیدارەکەیــدا هەڵیبــژارد، کۆنــدی لــە ئەنجوومــەنی ئیــدارەی چیڤرۆن دەســت لەکاردەکێشێتەوە. پاش سێ مانگ بە دیاریکراوی لەکاتی ئەو قەیرانە وزەیەی باڵی بەســەر کالیفۆرنیــادا کێشــا، کۆمپانیاکــە نــاوی ئــەو بارهــەڵگرە نەوتییــەی کــە پێشــتر بــەناوی کۆندییــەوە نــاونرابوو، دەگۆڕێــت. رۆژنامــەی **ســان فرانسیســکۆ کرۆنیکڵ** دەڵێت ئــەم بارهــەڵگرە "زیــاتر ئاماژەیــەك بــوو بــۆ پەیوەنــدی بــەهێزی نێوان ئیدارەکەی بــوش و کۆمپانیــا نەوتییــە زەبەلاحــەکان". رۆژنامەکــە دەشــڵێت: "کۆشکی سپی رووبەڕووی ئەو پرسیارانە دەبوویەوە کە ئایا ئەو ناوەی نراوە لەو بارهەڵگرە نەوتییە، لەگــەڵ ئیدارەکــەدا دەگونجێت؟". کۆمپانیــای چیڤرۆن باســی ئــەوەی نــەکردووە کــە ئایــا کۆشــکی ســپی داوای لێکــردووە نــاوی بارهەڵگرەکــە بگۆڕێت یان نا، بەڵام وتەبێژێك بەناوییەوە کە فرۆید گۆرێل بوو، دەڵێت: "ئــەم هەموارکردنەمان بۆیــە ئەنجامــدا بۆئــەوەی هــەموو کاریگەرییــەکی ناپێویســت کــە نــاوی کــۆنی بارهەڵگرەکــە دروســتیبکات، لابــەرین". شــایانی باســە نــاوی نــوێی بارهەڵگرەکە کرا بە **ئەڵتایەر ڤۆیاگەر**.

باکگراونــدی کۆنــدی لــە کــارکردن لەگــەڵ کۆمپانیــای چیڤرۆن ئــەو توانایــەی پێدابوو کە هاوڕێیەتی لەگەڵ ژمارەیــەك بەرپرســی حکومەتــدا دروســتبکات، چ ژن بێــت یــان پیــاو، کــە بــەهۆی ئەمەشــەوە ئــەو بەرپرســانە بــەهۆی هاوپــەیمانێتیان لەگــــەڵ کۆمپانیاکانــــدا توشــــی رەخنــــە دەبوونــــەوە بــــەوەی رەنگــــە ئــــەو

هاوپەیمانێتییانە لەدوو توێیدا پێکدادانی بەرژەوەندییەکان یان کاری گوماناوی بازرگانیی هەڵگرتبێت. شایانی باسە هاوکات لەگەڵ کاندیدکردنی هیلاری کلینتۆن بۆ بردنەوەی کورسییەك لە ئەنجوومەنی پیران، چەندین هەواڵ سەبارەت بەپەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆمپانیای واڵ-مارتدا کە گەورەترین کۆمپانیابوو لە ئەرکەنساس، سەرهەڵدەدەن، چونکە هیلاری لەبەرئەوەی خانمی یەکەمی ئەرکەنساس بوو، کورسییەکی لە ئەنجوومەنی ئیدارەی کۆمپانیاکەدا هەبوو. ڕۆژنامەکان لەو کاتەدا باسیان لەوە دەکرد کەسیاسەتی واڵ-مارت لە خستنەسەرکاری ئەو کەسانەی ئەندامی سەندیکاکان نین پێچەوانەی پشتگیریکردنی هیلارییە بۆ سەندیکا پیشەییەکانی تیمستەرزو ڕێکخراوەکانی تر کە ئەمەش ئەو پشتگیرییە بوو کلنتۆن وەك هەڵمەتی هەڵبژاردن بەکاریدەهێنا. دیاربوو کە ئەو دروشمەی هیلاری لەو سەردەمەدا بەرزیکردبووەوەو دەیوت "کاڵای ئەمەریکی بکڕە" دروشمێك بوو جێی گاڵتەجاڕی بوو، چونکە ئەوەندەی واڵ-مارت کاڵای بیانی هاوردەدەکرد هیچ کۆمپانیایەکی تر لەویلایەتە یەکگرتووەکان هاوردەی نەدەکرد.

سەرباری ئەو کورسییەی لە کۆمپانیای چیڤرۆندا هەیبوو، کۆندی لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا چەندین پۆستی لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکاندا بەڕێوەبردووە. ماوەیەك لە کۆمپانیای زەبەلاحی دڵنیایی ترانس ئەمەریکا کە بارەگاکەی لە سانفرانسیسکۆ بوو، بەڕێوەبەربوو. کۆندی کارەکانی ئەم کۆمپانیایەی لە نووسینگەی سەرەکییەوە کە کەوتبووە باڵەخانەکی بەرزی شێوە هەرەمییەوەو ناوی کۆمپانیاکەی لەسەربوو، بەڕێوەدەبرد. لە ئایاری ٢٠٠٢دا کۆندی باڵەخانەی ترانس ئەمەریکا دەخاتە ناو لیستی ئەو ئامانجانەی ڕەنگە ڕووبەڕووی لێدانی تیرۆریستی ببنەوە کە پەیکەری ئازادیو باڵەخانەی ئیمپایەر ستایتیشی لەخۆگرتبوو. کارکردنی کۆندی لە چیڤرۆن هاوکات بوو لەگەڵ کارکردنی لە ئەنجوومەنی کارگێڕی کۆمپانیای ترانس ئەمەریکاو ١٠ ساڵ لەو ئەنجوومەنەدا مایەوە. شایانی باسە ترانس ئەمەریکا لە ڕیزبەندی گەورەترین کۆمپانیاکانی بواری دڵنیایی ژیانیدا لەسەرتاسەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی

ئەمەریکا پلەی شەشەمی داگیرکردبوو و خزمەتگوزاری دارایی‌و پێشینەی پێشکەش دەکرد. لە ساڵی ١٩٩٩ واتە ئەو ساڵەی ترانس ئەمەریکا بە کۆمپانیایەکی هۆڵەندی بەناوی ئایجۆن ئێن فی، فرۆشرا کۆندی وازی لە ئەنجوومەنی کارگێڕیی کۆمپانیاکە هێنا. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا کۆندی لە جیهانی خزمەتگوزاریی داراییدا دەمێنێتەوەو هەمان ساڵ پەیوەندی دەکات بە ئەنجوومەنی کارگێڕی کۆمپانیای چارلز شوابەوە. هەر ئەو ساڵە پەیوەندی دەکات بە جۆرج شۆڵتزەوە کە دوو ساڵ پێشتر پەیوەندی کردبوو بەم دامەزراوەیەوە. کۆندی‌و شۆڵتز لە لیژنەکانی قەرەبووکردنەوەو دەستەبەری جۆرێتی هەمیشە کڕیارەکانی کۆمپانیای شوابدا خزمەتدەکەن.

لە ساڵی ١٩٩٥ کۆندی پەیوەندی دەکات بە کۆمپانیایەکی تری داراییەوە کە ئەویش جی بی مۆرگان بوو کە دامەزراوەیەکی بانکی وەبەرهێن بوو و ١٤٠ ساڵ لەوەوپێش دامەزراوە، لیستی هەمیشەکڕیارەکانی ئەم کۆمپانیایە، جگە لە کۆمپانیاو دامەزراوەو حکومەتەکان، دەگاتە ٣٠ ملیۆن کەس. کۆندی دەبێتە ئەندامی ئەنجوومەنی جیهانی راوێژکاری کە گرووپێك بوو پێکهاتبوو لە گەورەبازرگان‌و کەسایەتییە دیارەکانی حکومەت‌و شۆڵتز سەرۆکایەتی دەکرد. ئەم ئەنجوومەنە هەشت مانگ جارێك بەمەبەستی پێشکەشکردنی راوێژ بە کۆمپانیاکان کۆدەبێتەوە. ئەم پۆستە دەبێتەهۆی ئەوەی کۆندی چەندین کەسایەتی جیهانی بناسێت، هەر لەفەرمانبەرێکی باڵای حکومەتی سەنگافورەوە تا دەگاتە کۆمەڵێك لە بەرێوەبەرانی کۆمپانیاکانی باشوری ئەفریکا، بەرازیل، ژاپۆن‌و مەکسیك.

کۆمپانیای هیولێت باکارد لەسەر دەستی دوو ئەندازیاری دەرچووی زانکۆی ستانفۆرد دامەزراوە تا ببێتە بەشێك لە ناوچەی دۆڵی سیلیکۆن کە ئەوکاتە لوتکەی فراوانبوونی تەکنۆلۆجیا بوو و سەنتەرەکەی دەکەوێتە نزیك زانکۆی ستانفۆرد لەپالۆ ئالتۆ. لە ساڵی ١٩٩١دا کۆندی پەیوەندیدەکات بە ئیدارەی ئەو کۆمپانیایەو ماوەی دوو ساڵ تێیدا دەمێنێتەوە، ئەوەندەی پێناچێت شارەزای بنجوبناوانی ئەم کۆمپانیا دۆستەی زانکۆی ستانفۆرد ببێت.

سەرباری پۆستەكانی لە ئەنجوومەنە كارگێڕییەكانی كۆمپانیا گەورەكان، كۆندی چەندین پۆستی كارگێڕیشی لە دامەزراوەو گرووپی گەورەی لێكۆڵینەوەی سیاسیدا بەدەستهێناوە. لەماوەی نێوان ١٩٩٤و ١٩٩٧ لە چوارچێوەی ئەنجوومەنی ئەمیندارانی دامەزراوەی كارنیجیدا كاریكردووە كە یەكێكە لە دێرینترین دامەزراوە خێرخوازییەكانی وڵات. ئەم دامەزراوەیە بایەخ بەفێركردنو ئاسایشی جیهانیو چەند بوارێكی تر دەدات. هەر لەكاتی خزمەتكردنیدا لە دامەزراوەی كارنیجی، كۆندی لە ئەنجوومەنی راوێژكاری سەربە دەستەی نەهێشتنی ناكۆكییە كوشندەكانی سەربە دامەزراوەكە كاریكردووە. بەوەش كۆندی پەیوەندی دەكات بە كۆمەڵێك لەسەركردەكانی جیهان لەوانە جیمی كارتەر، رۆبێرت ماكنمارا، دیزموۆند توتو، میخائیل گۆرباتشۆف. دەستەكە ١٦ ئەندامی لەخۆگرتبوو و ئەركەكانیشی لێكۆڵینەوە بوو لەو رێگایانەی دەبنەهۆی ئاشكرابوونی چەكی ناوكی. لە ساڵی ١٩٩٥دا دەستەكە راپۆرتێك لەژێر ناوی دۆزینەوەی گشتگیری مادده پەرتبووەكان: دەستپێشخەریی پێشنیازكراو بڵاودەكاتەوە. كۆندی وەك ئەندامێكی ئەنجوومەنی راوێژكاری دەستەكە، شارەزایی خۆی لەبواری چەكی ناوكیی ویلایەتە یەكگرتووەكانو یەكێتیی سۆڤیەت لەو دەستەیەدا پێشكەشدەكات.

ئەمە یەكەم كاری كۆندی نەبوو لەگەڵ دامەزراوەی كارنیجیدا، پێشتریش كاری لەگەڵ ئەم دامەزراوەیەدا كردووە، لە ساڵی ١٩٨٨و ١٩٨٩دا بەشداری لە ئەنجوومەنی ئەمیندارانی دامەزراوەی كارنیجی بۆ ئاشتی جیهانی كردووە كە خۆی بەكۆنترین دامەزراوەی راوێژكاری لە وڵاتدا لەقەڵەمدەدات. ئامانجی ئەم دامەزراوەیە لێكۆڵینەوەیە لە پەیوەندییەكانی نێوان حكومەتو كۆمپانیاو رێكخراوە نێودەوڵەتییەكانو كۆمەڵگەی مەدەنیو لە رێگەی سەنتەری كارنیجی لە مۆسكۆ، زیاتر كار لەسەر پەیوەندییەكانی نێوان روسیاو ویلایەتە یەكگرتووەكاندا دەكات.

لەنێوان ساڵەكانی ١٩٩٢ بۆ ١٩٩٧ كۆندی وەك خوێندكارێكی زانكۆ، لە ئەنجوومەنی كارگێڕی كۆمپانیای ڕانددا كاردەكات. دامەزراوەی راند تایبەت

بەلێکۆڵینەوەیەو یەکەم دامەزراوەیە کە نازناوی دامەزراوەی راوێژکاری لە وڵاتدا پێدراوە. کۆمپانیاکە بەئەرکی سەرەکی خۆیەوە ناوەستێت کە تەکنیکی سەربازی بوو، بەڵکو دەستدەکات بەهەنگاونان بەرەو بوارەکانی فێرکردنو چاودێری تەندروستیو ئابوری جیهانیو چەند پرسێکی تریش. شایانی باسە لەهەمان ئەو کاتەی کۆندی کاری لەو کۆمپانیایەدا دەکرد، بێرنت سکۆکرۆفتیش کاری لە ئەنجوومەنی کارگێڕی دامەزراوەکەدا دەکرد.

لە ساڵی ١٩٩٧دا کۆندی پەیوەندیدەکات بەئەنجوومەنی کارگێڕی دامەزراوەی هیوڵیت، کە کۆمپانیایەکی جیا بوو لەو دامەزراوەی هیوڵیت باکاردەی پێشتر کاری تێداکردبوو. دامەزراوەی هیوڵیت بڕی ١٢٠ ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی بەشێوەی بەخشش دەدات بەو رێکخراوانەی ئەرکیان پێشکەشکردنی پرۆژەی پۆزەتیڤە بۆ کۆمەڵگا. کۆندی وەك ئەندامێکی ئەنجوومەنی کارگێڕی یارمەتیدەر بوو لەدانانی بودجەو بڕیاردان لەسەر وەبەرهێنانو پێداچوونەوەی کارەکانی ئەو دامەزراوانەی پشتگیرییان لە دامەزراوەی هیوڵیتەوە وەردەگرت، هەروەها لە ئەرکێکی تریشدا بۆ ئەنجوومەنەکە بەشداریدەکرد ئەویشهەڵبژاردنی سەرۆکی دامەزراوەکەبوو.

دەستەی هەڵبژاردن پۆڵ برێست بۆ ئەم پۆستە کاندیددەکات، برێست کە راگری پەیمانگای ماف بوو لە زانکۆی ستانفۆرد دەکرێتە سەرۆکی دامەزراوەی هیوڵیت. بەمەش پۆڵ توانی ببێتە نزیکترین هاوکارو هاوڕێی کۆندی. پۆڵ دەڵێت: "شارەزایی زۆری کۆندی، لەبەشی نێودەولەتی دامەزراوەکەدا زیاتر دەرکەوت. کۆندی لەو بارەیەوە گرنگیپێدانی خۆی دەرخستو بەتایبەت لەو بوارانەدا یارمەتی پێشکەش بەدامەزراوەکان دەکرد، بەڵام پێویست بوو لەسەریشی وەك ئەندامانی تری ئەنجوومەنی کارگێڕی تاووتوێی پرسەکانی تریش بکات". شایانی باسە ئەنجوومەنەکە ساڵی چوار جار کۆدەبوویەوە.

لە ساڵی ١٩٩١ بۆ ١٩٩٣ کۆندی لە ئەنجوومەنی ئەمینداراانی وەقفی نەتەوەیی بۆ کارە مرۆڤایەتییەکان کاریکردووە کە ئاژانسێکی فیدراڵی بوو و بەخششی پێشکەش بەدامەزراوەی کولتوریو لێکۆڵەران دەکرد. کاتێکیش پەیوەندیدەکات

به ئه‌نجوومه‌نی حاكمانی سانفرانسیسكۆ سیمفۆنییه‌وه، كۆندی ده‌بێته‌ یه‌كێك له‌ كه‌سایه‌تییه‌ رۆشنبیرییه‌ دیاره‌كانی ئه‌و شاره‌.

به‌ئامانجی كاركردن له‌ ئه‌نجوومه‌نی ئه‌میندارا‌ن كه‌ باڵی بنچینه‌یی كارگێڕی زانكۆی نۆته‌ردام بوو، كۆندی له‌سه‌ره‌تای ساڵی ١٩٩٤دا به‌شێوه‌یه‌كی پچڕپچڕ واته‌ سێ جار له‌ ساڵێكدا، ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ زانكۆكه‌. كۆندی پاش ئه‌وه‌ی پێشتر له‌ ئه‌نجوومه‌نی راوێژكاری سه‌ر به‌كۆلێژی هونه‌رو ئادابدا كاریكردبوو، دواتر بۆ ئه‌ندامێتی ئه‌نجوومه‌نه‌كه‌ كه‌ ٣٥ كه‌س له‌خۆده‌گرێت هه‌ڵبژێردرا. له‌راپۆرتێكدا كه‌ **رۆژنامه‌ی ره‌شپێسته‌كان بۆ خوێندنی باڵا** له‌ ساڵی ٢٠٠٠ دا بڵاویكردووه‌ته‌وه‌، ئاماژه‌ به‌وه‌ دراوه‌ كه‌ زانكۆی نۆته‌ردام له‌هه‌موو ئه‌و زانكۆ گه‌ورانه‌ی تر كه‌ لێكۆڵینه‌وه‌ی رۆژنامه‌كه‌ گرتبوونیه‌وه‌، ئه‌میندا‌ری ره‌شپێستی زیاتری تێدایه‌. راپۆرته‌كه‌ ئاماژه‌ی به‌وه‌ دابوو كه‌ ئه‌نجوومه‌نی ئه‌م زانكۆیه‌ حه‌وت ئه‌ندامی ره‌شپێستی له‌خۆگرتووه‌ كه‌ یه‌كێكیان كۆندییه‌. له‌ ساڵی ١٩٩٥دا زانكۆكه‌ دانده‌نێت به‌سه‌ركه‌وتوویی كۆندی‌و پله‌ی دكتۆرای فه‌خری پێده‌دات‌و دواتریش داوای لێده‌كات وتاری ئاهه‌نگی ده‌رچوونی پۆله‌ كۆتاییه‌كانی ئه‌و ساڵه‌ پێشكه‌شبكات. دوو ساڵ پاش ئه‌وه‌ش زانكۆی ناوبراو جارێكی تر رێزلێنانێكی تری پێده‌به‌خشێت ئه‌ویش ئه‌وه‌بوو كه‌ ناوی نا نموونه‌یه‌كی نه‌ته‌وه‌یی بۆ راژه‌ فێركارییه‌كان له‌ ئه‌مه‌ریكادا. كۆندی ئه‌م رێزلێنانه‌ی له‌كاتێكدا پێدرا كه‌ زانكۆكه‌ سه‌رقاڵی هه‌ڵمه‌تێكی گه‌وره‌ی كۆكردنه‌وه‌ی كۆمه‌ك به‌خشین بوو. هه‌ر له‌میانه‌ی ئه‌م هه‌ڵمه‌ته‌دا، زانكۆكه‌ فیلمێك به‌ناوی **نه‌وه‌كان: ئاهه‌نگه‌كانی نۆته‌ردام** به‌رهه‌مده‌هێنێت كه‌ له‌به‌رده‌م ده‌رچوان (متخرجين) له‌سه‌رتاسه‌ری وڵاتدا نمایشكرا. ته‌وه‌ری سه‌ره‌كی فیلمه‌كه‌ باسكردن بوو له‌ چوار ده‌رچووی رۆته‌ردام كه‌ به‌شداریی كارایان هه‌بووه‌ له‌ بواره‌كانی فێركردن‌و كڵێسه‌و كۆمه‌ڵگه‌دا.

كۆندی بڕوانامه‌ی دكتۆرای فه‌خری له‌ نۆته‌ردام وه‌رده‌گرێت، دواتر له‌ ساڵی ١٩٩١دا زانكۆی مۆرهاوس نازناوی دكتۆری فه‌خری له‌ یاساكاندا پێده‌به‌خشێت. له‌ ساڵی ١٩٩٤یشدا زانكۆی ئه‌لاباما بڕوانامه‌ی دكتۆرای له‌ ئادابی مرۆییدا پێده‌دات. زانكۆی مۆرهاوس دوو ساڵ پاش شه‌ڕی ناوخۆی ئه‌مه‌ریكا دامه‌زراوه‌و به‌كۆنترین

زانکۆی رەشپێستەکان لە وڵاتدا لەقەڵەم دەدرێت، زۆربەی خوێندکارەکانی ئەم زانکۆیە نێرینەو رەشپێستن‌و لیستی دەرچووەکانی ئەم زانکۆیە چەندین کەسایەتی بەناوبانگ لەخۆدەگرێت لەوانە مارتن لۆسەر کینگی کوڕ، پاڵەوانی پێشووی ئۆلۆمپیات ئیدوین موسیس، دەرهێنەری فیلم سبایك لی، ئەکتەری بەناوبانگ ساموێل ئێل جاکسۆن. ئەو رێزلێنانەی زانکۆی ئەلاباما بە کۆندی بەخشی گوزارشتی لەو پێشکەوتنەی وڵات دەکرد کە لەبواری تایبەتی تێکەڵکردنی رەشپێست‌و سپیپێستەکاندا بەدیهاتبوو، لەبەرئەوەی لەسەرەتاکانی شەستەکانی سەدەی رابردوودا کاتێك جۆن‌و ئەنجیلینا دەیانویست بەردەوامبن لەخوێندن، ئەم زانکۆیە سیاسەتی جیاکاریی نەژادی جێبەجێدەکرد.

هەڵبژاردنی کۆندی وەك ئەندامی ئەکادیمیای ئەمەریکی بۆ هونەرو زانست لە بەهاری ساڵی ١٩٩٧دا، سەرکەوتنی لەبواری زانکۆییدا دووپاتکردەوە. ئەم رێزلێنانە دەدرێت بەو کەسانەی پشکی دیاریان لە بوارەکانی زانست، لێکۆڵینەوە، پرسە گشتییەکان‌و هونەردا، هەبووە. کۆندی یەکێکبوو لەو یانزە مامۆستایەی بۆ ئەندامێتی ئەو ساڵەی ئەکادیمیاکە کاندیدکرابوون. ساڵی دواتر گۆڤاری چەینج کە وتەبێژی یەکێتی ئەمەریکی بۆ فێرکردنی باڵایە، کۆندی بەئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردە لاوەکانی ئەکادیمیای ئەمەریکی هەڵدەبژێرێت، دواتر پاش ئەوەی مینحەیەکی لێکۆڵینەوە کە ماوەکەی سێ ساڵ بوو، پێدەدرێت دەگەڕێتەوە بۆ ستانفۆردو پەیوەندی بە دامەزراوەی هۆڤەر، دەکاتەوە. ئامانجی ئەم مینحەیە پشتگیریکردنی پرۆژەکانی لێکۆڵینەوە بوو، هاوکات کۆندی لەوانەوتنەوە بۆ بەشەکانی زانستە سیاسییەکان بەردەوام دەبێت.

پاش کۆتاییهاتنی کارکردنی لە کۆشکی سپی لەمیانەی ئیدارەی بوشی باوکدا، پلەوپایەی کۆندی لە جیهانی کۆمپانیا گەورەکان‌و زانکۆو جیهانی رۆشنبیریدا بەهێزتردەبێت. لە ئایاری ١٩٩٣دا کە تەمەنی ٣٨ ساڵ بوو، کۆندی پلەکەی بەرزدەکرێتەوەو لە زانکۆی ستانفۆرد دەبێتە پرۆفیسۆری زانکۆ. هاوکات کۆبوونەوەیەك بەمەبەستی تاووتوێکردنی دامەزراندنی پۆستێکی نوێ لە زانکۆکە ئەنجامدەدرێت، ئەم پۆستە بەیەکێك لەبالاترین پۆستەکانی زانکۆ

دادەنرێت‌و لە زۆربەی زانکۆ سەرەکییەکاندا رێگەخۆشکەرە بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆکایەتی زانکۆ. پاش تێپەڕبوونی مانگێك بەسەر پلە بەرزبوونەوەی کۆندی بۆ پۆستی پرۆفیسۆر، پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە گێرهارد کاسپەرەوە پێدەگات کە سەرۆکی زانکۆی ستانفۆرد بوو. کۆندی‌و گێرهارد پێکەوە گفتوگۆی زۆر لەبارەی پەرەپێدانی زانکۆوە ئالوگۆڕدەکەن، هەردووکیان گرنگیدانێکی هاوبەشیان بۆ کۆلێژی زاستە سیاسییەکان هەبوو. بەشێکی ئەو گرنگیدانەی گێرهارد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێش ئەوەی پۆستی راگری زانکۆی ماف لە شیکاگۆ وەربگرێت، دوو ساڵ وەك پرۆفیسۆری یاریدەدەر لەوانەی زانستە سیاسییەکاندا کاریکردبوو. ساڵی پێشتر لەکاتێکدا کۆندی لەچوارچێوەی لیژنەی لێکۆڵینەوەی سەرۆکایەتیدا سەردانی شیکاگۆی کردبوو، وەك کاندیدی ئەم پۆستە، گێرهارد دەبینێت. لەو کاتەدا گێرهارد پۆستی بەڕێوەبەری زانکۆی شیکاگۆی هەبوو کە دووەم گرنگترین پۆستە لە زانکۆکەداو بەرپرسی بالای بودجەو فێرکردنی زانکۆیی بوو و بەرپرسێکی راستەوخۆی بەردەم سەرۆکی زانکۆ بوو. لەیەکەم دیداریدا لەگەڵ کۆندی، گێرهارد هەست بەوە دەکات کە یەکێکە لەدیارترین ئەکادیمیستەکان کە لەژیانیدا بینیونی. ئەم پیاوە دەڵێت: "بەبەهای زانکۆیی‌و مەودای فکری‌و رەوانبێژی کۆندی، زۆر سەرسام بووم".

لەو رۆژەی مانگی تەموزی ١٩٩٣و پاش تێپەڕبوونی ساڵێك لەسەر یەکەم دیدار، کۆندی بانگهێشتنامەیەکی لەلایەن گێرهاردەوە بۆ کۆبونەوە لە نووسینگەکەی، پێدەگات. هیچ هۆکارێك لەلای کۆندی نەبوو کە ببێتەهۆی دروستکردنی ئەو بڕوایەی کە ئەم کۆبوونەوەیە لەتەنها هەلێك بۆ قسەکردن لەسەر بڕیارێك لەبڕیارەکانی لیژنەی راوێژکاریی، زیاتر بێت یان کارەکە پەیوەندی بەپرسێکی کارگێڕییەوە هەبێت، بەلام دواتر هەستدەکات ئەم کۆبونەوەیە دەتوانرێت بەهەموو شتێك جگە لە کۆبوونەوەی رۆتینی، ناوببرێت.

گێرهارد دەڵێت: "بەپێچوپەنا نەچوومە ناو ناخی باسەکەوە، پێم وت: کۆندی دەمەوێت ببیتە بەڕێوەبەری داهاتووی زانکۆ، بێدەنگییەکی راستەقینە باڵی بەسەردا کێشا"

ئـەم پێشـنیارە زۆر بەرپرسـیارێتی بـۆ کۆنـدی لـەخۆگرتبوو. ئەگـەر ببێتـە بەڕێوەبـەری زانکۆکـە دەبێتـە یەکـەم کەسـی رەشپێسـتو یەکـەم ژنـی گـەنج کـە بەدرێژایی مێژوو ئەم پۆستە بگرێتەدەست. ئـەو کاتـە کۆنـدی تەمـەنی ۳۸ سـاڵان بوو، ئەمەش مانای ئەوەیە کە بەلایەنی کەمەوە ۲۰ ساڵ لەو کەسانەی پێش ئـەو، ئەو پۆستەیان وەرگرتووە، گەنجترە. کۆندی بەمە دووەم بەرزترین پۆستی زانکۆکـە دەبات بەڕێوە، ئەمەش مانای‌وایـە کـە بـازدان بەسـەر پۆستە باوەکـانی پـێش ئـەم پۆستەدا دەنێت وەك کورسی پرۆفیسۆرو پۆسـتی راگـری کۆلێـژ. ئـەم پۆسـتە مانـای ئەوەشە کە کۆندی دەبێتە بەرپرسی تەواوی بودجـەی سـاڵانەی زانکـۆ کـە دەگاتـە ملیارێـك‌و ٥٠٠ ملیـۆن دۆلاری ئەمـەریکی بـەبێ ئـەوەی پێشـتر هـیچ ئـەزموونێکی لـەدارایی کۆلێژەکانـدا هـەبێت. بـەم شـێوەیە کۆنـدی بـاڵاترین پۆسـتی ئـەکادیمی لەزانکۆکەدا بەدەستدەهێنێت‌و دەبێتـە بەرپرسـیاری ئـەو بڕیارانـەی پەیوەنـدییان بەو سیاسەتانەی زانکۆوە کەکاریگـەرییان لەسـەر دەسـتەیەکی فێرکـاریی پێکهـاتوو لە ۱٤۰۰ کەس، هەیـە. سـەرەڕای ئـەوەش گێرهـارد بـڕوای وابـوو کۆنـدی بەباشـترین شـێوە کارەکـانی رادەپـەڕێنێت. گێرهـارد دەڵێـت: "دەمزانـی کـە ئـەم دامەزراندنـەی کۆندی هەنـدێك مشـتومڕ دروسـتدەکات، چـونکە زانکۆکـان پێشـبینی ئـەوە دەکـەن ئەو کەسەی ئەم پۆستە دەگرێتەدەسـت خـاوەنی تۆمـارێکی دیـاریکراوی راژە بێـت، بۆ نموونە وەك ئەوەی راگر یان سەرۆکی بەشێك بێت لـە زانکـۆ....بـەڵام بـڕوام زۆر بەهێزبوو کە کۆندی خاوەنی توانایەکی باڵایە لەو بوارەدا".

کاسـپەر سـەرنجدەدات زۆربـەی ئـەو مشـتومڕانەی لـەبارەی دامەزراندنەکـەی کۆندییەوە وروژێندران نەبەهۆی ئیتنی کۆندییەوە بوون، نەبەهۆی ئـەوەوە بـوون کەژنـە، نەلەبـەر ئـەوە بـوون کـە خـاوەنی شـارەزایی پێویسـت نیـە، بـەڵکو زیـاتر لەبەرئـەوە بـوون کـە لەکاتێکـدا دیموکراتـەکان زۆربـەی پۆسـتە باڵاکـانی زانکـۆ ئەمەریکییـەکانیان لەدەسـتدابوو، ئـەم سـەریە کۆمارییەکانـە. هەنـدێك لـە ئەنـدامانی دەسـتەی وانەوتنـەوە نیگـەرانی خۆیـان لـەوە نیشـاندەدەن کـە رەنگـە بـیروڕا سیاسـی‌و کۆنـەپارێزەکانی کۆنـدی کاریکاتەسـەر پرۆسـەی بڕیـاردان لـە زانکۆکـەو بـەوەش بـەرەو راسـتڕەویی ببـات. لـەوەڵامی ئـەم مەترسـییانەدا کۆنـدی

رايگەياند بە هيچ شێوەيەك ناهێڵێن بیروڕا سياسييەكانى ڕۆڵيان لەپۆستەكەيدا هەبێت.

كۆندى كاتێك ئەم پۆستەى وەرگرت، زانكۆى ستانفۆرد وەك سەرجەم زانكۆكانى تر بەقۆناغێكى هێندە سەختدا تێپەڕدەبوون بەشێوەيەك ناچاردەبوون بەهۆى سستبوونى ڕەوڕەوەى ئابوورييەوە، بودجەيان كەمبكەنەوە. بەهۆى ئەو زەمينلەرزەيەى لەئۆكتۆبەرى ١٩٨٩، ناوچەى دورگەى هەژاندو بووەهۆى زيانگەياندنێكى زۆر بە ٢٠٠ بيناى زانكۆكە، ئەم زانكۆيە ناچاردەبێت بۆ چاككردنەوەى ئەو زيانانە ڕووبەڕووى خەرجييەكى زۆر ببێتەوە كە دەگەيشتە ٢٠٠ مليۆن دۆلارى ئەمەريكى. كاتێك كۆندى پۆستى بەڕێوەبەرى زانكۆكە دەگرێتەدەست، بيست مليۆن دۆلارى ئەمەريكى كورتهێنانى بودجەى زانكۆكەى هەبوو. پاش وەرگرتنى ئەم پۆستە، كۆندى دەڵێت:"زانكۆى ستانفۆرد وەك زانكۆكانى تر داينەمۆى گۆڕانكارييە، پێم وايە كەسێكى بەختيارم كە هەلێكم دەستكەوتووە بۆ دارشتنى وەڵامدانەوەى ئەمەريكا بۆ ئەو ڕوداوە نائاسييانەى شەوى سارديان كۆتاييپێهێناوە، جێى شانازيمە كە سەرۆك كاسپەر سەبارەت بە بەڕێوەبردنو ڕووبەڕوبوونەوەى ئەو كۆسپانەى دێنەبەردەم زانكۆى ستانفۆرد، متمانەى بە تواناكانم هەيە". كۆندى باس لە هۆكارێكى تريش دەكات كە بەهۆيەوە ئەم پابەندبوونەى لەئەستۆگرتووە، ئەويش ئەو سەرساميیە قوڵەيە كە بەرامبەر بەو زانكۆيە هەيەتى كە ساڵ دواى ساڵ بەهێزتر دەبێت. كۆندى دەشڵێت:"پێش دوو ساڵ لەمەوبەر كاتێك بڕيارمدا بەگەڕێمەوە بۆ زانكۆكە، ئەو كارەم بە پابەندبوونو قبوڵكردنێكى لێوانلێو لە ئازادى بيروڕاوە ئەنجامدا كە لەلايەن زانكۆكەوە ڕێگەى پێ دراوە".

بەهۆى دامەزراندنى لەم پۆستە نوێيەدا كۆندى گۆڕانكارى لەپلانە هاوينەكانيدا ئەنجامدەدات. ڕۆژنامەى نيويۆرك تايمز باس لەوە دەكات كە پێشتر كۆندى بەمەبەستى ئەنجامدانى چەند لێكۆڵينەوەيەك بۆ دانانى كتێبێك، پلانى دانابوو بۆ ئەنجامدانى گەشتێكى چوار هەفتەيى بۆ كێڵگە نەوتييەكانى كازاخستان. كۆندى ئەوەى لەلا ڕوونبووەوە كە پلانەكانى لە كاركردن وەك

بەڕێوەبەری کۆمپانیای شیفرۆن پێچەوانەی پرۆگرامە ئەکادیمییەکانیەتی، بەهۆی ئەمەوە ئەم گەشتەی هەڵدەوشێنێتەوە تا هەوڵەکانی خۆی بۆ پرسی دانانی بودجەیەك بۆ زانکۆکە تەرخانبکات. کۆندی پێشتر بودجەی ملیار دۆلاریی دانەنابوو، پێویستبوو لەسەری کار بۆ کەمکردنەوەی کورتهێنانی دارایی بکات کە ئەمەش وای پێویست دەکرد ژمارەی کارمەندو بودجە کەمبکاتەوە، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی لەچەند ئاستێکی زانکۆدا کەسێکی خۆشەویست نەبێت. کۆندی بەوە دەناسرێت کە پەیداکردنی بنکەی جەماوەری یەکێك نییە لەبەرنامەکانیو هەست بەپێویستی بوونی هەندێك دژیەکیی دەکات لەبیروبۆچووندا لەپێناو ئەوەی زانکۆکە بگەیەنێتە رەوشێکی تەندروستی داراییەوەو لەو کێشانە نەدەترسا کە کەمردنەوەی قەبارەی کۆلێژەکانو فەرمانبەران دروستیدەکردن. کۆندی دەڵێت: "پێشتر بەخوێندکارەکانم وتبوو، ئەگەر بینیتان ئەوانەی هاوڕێیەتیان دەکەن لەهەموو شتێکدا هاوڕاتان بوون، ئەوە بزانن کە ئەو کەسانە گونجاو نین بۆتان".

هەندێك کەس لە زانکۆکە پێیان وابوو رزگاربوون لە کورتهێنانی بودجە خەوێکی خەیاڵییەو بەدیهاتنی مەحاڵە، بەڵام کۆندی چەند مانگی کەمی دواتری بۆ دارشتنی ستراتیژێك تەرخانکرد کە لەمیانەی یاداشتێکدا لەمانگی نۆڤەمبەری ۱۹۹۳دا پێشکەشی راگرو بەڕێوەبەرەکانی کرد. پلانەکە داوای کەمکردنەوەی بودجەی کۆلێژەکانو ئەو خزمەتگوزارییانەی پێشکەش بەخوێندکاران دەکرانو کەمکردنەوەی هەندێك خزمەتگوزاری ترو خستنەسەریەکی ئەرکەکانی هەندێك لە فەرمانبەرەکانی دەکرد. لەمیانەی دیدارێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی زانکۆکە، خوێندکاران دڵنیادەکاتەوە کە زانکۆکە لە قەیرانەکە رزگاری نەبووە، بەڵام ماندونەناسانە هەروەك دامەزراوەکانی تری وڵات، بۆ گەیشتن بەچارەسەر کاردەکات. لەو دیدارەدا کۆندی دەڵێت: "لەڕاستیدا بیرم لەوە نەکردۆتەوە کەئەم قەیرانە وەك قەیرانی بودجە سەیربکەم. پێموایە پێویستە لەسەرمان لەم ساڵانەی نەوەدەکاندا کاروبارەکانمان رێکبخەین، هەموو دامەزراوەیەکی ئەمەریکی پێویستە هەنگاوی لەوەی ئێمە بنێت".

هاوكاری كۆندی، كویت پلاكەر دەڵێت: "بیروباوەڕێكی كلاسیكی باوبوو كە مەحاڵە ئەوە بكرێت.... و كورتهێنان بووەتە بەشێك لە پێكهاتەی زانكۆكەو پێویستە لەگەڵیدا بگوزەرێین، بەڵام كۆندی دەڵێت: "نەخێر! لەماوەی دوو ساڵدا دەتوانین لەگەیشتن بەڕێككردنەوەی بودجەدا سەركەوتن بەدەستبهێنین".
كارەكە پێویستی بەچەند بڕیارێكی سەخت هەبوو، بەڵام هەولەكان سەركەوتنیان بەدەستهێناو ئەوانەی پشتگیری داراییان دەكرد گەیشتنە ئەو بڕوایەی كەخودی زانكۆكە دەتوانێت بودجەكەی رێكبكاتەوە، بەڵكو لەوەش زیاتر دەتوانێت دەستكەوتی دارایی زیادەش بۆ خۆی بەدەستبهێنێت". پلانەكە چەندین بڕیاری سەختی لەخۆگرتبوو لەوانە دەركردنی چەندین كەس كە كارێك بوو كۆندی زۆری لێ دەترسا، بەڵام هاوكات لەپێناو گۆڕینی رێڕەوی بودجەدا، زۆر بەپێویستی دادەنێت. لەمبارەیەوە دەڵێت:"بەهۆی ئەو كاریگەرییانەی گۆڕانكارییەكە دەیكردە سەر ژیانی خەڵك هەمیشە هەستم بەغەمباریی دەكرد. هەوڵمدا ئەوەندەی لەتوانامدا بێت كاریگەرییەكانی گۆڕانكارییەكە لەسەر ژیانی ئەو كەسانەی ناچاربووم دەریانبكەم، كەمبكەمەوە. جاری واهەیە پێویستە لەسەرت بڕیاری سەخت بدەیت، هەروەها پێویستیشە لەسەرت لەبەردەوامبوونی سەركەوتنی ئەو بڕیارە سەختانە، دڵنیا بیت".

بەهیچ شێوەیەك ئەم ئەركەی ئاسان نەبوو و زۆرجاریش دڵخۆشكەر نەبوو. كۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت:"لەدوو ساڵی یەكەمدا ئەو كارانەی كە دەمتوانی رەزامەندییان لەسەر نیشان بدەم، كەمبوون. پێویستبوو لەسەرمان یەكە كارگێڕییەكانی چەند كۆلێژێك رێكبخەینەوە، دەركردنی فەرمانبەر كارێكی سەختەو بێگومان دڵخۆشكەر نییە". كۆندی هەستدەكات دەركردنی چەند بڕیارێكی روونو پاراستنی رێڕەی ئەم بڕیارانە زۆر لەوەی كارەكان بۆ ماوەی چەندین مانگو هەفتە وەك خۆیان جێبهێڵدرێن، سودمەندترەو شانازی بەوەشەوە دەكات كە ژنێكە توانای بڕیاردانی سەختی هەیە. لەمبارەیەوە دەڵێت: "پێم وایە مرۆڤ پێویستە سەبارەت بەهەندێك كاروبار یەكلاكەرەوە بێت، بەبڕوای من خەڵك بیستنی وشەی نەخێر لەوەڵامەدانەوە بەباشتر دەزانێت"

جگە لەکورتهێنانە داراییەکە، سێبەری هەورێکی رەش باڵی بەسەر زانکۆی ستانفۆرددا کێشابوو کە هاوکات بوو لەگەڵ وەرگرتنی پۆستی بەڕێوەبەری زانکۆ لەلایەن کۆندییەوە. لەو کاتەدا زانکۆ سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوو سەبارەت بەزیادبوونی خەرجی ناڕاستەوخۆی زانکۆکە، ئەم خەرجیانەش بەشێکن لەو داراییەی بۆ تەواوکردنی هەزاران پرۆژەی لێکۆڵینەوە لەزانکۆکە کە لەلایەن وڵاتەوە پشتگیریدەکرا، بەکارهاتبوون. شایانی باسە پرۆژە فیدراڵییەکانی لێکۆڵینەوە بە دوو شێدەست لەبەخشش، پشتگیری دارایی دەکرێن: راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ. جۆری یەکەمیان پێویستییەکانی تاقیگەو پێویستییەکانی ترو موچەی ئەو مامۆستایانەی کار لەسەر پرۆژەیەکی دیاریکراو دەکەن، لەخۆدەگرێت. تێچووە ناڕاستەوخۆکانیش خزمەتگوزارییە گشتییەکان، کەرەستەکانی کتێبخانەکان، پاراستنی بیناکان، بەکارهێنانی ئەو فەرمانبەرانەی پشتگیری پێشکەشدەکەن دەگرێتەوە، ئەمە جگە لەچەند بەندێکی تر کە ژماردنیان ئاسان نییە. زانکۆکەو حکومەت لەسەر دابینکردنی رێژەی ئەو کەرەستەو خزمەتگوزارییانە رێکدەکەون کە پێویستە بخرێنە چوارچێوەی خەرجییە راستەوخۆکانەوە. ئەو خەرجییە ناڕاستەوخۆیەی زانکۆی ستانفۆرد داوایکردبوو گەیشتبووە ٪٤٤ کە ئەم رێژەیەش لەهەموو رێژەکانی زانکۆکانی تر لەوڵاتدا بەرزتربوو. بەهۆی ئەمەشەوە ئەو مامۆستایەی ١٠٠ هەزار دۆلاری لەبەرامبەر پرۆژەیەکی لێکۆڵینەوەداوەردەگرت دەیتوانی ٧٤ هەزار دۆلاری تریش لەپێناو خەرجی ناڕاستەوخۆکاندا وەربگرێت، بەوەش بەهای بەخششەکە دەگەیشتە ١٧٤ هەزار دۆلار.

لە ساڵی ١٩٩٠دا نووسینگەی فیدراڵی کە چاودێری بودجەی لێکۆڵینەوەکان دەکات، بانگەشەی ئەوە دەکات کە ستانفۆرد ملیۆنەها دۆلاری لەسەر خەرجییە راستەوخۆکانی زیادبووە. ئەو پرۆسە چاودێرییە داراییەی کە دواتر ئەنجامدرا دەبێتە جێگرنگی میدیاکان و ناوبانگی زانکۆی ستانفۆرد توشی ناوزڕان دەبێت. چەندین پرۆسەی وردبینیکردنی ئاڵۆز لە ژمێریاریی زانکۆکەدا ئەنجامدەدرێن کە دەیان ژمێریار ئەنجامیدەدەن و جاری واش هەبوو بەشێوەیەکی کتوپڕ

ئەنجامدەردا. ئەم رەوشە ئەركى كۆندى زياتر دەكات، دواجار لە ساڵى ١٩٩٤دا ئەم لێكۆڵینەوانە تەواو دەبن، بەڵام نەتوانرا هیچ فرتوفێڵێك بسەلمێنرێت. گێرهارد كاسپەر لە لێدوانێكى ئاشكرادا رایگەیاند كە حكومەتى فیدراڵى گەیشتووتە ئەو ئەنجامەى "كە هیچ داوایەكى وەك فرتوفێڵ، كارى نایاسایى تر، یان خراپ پیشاندانى ئەو خەرجییانەى پەیوەندییان بەپێشكەشكردنى پسولەى تێچووە ناڕاستەوخۆكانەوە هەیە، لەدژى ستانفۆرد نییە".

كۆندى وەك بەڕێوەبەرى زانكۆ هەندێك بڕیارى مشتومڕنامێز دەردەكات كە دەبنەهۆى چەند كاردانەوەیەكى نێگەتیڤو زیاتر دەیكەنە ئامانجى رەخنەى توندەوە. ماوەى چەندین ساڵ بوو كە راپۆرتەكان باسیان لەوە دەكرد زانكۆكە پێویستى بەوە هەیە ژنى زیاتر بهێنێتە ناو دەستەى فێركارییەوەو ئەم راپۆرتانە ئاماژەیان بەوە دەدا كە چەند كۆلێژێك هەن بەهیچ شێوەیەك مامۆستاى ژنى بۆ دانەنراوەو ئیدارەى زانكۆكە جگە لەو بەڕێوەبەرە هیچ ژنێكى دانەمەزراندووە. لە ساڵى ١٩٩٧دا كۆندى دان بەوەدا دەنێت كە رەوڕەوەى پێشكەوتن لەم رووەوە زۆر خاوەو باس لەوە دەكات لە ساڵى ١٩٩٣دا رێژەى ژنان لە دەستەى فێركاریدا لەسەدا 15.8 بووە، بەڵام لە ١٩٩٦دا بۆ لەسەدا ١٧،٨ بەرزبووەتەوە، واتە رێژەكە بەرەو زیادبوون رۆیشتووە، بەڵام بەشێوەیەكى كەم. كۆندى لەم بارەیەوە دەڵێت:"روونو ئاشكرایە كە ئەمە بەناڕاستەى راست، پێشكەوتنێكى سستو جێگیرە، بەڵام پێداگریى لەوە دەكەمەوە كە ئەم ژمارانە بەشێوەیەكى زۆر زۆر زیادناكەن".

كۆندى لێكۆڵینەوە لەسەر كێشەكە دەكاتو دەگاتە ئەو ئەنجامەى كەكۆسپە سەرەكییەكە سستییە لە خولى پۆستە باڵاكانداو دەڵێت: "ئێوە دەبینن كە رێژەى گۆڕین لەدەستەى هەمیشەیى فێركاریدا دەگاتە لەسەدا یەك تا دوو، لەمەشەوە زۆر بەئاسانى دەگەینە ئەو ئەنجامەى كە ئەگەر ژمارەى مامۆستاكان زیادنەكەین، بەسستى هەنگاودەنێین. ئەمە راستییەكى ماتماتیكییە، رەنگە هەندێك كەس حەزیان لەم راستییە ماتماتیكییە نەبێت، بەڵام هەروەك راستییەكى ماتماتیكى دەمێنێتەوە"

پلانــی هێنانــەناوەوەی ژنــانی زیــاتر بــۆ دەســتەی فێرکــاری، پێکهێنــانی ســندوقێکی تایبــەت بەپۆســتە نوێکــان لــەخۆدەگرێت. کاروبــاری ئــەم ســندوقە بەشــێوەیەك رێکدەخرێت کــە بــە باشــی لەگــەڵ ئــەو کاندیــدە ژنــە لێهاتووانــەدا بگونجێــت کــە بروانامــەکانیان لەگــەڵ پۆســتەکانی تــردا نــەدەگونجا. لەمەشــدا لەلایــەن ئــەو کەســانەی هەســتیان دەکــرد کــە کۆنــدی هــەوڵی پێویســتی بــۆ هەنگاونانە پۆزەتیڤەکە نەخستووەتەڕوو، ڕووبەڕووی چەندین ڕەخنە دەبێتەوە، هەرچــەندە خــودی خــۆی لــە هەنــدێك کۆبوونــەوەدا دان بــەوەدا دەنێــت کــە پۆســتەکەی قــەرزاریاری ئــەو سیاســەتی خستنەســەرکارەیە کــە لەمیانــەی هەنگاونانــە پۆزەتیڤەکــەی ســاڵی ١٩٨١دا جێبــەجێکرا. کۆنــدی ئارەزوومەنــدی ئەوەنــەبوو ئــەو هەســتە لای ژنــان دروســتبکات کــە زانکــۆی ســتانفۆرد بــەبێ پشتبەســتن بــە بروانامــەو لێهــاتوویی بەردەوامــدەبێت لــە پڕکردنــەوەی پۆســتە بەتاڵەکان بـە خانمان، هەستیشـیکرد لایـەنی پـۆزەتیڤی پیشـاندانی پابەنـدبوون بەخستنەســەرکاری ژنــان لــە ڕێگــەی دیــاریکردنی ڕێژەیــەك یــان ژمارەیــەکی دیـاریکراوەوە "زیـانی زیـاترە لـە قـازانجیو پێیوابـوو ئەمـەوا لـە خـەڵك دەکـات هەستبکەن لەبەر چەند هۆکارێکی نادروست دەکرێنە ئامانج".

وەك خــاڵی دەســتپێك کۆنــدی لەهەنــدێك حاڵەتــدا بــڕوای بەڕاســتی ئــەو هەنگاونانە پۆزەتیڤە هەیـە، واتـە بـۆ نموونـەوەك حاڵەتەکەی ئـەو کـە چانسـی سەلماندنی خۆی لەماوەی ئەزموونیدا، پێدرا. پاش ئەم ماوە ئەزموونییە، کۆنـدی لەسەر ئەدای کارەکانی لە کۆلێژی زانسـتە سیاسـییەکاندا، دەخرێتـە ژێـر قۆنـاغی حوکمـدانی تونـدەوە. سـەبارەت بـەم ماوەیـە کۆنـدی دەڵێت:"ئەگـەر بەشـێوازی گونجاو جێبەجێبکرێت، هەنگاونانی پۆزەتیڤ دەتوانێت ببێتـە یاریـدەدەرێکی زۆر بـاش". کۆنـدی خـۆی بەناچـار نـەدەزانی ژمـارەو ڕێـژەی دیـاریکراو یـان چـەندین سیاسەتی گشتگیری هەنگاونانە پۆزەتیڤەکە، لەزانکۆکەدا جێبەجێ بکات.

پــاش ئــەوەی کۆنــدی پشــتگیری بڕیــاری ڕاگرتنێکــی زانکۆکــە دەکــات بەجێگیرنەکردنی کـارین سویسـلاك لەپۆسـتەکەیدا، هەڵوێسـتەکانی بەڕێوەبـەری زانکـۆ جـارێکی تـر دەبێتـە جێبایـەخی لاپـەڕە یەکەمـەکانی بڵاوکـراوەی زانکـۆی

ستانفۆرد. چەندین خوێندکاری تورە لەناو حەوشەی زانکۆکەدا خۆپیشاندان سازدەکەن، بەڵام کۆندی هەڵوێستەکەی ڕووندەکاتەوەو دەڵێت ڕاگر لەجۆری پێشمەرج و لێهاتوویی دەستەی فێرکاری بەرپرسە لەبەرئەوە پشتگیری بڕیارەکەی کردووە. جێی باسە بەڕێوەبەری زانکۆو ئەنجومەنی ڕاوێژکاری زانکۆکە پیاچوونەوە بەبڕیارەکانی جێگیرکردنی فەرمانبەردا دەکەن ئەمەش بۆ دڵنیابوون لە پەیڕەویکردنی ئەو شێوازە ڕاستانەی دڵنیابوون لە جێگیرکردن و دڵنیانەبوون لێی، لەیەکتر جیادەکەنەوە. کۆندی لەڕوونکردنەوەکەیدا دەڵێت سەرجەم شێوازە پەیڕەوکراوەکان لەسەر کەیسەکەی سویسلاك ڕاست و دروستبوون. دەشڵێت: "دەستەی فێرکاری جێگیرکردن دەدات بەو کەسانەی لەڕووی نیشتمانییەوە توانیویانە سەرکەوتن لەلێکۆڵینەوەو فێرکردندا پیشانبدەن. پێودانگەکان لێرەدا زۆر سەختن، پێویستە ڕاگر بڕیاری ئەوە بدات کە ئایا ئەم پێودانگانە هەبوون و لەسەرجەم ناوەندەکانی زانکۆکەدا جێبەجێدەکرێن. دەنگدانی کۆلێژەکان ئەگەرچی نهێنیش بێت، ناتوانێت لەم بوارەدا بەسەر ڕۆڵی ڕاگردا زاڵبێت" کۆندی دەشڵێت هەنگاونانە پۆزەتیڤەکە لەم قۆناغەدا سوودمەند نییە، پاشان بەڵگەنامەیەکی دیاریکردنی سیاسەتی زانکۆی ستانفۆرد وەك بەڵگەدەهێنێتەوە کە لە ساڵی ١٩٨٥دا نووسراوە. ئەم بەڵگەنامەیە باس لەوە دەکات کە گۆڕانکاری پۆزەتیڤ پەیوەندی بەو کاتەوە هەیە کە زانکۆکە بەدوای پرۆفیسۆری یاریدەدەردا دەگەڕێت و پەیوەندی بەکاتی پێداچوونەوەی جێگیرکردنی دامەزراندنی پرۆفیسۆرەکانەوە نییە. کۆندی پێشتریش لەکۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی باڵای زانکۆکە سەبارەت بە پێویستی دامەزراندنی ژنانی زیاتر لەدەستەی فێرکاریدا ئەوەی ڕوونکردبووەوە کە بەپێی سیاسەتی نەگۆڕی زانکۆکە گۆڕانکاری پۆزەتیڤ تەنها وەك خاڵی دەستپێك بەکاردەهێنرێت.

هەر ئەو کاتەی کۆندی پۆستی بەڕێوەبەری زانکۆکەی بەڕێوەدەبرد، بابەتێکی مشتومڕئامێزی تر سەرهەڵدەدات کە ئەویش پەیوەندی بەپرۆگرامێکی بنچینەیی نوێوە بوو بەناونیشانی پێشەکییەك بەرەو بابەتە مرۆییەکان کە چەند ڕیفۆرمێکی خستەناو ئەو شێوازو ناوەرۆکەی لەوتنەوەی وانە مرۆییەکان

لە ساڵە یەکەمینەکاندا بەکاردەهێنران. ئەم پرۆگرامە نوێیە کە لە ساڵی ١٩٩٧دا دەستپێکرد، شوێنی ئەو پرۆگرامە کۆنەی گرتەوە کەناوی **کلتورەکان، ئایدۆلۆژیاکان و بەهاکان** بوو، بەڵام هاوکات فراوانبوونێکی دا بە پرۆگرامی بەرنامەی فرە کلتورەکان. پرۆگرامی نوێی مرۆییەکان چەند پلانێکی خوێندنی نوێی لەخۆگرتبوو لەوانە پرۆژەی کارلێککردنی ئینتەرنێت، ئەمە سەرباری ئەو پرۆژانەی کە خوێندکاران بەکۆمەڵ جێبەجێیان دەکەن و شوێنی ئەزموونە کۆتاییەکان دەگرنەوە. هەوڵەکانی بەڕێوەبەرو سەرۆکی زانکۆ لەپێناو پێکهێنان و پشتگیریکردنی پرۆگرامە نوێکە دەخرێنەگەڕ بەو هیوایەی خوێندکاری زانکۆیی زیاتر بۆ خوێندنی پرۆگرامە مرۆییەکان رابکێشێت. شایانی باسە تەنها ٪١٢ی خوێندکارە زانکۆییە نوێکان گرنگییان بەخوێندنی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، فەلسەفە، زمان، ئەدەب و تەنانەت هونەریش دەدا کە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەبوو کە چەندین کۆلێژو ئیدارە هەوڵیان بۆ دەدا. پرۆگرامی **پێشەکییەک بەرەو بابەتە مرۆییەکان**، سەرەڕای چەند خولێك سەبارەت بەپرسی ئیتنیکی و جێندەری، چەند خوێندنەوەیەك سەبارەت بەکلتورە ناڕۆژئاواییەکان لەخۆدەگرێت.

کۆندی پشتگیری سروشتە فرەکلتورەکەی پرۆگرامە نوێکە دەکات و رایدەگەیەنێت کە چیرۆکی شارستانیەتی ئەوروپی بەبێ ئەو کلتورانەی رووبەڕووی ئەم شارستانیەتانە بوونەتەوە، چیرۆکێکی ناتەواوە. دەڵێت: "ئەو بیردۆزەی کە هەرگیز بڕوام پێی نەبووە ئەوەیە کە دەڵێت لێکۆڵینەوەی شارستانیەتی ئەوروپی دوور لە لێکۆڵینەوەی هەموو ئەو شارستانیەتانەی کە یارمەتی پێکهێنانیان داوە، کارێکی راستە. مێژووی مرۆڤایەتی چیرۆکی پێکدادانی شارستانیەتەکانە و ئەمەش بەشە گرنگەکەیەتی تێیدا... من هەرگیز لەو وتەیە تێناگەم کە دەڵێت پێویستە مرۆڤ تەنها فێری شارستانیەتی ئەوروپی بێت".

گۆڕانکارییەکان لەپرۆگرام و شێوازی وانەوتنەوە ئەنجامدران، ئەمەش بەرهەمی هەوڵێکی گشتی بوو کە گرنگترینیان لیژنەیەکی دروستکراو لەدەستەی وانەوتنەوە بوو، ئەم لیژنەیەش لەلایەن رایسی بەڕێوەبەرو کاسپەری سەرۆکی

زانکـۆوە پشــتگیری دەکــرا. پــاش دەســتپێکی ئــەم گۆڕانکارییانــە کۆنــدی دەڵێت:"پێموایــە ئــەو ئەزموونــەی خوێنــدکارانی ســاڵی یەکــەمو دووەم لێــرە دەیبینـن ١٨٠ پلـە لـەوەی پێشـوو جیـاوازە. ئێسـتا زیـاتر بەریەککـەوتن لەگـەڵ ئەندامانی دەستی فێرکاریدا رودەدات، ئاڕاستەیەکی زیـاتر بـۆ کـارکردن لەشـێوەی گرووپی بچوکدا بەدیدەکرێت، هەروەها ئاڕاستەیەکی گـەورەتر بـەرەو لێکۆڵینـەوە هەیە"

هــەر لەوکاتــەی کۆنــدی بەڕێوەبــەری زانکۆکــە بــوو، کێشــەیەکی تــری مشـتومڕئامێز سـەری هەڵـدا ئـەویش کـەمیی شـوێنە دیاریکراوەکـان بـوو بـۆ خوێنـدکارانی سـاڵی دەرچـوون. لـە ئایـاری ١٩٩٨دا هـەزار خوێنـدکار لـەدژی کـەمی شـوێنی نیشـتەجێبون، لەحەوشـەی زانکـۆدا خۆپیشـاندانێك رێکدەخـەن، سـەد کەسی تر بۆ ماوەی شـەوێك لـە کوادرانگڵ چـادر هەڵدەدەنو تێیدا دەمێننـەوە. پێشتر زانکۆکە بەبیانوی کەمی شوێنەوە داوای ٩٠٠ خوێندکاری ساڵی دەرچوونی بۆ نیشتەجێبون لە حەوشـەی زانکۆکـەدا رەتکردبـووەوە. کۆنـدی رایدەگەیـەنێت کە زانکۆکە شوێنی نیشـتەجێبونی نـوێ دروسـتدەکات، بـەڵام ئـەم پرۆژەیـە پـاش بڕیار لەسەردانی، دوو ساڵی پێویستە. ئەم کێشەی نیشـتەجێبونە تـا ئـەو کاتـەی کۆندی پۆستەکەی رادەستی بەڕێوەبەری نوێی زانکۆکـە دەکـات، وەك کێشـەیەکی سەرەکی دەمێنێتەوە.

ســەرباری مشــتومڕەکانی پەیوەندیـدار بەپرســەکانی گۆڕانکـاری پـۆزەتیڤو پرۆگرامە فرەکلتورەکانو چەند پرسێکی تـر، کۆنـدی بـەهۆی دەسـتکەوتەکانی لـە بودجەی زانکۆدا رێزو پێزانینێکی بەرچاو، بەدەستدەهێنێت. لە ئایاری ١٩٩٦دا لـە کۆبونەوەیەکی ئەنجوومەنی باڵای زانکۆکە رایدەگەیەنێت کە ستانفۆرد نەك هەر توانیویەتی لە کورتهێنانی دارایی دەرچێت بەڵکو ١٤ ملیۆنو ٥٠٠ هەزار دۆلاریشـی وەك پارەی یەدەگ پاشەکەوت کـردووە. وتیشـی: "ئەمـەش کارێکـە کـە پێویسـتە زانکۆ شانازی پێوەبکات" کۆندی ئەم سەرکەوتنەش بۆ کەمکردنەوەی خـەرجیو زیادکردنی بەهای موڵکەکانی زانکۆو ئەو سەرکەوتنە نموونەییانە دەگێڕێتەوە کە لە هەڵمەتەکانی پشـتگیریکردنی داراییـدا بەدەسـتیان هێنـابوو. راشـیگەیاند:"من

شـانازی دەکـەم، لەبەرئـەوەی ئێسـتا رەوشـی داراییمـان تەندروسـتە"، هاوکـات لەگەڕانەوە بۆ داب و نەریتە کۆنەکان هۆشداریدەدات و دەڵێت:" زانکۆکان لـەکاتی خۆشگوزەرانیو ئاسودەیی رێژەییانـدا، ئارەزووی بـەردەوامبوون لـە فراوانبـوونو زیادکردنی کارمەندو وەستان لەبیرکردنەوە لە بەیەکەوەبەستنەوەی هەنـدێك لـە کەرتەکانیان، دەکەن". لـەم جۆرە حاڵەتانـەدا زانکۆکان بەئەنقەسـت بـۆ نموونـە ئەو پۆستانە دادەنێنەوە کە پێشتر هەڵیانوەشاندبووەوە، ئەمەش فشارێکی نـوێ دەخاتەسـەر بودجـە. کۆنـدی دەشـڵێت: "تاڕادەیـەکی زۆر لـەبوونی بەنـدۆڵێك دڵنیاین، لەبەرئەوە پێویستە زۆر توند بیت بۆ ئەوەی رێ بـەم بەندۆڵـە نـەدەیت جارێکی تر جۆڵانێ بکات"

هەر لەکاتی کارکردنی وەك بەڕێوەبەری زانکۆ، کۆنـدی لـە وتنـەوەی وانـەی زانسـتە سیاسـیەکانیش بەردەوامـدەبێت. هـەروەك پابەنـدبوونی خـۆی بـە پیانۆژەنین نوێدەکاتەوەو بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیدەکات بەگرووپێکی ژەنـینی دەستەی فێرکارییەوە، هاوکات وانەی تایبەتی موزیك دەخوێنێت. کۆنـدی دەڵێت هاوکارێکی لە ستانفۆرد پێشنیازی بۆ کردبوو کە لەژەنینی موزیکدا بـەردەوامبێت. پۆڵ برێست دەڵێت: "کاتێك مـن راگری کۆلێژی یاسا بـووم، کۆنـدی بەڕێوەبـەری زانکۆ بوو". شایانی باسە پۆڵ کـە دەتوانێت ئامێری کەمانچە بـژەنێت، هاوکـات لەگەڵ دەستپێکردنی منداڵەکانیدا بەفێربوونی موزیـك، دەسـتیکردووە بـەموزیك ژەنین. پۆڵ دەڵێت: "نزیکەی مانگی جارێك بەڕێوەبەری زانکۆ لەگـەڵ راگرەکانـدا کۆدەبوویـەوە، پێشـتر بیسـتبووم کـە کۆنـدی پیـانۆژەنێکی لێهـاتووە. جارێـك بەشـێکی پەیوەندیـدار بـە پیـانۆ، لـە چوارینەی شـۆمان بـۆ پیـانۆ لەگـەڵ خـۆم دەبـەم. لەیـەکێك لەکۆبوونـەوە مانگانەکـەدا ئـەو بەشـە پێشـکەش بەکۆنـدی دەکەم و لێی دەپرسم: "ئەڵێی چی ئەم پارچەیە لێ بـدەین؟" کۆنـدی رەزامەنـدی دەردەبڕێت، هەربۆیە پێکەوە دەستمانکرد بەژەنینی چوارینەی پیانۆو بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵ بەشـێوەیەکی رێکوپێـك لـە پیـانۆژەنین، بـەردەوامبووین". والتـەر هیولێـت رۆڵـی ژەنیـاری ڤیۆلۆنسـیل دەبینێـت، بـەڵام کەمانچـەژەنەکان لەوانـە ئەندریا شاڤێز کە دەرچووی کۆلێژی ماف سەربە زانکۆی سـتانفۆرد بـوو، هـەروەها

پرۆفیسۆر کارین لیندبلۆم، لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر گۆڕانکارییان بەسەردا دەهات.

پۆڵ دەڵێت:"کۆندی حەزی لەژەنینی چوارینەو پێنجینەکانی پیانۆ بوو و بەپیانۆژەنێکی نایابی چوارچێوەی گرووپ دادەنرێت". دەشڵێت: "هەمیشە لەچوارینەکاندا وەرگرتن‌و پێدان هەیەو دەتوانیت بۆ نموونە بڵێیت :"تکایە لەم کۆپلەیەدا پەلە مەکە، یان تکایە بەشێوەیەکی نەرمتر موزیکەکە لێبدە"، کۆندی بەئاسانی وەڵامی ئەم سەرنجانەی دەدایەوە، خاوەنی گوێیەکی موزیکی نایابەو پیانۆژەنێکی ناوازەیە. هەمیشە ژەنیارانی ئامێرە ژێدارەکان سکاڵای بەرزیی دەنگی پیانۆ دەکەن، ئەم قسەیە جۆرێکە لە گاڵتەکردن، بەڵام کۆندی زۆر گوێی بەم رەخنەیەش دەدا، هەروەها خودی خۆشی رەخنەی دەگرت‌و توانای کارکردنی لەچوارچێوەی گرووپدا هەبوو. ژەنیارێکی نایابی چوارچێوەی تیم بوو، پێم‌وایە مرۆڤ ئەگەر بیەوێت موزیک لەچوارچێوەی گرووپدا لێ بدات، پێویستە وەك ئەوبێ"

ئەم گرووپە چەند ئاهەنگێکی نافەرمی لە ماڵی ئەندامەکانیدا رێکدەخات‌و پێکەوە چێژ لەژەنینی سیانینەو چوارینەو پێنجینەکانی پیانۆی شۆمان‌و برامزو ئەوانی تروەدەگرن. ئەم ئاهەنگانە چانسی رێکخستنی ئاهەنگی ئاشکراو ژێر فشاری جەماوەر دروستدەکەن. کۆندی کارەکەی زیاتر بەهەند وەردەگرێت هەربۆیە لە رێگەی گرووپێکی جیهانییەوە بە ناوی چوارینەی ژێداری موێر، زیاتر گرنگی بەژەنین دەدات. ئەم گرووپە واڕاهاتبوو لە چوارچێوەی گەشتە موزیکییەکانیدا بۆ باکوری ئەمەریکا، دەهات بۆ ستانفۆردو موزیکی لێدەدا. چوارینەی موێر لە ساڵی ١٩٨٠وەك تیمێکی چوارینەی نیشتەجێ لە پەیمانگای زانکۆی بۆستن بۆ هونەر دامەزراوەو لە ساڵی ١٩٨١دا خەڵاتی نوامبێرگ بۆ موزیکی بەگرووپی بەدەستهێناوە. ئەم تیمە بەناوی جۆن موێر کە زانایەکی بواری سروشت‌و دامەزرێنەری یانەی سیرایە، ناونراوەو قازانجی تۆمارەکانیشی دەبەخشێتە رێکخراوە ژینگەییەکان.

کۆنــدی هاوڕێیەتییــەکی بــەتین لەگــەڵ گرووپــی چــوارینەی مــوێردا دروســتدەکاتو لــەکاتی ســەردانی گرووپەکــەدا بــۆ ســتانفۆرد واڕاهــاتبوو کــە لەناوبڕەکانی نێوان پارچــە موزیکەکانــدا، چــەند پارچــەیەکی لەگــەڵ ئەنــدمانی گرووپەکەدا دەخوێندەوە. گرووپەکە واڕاهاتبوو کە پێش هەر ئاهەنگێکی فەرمی، ئاهــەنگی نافــەرمی لەیــەکێك لەماڵەکانــدا ســازدەکرد. کۆنــدی داوا لــە گرووپەکــە دەکــات پارچــەیەك ئامادەبکــات کــە ئــەم بتوانێــت لــەکاتی ئــەم ئاهەنگــە ئامادەکارییانــەدا لێــی بــدات، ئــەوانیش داواکــەی پەســەنددەکەن، بۆیــە کۆنــدی دەستدەکات بەڕاهێنان لەسەر ژەنینی پێنجینەی برامز بۆ پیانۆ لەسەر چینی F ماینۆر. ئــەم کــارە بەلوتکــەی کارەکــانی برامــز دادەنرێــت لــەموزیکی حەجــەرەداو پێویستی بەتــەکنیکێکی زۆر لێهاتوانــە هەیــە بەتایبــەت لــە جوڵــەی سێیەمدا کــە پێکهاتووە لە پارچەیەکی خێرا (ئــەلگیرۆ). شــایانی باســە کۆنــدی هاوکــات لەگــەڵ دەستکردن بەڕاهێنان لەسەر ئەم پارچە موزیکە، دەستدەکات بەخوێندنی وانــەی پیــانۆ لــەلای جــۆرج بــارت کــە پرۆفیســۆرێکی یاریــدەدەر بــوو و لەزانکۆکــەدا کاریدەکرد.

جــۆرج دەڵێــت: "کاتێــك دەســتمکرد بــەکارکردن لەگەڵیــدا نەمــدەزانی کــە پێویستە پێشبینی چی بکەم. ئەو ژنێکی زۆر سەرقاڵبوو، پێمواببوو هەر بۆ خۆشی دەیــەوێت فێــری موزیــك ببێــت. پێکــەوە دەســتمانکرد بــەکارکردن لەســەر پارچــە موزیکێکی شۆپانو حەوتەم سۆناتەی بیتهۆڤن لەســەر D ی مــایجور. ئەوەنــدەی پێنەچــوو کۆنــدی پێــی وتم دەیــەوێت کــاتێکی زیــاتر بــۆ کارەکــە تــەرخانبکات، بەوشێوەیە بڕیارمدا بەردەوامبم بۆ ئەوەی ببینین کە دەتــوانین بگەینــە کــوێ. دواتر بۆم دەرکەوت کە لەهەستان بەکارێکدا توانــای کۆنــدی هــیچ ســنوورێکی بــۆ نییە. هەوڵی زۆرترم داو هەستم کرد وەڵامدانەوەی بۆ موزیکەکە هەیــە. ســەرنجم دا هــەموو هەفتەیــەك زۆر بەگرنگییــەوە ئامــادەی کارەکــە دەبێــت. کۆنــدی زۆر بەبایەخپێدانو قوڵییەوە کاری لەســەر هــەموو شــتێك دەکردو هــەموو شــتێك کــە من پێم دەوت لــەبیری نەدەچووەوە، مەبەســتم هــەموو وردەکارییەکانــە. کۆنــدی پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیو زۆر پێی سەرسام بووم"

لەمیانەی ئامادەبوونی لە نمایشی پارچە موزیکێکی برامز لەگەڵ گرووپی چوارینەی موێر، کۆندی هەفتانە ١٠ سەعات کاری لەگەڵ جۆرجدا دەکرد، کاتی وانە موزیکییەکانی بەپیرۆز سەیردەکردو بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی نەدەدا ئەو وانانەی پێ ببڕن، هەمان شت ڕاستە بۆ ڕاهێنانە ئامادەکارییەکانیشی بۆ ئاهەنگە موزیکییەکان، یان کاتێك کاری لەسەر کۆمەڵێکی نوێ لە پارچە موزیکییەکان دەکرد، ئاسان نەبوو بەم شێوەیە کاتی خۆی بۆ موزیك تەرخانبکات بەتایبەت کە دووەم باڵاترین پۆستی زانکۆکەی دەبردبەڕێوە. کۆندی واڕاهاتبوو لە نووسینگەکەی بەم شێوەیە وەڵامی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانی دەدایەوە:"من ئێستا پارچە موزیکێکی برامز لێدەدەم"و داوای لە پەیوەندیکارەکە دەکرد چاوەڕێ بکات. کۆندی دەیویست هەمووان بزانن کە ئەم کاتەی تەرخانکردووە بۆ موزیك.

جۆرج باس لەوە دەکات کە نمایشی چوارینەی برامز بۆ پیانۆ تەنانەت ئەگەر لە ئاهەنگێکی نافەرمیشدا بێت، کارێکی ئاسودەبەخشە، لەمبارەیەوە دەڵێت: "کۆندی بەشێوەیەکی زۆر باش موزیکی لێدەداو خێراییەکەی لەژەنینی پارچەموزیکەکانی شێرزۆ سەرسامی کردبووم، زۆر جوان بوو". هاوڕێیەتی کۆندی لەگەڵ چوارینەی موێردا ڕێکەوتی ئێوارەی جەژنی لەدایکبوونی، تێدەکەوێت کە مانگی نۆڤەمبەر بوو. جۆرج دەڵێت: "گرووپەکە دەستیکرد بەژەنین، ئەوەندەی پێنەچوو کۆندی سەرنجی تێڕوانینێکی نامۆ لە ڕوخساری ژەنیارەکاندا، دەدات. ئاوازە سەرەتاییەکان بوونە "پیرۆزە جەژنی لەدایکبوونت"، لەو کاتەدا بیریدەکەوێتەوە کە ئەمڕۆ ڕۆژی لەدایکبوونیەتی. گرووپەکە ئەم پارچە موزیکە لێدەدەن و ئامادەبووانی ماڵەکەش دەستدەکەن بەگۆرانی وتن. دواتر گرووپەکە دەستدەکات بە ژەنینی ئەوەی پێشتر بەرنامەی بۆ دانراوە"

جۆرج کارکردنی لەگەڵ کەسانی وەك کۆندی پێ باشترە، واتە ئەو موزیکژەنانەی ناوبانگیان نییەو بەشێوەیەکی نایاب پابەندی هونەرەکەیانن و دەڵێت: "زۆربەی خوێندکارەکانم پسپۆڕی بواری بایۆلۆجیی کۆئەندامی دەمار یان زانستی جینەکانی زەوین، یان ئەو کەسانەن لەبوارەکانی تردا، پیشەی سەیریان

هەیـە، هاوکـات ژەنیـاری گـەورەن. بەلامـەوە گرنگـە ئـەو مەودایـە بـزانم کـە ئارەزوومەنـدان دەتـوانن پێـی بگـەن، پێشـتریش وانـەم بـە چـەندین ژەنیـاری لێهـاتووی پیـانۆوتووە. بـۆ نموونـە کاتێـك دەبیـنم خوێنـدکارێکی فیزیـا کـارێکی جـددی چـاوەڕێی دەکـات لەگـەڵ ئەوەشـدا دەتوانێـت کاتێـك بـۆ ژەنـینی پیـانۆ بدۆزێتـەوە، دەتـوانم متمانـەی ئـەوەم پێـی هـەبێت کـە لـەباش ژەنـینی پیـانۆدا سـەرکەوتوو دەبێـت. خوێنـدکارێکی لـەم شـێوەیە بـە تاقیگەکـەی دەڵێـت: "لەبەرئەوەی ئەم هەفتەیە لـە پێشـبڕکێی مـوزیکی حەجـەرەدا موزیـك لێدەدەم، ناتوانم ئامادەی تاقیگەکـە بم" ئـارەزووی ئـەم جـۆرە خوێندکارانـە بەکاتکوشـتن لەقەڵـەم نـادەم، بـەڵکو نموونـەی ئەمانـە بەڕاسـتی موزیکەکـەیان بەهەنـد وەردەگرن. بەڕاستی کۆندی سەربەم جۆرەیە بەتایبەت کە بەڕێوەبەری زانکۆیـەو هاوکات زانایەکی بواری سیاسەتە"

ئەو ئاهەنگانەی دەستەی فێرکاری لە زانکۆی سـتانفۆرد پێشکەشـیان دەکرد مەودای لێهاتوویی پرۆفیسـۆرەکانی ئەنـدازیاریی‌و ماتماتیکی نیشـاندەدا. کۆنـدی جارێك پاش ئەوەی دەتوانێت بەباشی فێری پارچە موزیـکێکی تری برامز بـەناوی **چەند هەمەڕەنگییەك لەسەر بابەتێکی هایدن** ببێت، لەیـەکێك لـەم بەرنامانـەدا لەگـەڵ جۆرجـدا دەردەکـەوێت. جـۆرج دەڵێـت: "هەسـتمکرد کـارکردن لەگەڵیـدا لەسـەر ئـەم پارچـە موزیکـە زۆر چێژبەخشـە. مـرۆڤ لـەو ئاهەنگانـەی کـە پرۆفیسۆرەکان ئەنجامیاندەدەن، کەسانێك دەبینێت کە بەڕاستی لەنمایشەکەیاندا لێهاتوون، لەبوارەکانی تردا کەسانی سـەرکەوتوون، هاوکـات موزیکژەنی مـەزنن" جۆرج باس لـەوەش دەکـات کـە کۆنـدی دواتـریش پارچـە مـوزیکێکی تـری برامـزی لێدەدات بەناوی **فالس لایبس لایدەر** کە پێکهـاتبوو لـە گرووپێك پارچـە مـوزیکی کورت‌و خۆش‌و تایبەت بووی کۆرس.

کۆنـدی هەسـتدەکات ئـارەزووی ئـەوەی هەیـە بـەئامادەبوون لـە ڕاهێنانـە موزیکییـە هاوینـەکانی گرووپـی مـوێر دەکـات‌و بـەهۆی پەیوەندیشـی لەگـەڵ گرووپەکـە، ئـەو هاوڕێیانـەی ستانفۆردیشـی کـە ئـامێری ژێداریان دەژەنـی لەگەڵ خۆیـدا بـۆ ڕاهێنانـەکان، دەبـرد. بەمەبەسـتی خوێنـدنی پرۆگرامـی چـوارینەی

پێشکەوتووی پەیمانگایەك کە دەکەوێتە دۆڵی ئاسکانەوە، هەموویان پێکەوە گەشتێك بۆ یوتاـ ئەنجامدەدەنو لەوێ بەرامبەر چیاکانی واساچ دەستدەکەن بەموزیك لێدان. لەپێناو راهێنانیان لەسەر هەندێك پارچە موزیکی چوارینەی تایبەت بەپیانۆ، جۆرج بارت بۆ ماوەی دوو وەرزی هاوینە لەگەڵیاندا ئامادەدەبێت. لەماوەی پشووی هاوینەدا کۆندی لەگەڵ گروپی چوارینەی مویر دەرِوات بۆ مۆنتاناو لەگەڵیاندا موزیك دەخوێنێتەوەو راهێنانیش لەسەر هەندێك لە پارچە موزیکییەکانی حەجەرە دەکات. کۆندی لە ساڵی ٢٠٠١دا دەڵێت: "خەریکە موزیکژەنینم تایبەت دەکەم بە موزیکی حەجەرە، پێویستە پەنا ببەمە بەر خۆیەکلاکردنەوەو هەڵبژاردنێکی دیاریکراو، لەبەرئەوەی کاتی زۆرم بۆ راهێنان نییە. لە موزیکی حەجەرەدا حەزم لەلایەنە کۆمەڵایەتییەکەیەتی" کۆندی پێش ئەوەی دەستبکات بەموزیکژەنین لەگەڵ پۆڵ برێستو ژەنیارە چوارینەکانی تری ستانفۆرد، خۆی لەسەر ژەنینی تاکرەوانەی پیانۆ راهێنابوو. موزیکی حەجەرە دونیایەکی تری بۆ کۆندی کردەوە، دونیایەك کە تائێستاش شتی نوێی لێدەدەوزێتەوەو چێژی لێوەردەگرێت. کۆندی موزیکژەنین لەگەڵ چوارینەی ژێداریی یان سازکردنی ئاهەنگی تاکرەوانە، لەلێدانی پارچە موزیکێك بەهاورێیەتی ئۆرکسترا، بەباشتر دەزانێت. لەو بارەیەوە دەڵێت: "دووجار لەگەڵ ئۆرکێسترادا موزیکم ژەنیوە بەڵام هەستمکرد کەمێك شلەژێنەرە"

جۆرج بارت سەرنجی ئەوە دەدات کە لێهاتوییەکانی کۆندی وەك موزیکژەنێکی حەجەرەو گوێگرێكو یاریدەدەرێکی باش، درێژکراوەی کەسایەتی نەبێت، هیچی تر نییە. ئەم پیاوە سەرنجی داوە کە کۆندی وەك بەرِێوەبەری زانکۆ، گرنگییەکی زۆری بە کۆبوونەوەی بەرپرسانی کۆلێژەکان داوە. جۆرج دەڵێت: "ئەو لەتوانایدایە گرنگی بەهەموو مرۆڤێك بداتو دەتوانێت وا لە هەموو کەسێك بکات کە هاوکاری بێت. پێموایە سروشتییە کە مرۆڤ چاوەرِوانی ئەوەی لێ بکات کە ئەم ئاکارانەی لە ژەنینی موزیکی حەجەرەدا رەنگبداتەوە، پێشم وایە هەر ئەمەش هۆکاری ئەوەیە کەوایکردووە ئارەزووی ئەم جۆرە ژەنینە بکات. پێموایە چێژ لەهەردوو کارەکە دەبینێت. ئەوەش دەزانم کە

هاوڕێیایەتییەکانی لە ستانفۆرد زۆر بەلایەوە گرنگن، بێگومان بەردەوامبوونی لەسەر موزیکی حەجەرە یەکێکە لە باشترین ڕێگاکان بۆ پاراستنی هاوڕێیایەتییەکانی". جۆرج بە چاوی خۆی دەیبینی کە کۆندی سەرباری بەرنامە فێرکارییە لێوانلێو لە لێکۆڵینەوەکانو کارە کارگێڕییەکانی لە زانکۆ، چۆن هەموو هەوڵێکی دەخاتەگەڕ بۆ ئەو موزیکەی لێیدەدات. کۆندی گرنگی زۆری دابوو بەموزیكو بەمشێوەیە توانیبوی هاوسەنگییەك لەنێوان کار، هونەرو ڕۆح لەژیانیدا بدۆزێتەوە. لەمبارەیەوە جۆرج دەڵێت: "کۆندی خاوەنی وردبینییەکی خۆیی توندوتۆڵە، لەبەرئەوە دەتوانێت ئەو کاتە بدۆزێتەوە کە بۆ ئەنجامدانی کارە گرنگەکانی پێویستن. ئەمەش ئەو ڕێگەیەیە کە دەیەوێت بەهۆیەوە شتە گرنگەکان لەدەست نەدات".

کۆندی ئەولەویەتێکی زۆر گرنگی تری لە ڕێگای ژیانیدا دانابوو کە ئەویش ڕاهێنانی وەرزشی بوو. ستانفۆرد بەبوونی بەشێکی نایاب بۆ ڕاهێنانی هێز بەناوبانگە. کۆندی شانازی بەوەوە دەکات کە لەکاتێکدا خوێندکاری ستانفۆرد بووە، کاری لەگەڵ کارنیك برانیکدا کردووە کە لەگروپی تایگەر ودز، ڕاهێنەری یارییەکانی هێز بووە. پاش ڕۆشتنی برانیکیش کۆندی لەگەڵ مارك واتیسکا لەسەر ڕاهێنانەکانی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بەردەوامدەبێت، ئەمیش لەلایەن خۆیەوە بەرنامەیەکی توندی ڕاهێنانی بۆ دادەنێت.

کۆندی واڕاهاتبوو هەفتانە دووجار جلوبەرگی وەزشی لەبەردەکردو دەڕۆشتە ژووری ڕاهێنانەکانی هێز لە یانەی زانکۆکەو لەوێ بۆ ماوەی سەعاتێك بەپرۆگرامی ڕاهێنانەوە سەرقاڵدەبوو، هەر لەو ماوەیەدا ١٠ خولەك لەسەر ئامێری بەپێ ڕۆیشتن دەڕۆشتو ١٥ خولەکیش ڕاهێنانە سویدییەکانی ئەنجامدەدا. دواتر دەستی دەکرد بەڕاهێنانی قورسایيو ماسولکەو شانو لاقو گەدەو چەند جۆرێکی تر. کۆتایی ئەم بەرنامەیەش چەند ڕاهێنانێکی ئارام بوو لەسەر ئامێری بەپێ ڕۆیشتنو چەند ڕاهێنانێکی تری سویدی. مارك دەڵێت: "خستمە ژێر ئەو پرۆگرامە ڕاهێنانانەی کە بۆ هەموو وەرزشکارێکی ستانفۆردم دادەنا. کۆندی هەستی دەکرد ئەم پرۆگرامانە لەحاڵەتێکی جەستەيیو مێشکیی هۆشیاردا دەیهێڵنەوە".

هـەر لەچوارچـێوەی ڕاهێنانەكانیـدا، كۆنـدی گرنگـی زۆری بـەخێرایی و لەشجوانی و یاری تێنس دەدا. هەروەها حەزیدەكرد بەسەر ئەو ماندووبوونەی كارەكـەی دروسـتیدەكات زاڵببێـت، تـا بزانێـت دەگاتـە چ ئاسـتێك. هەستیشـی بەئاسودەیی دەكرد لەبەرئەوەی ڕاهێنانەكانی ڕێگەیان پێدەدا ئەوەی حـەزی لـێ بێت بیخوات بەبێ ئەوەی كێشی زیادبكات. ئەووێنانـەی كۆنـدی كـە تیایانـدا بـە كراسی بێقۆڵەوە دەركەوتووەو وێنـەكانی لـەكاتی وەرگرتنی خـەڵاتی NAACP بـە باشـترین وێنـە دادەنرێـت كـە كەناڵـە تەلەفزیۆنییـەكان لـە شـوباتی ٢٠٠٢دا بڵاویـانكردەوە، ئاسـتی ڕێكوپێكی و هاوگونجانی قۆڵـەكانی دەردەخـەن. پرۆگرامـە وەرزشـییەكانی بـە پشـوویەك لـە كارەكـەی نـاودەبرد، ئەمـەش یـەكێكبوو لـەو چالاكییە كەمانـەی كـە لـە نووسـینگەكەو كۆبوونـەوەكانی دووریـان دەخسـتەوە. كۆندی دەڵێت پێویستە لەسەری دەرچەیەك بدۆزێتەوە لە كارەكەی دووریبخاتـەوە كە ئەمەش بۆ ئەو كەسـانەی منـداڵیان هەیـە لەبەردەسـتدابوو. "ئەگـەر منـداڵت نـەبێت كـە بەهۆیـەوە چانسـێكت بـدەنێ بـۆ دووركەوتنـەوە لـەو كـارەی پێـوەی سەرقاڵیت، ئەوا بەشێوەیەكی بەردەوام لەسەر كار دەبیت". كۆنـدی وەرزشـەكانی لەسـەر ئـامێری ڕۆیشـتن بـەپێ، بـۆ بەبایەخـەوەڕوانین لەپرسـە گرنگـەكان بەكاردەهێنا، هاوكات واڕاهاتبوو كە گوێ لـە مـوزیكی كلاسـیكی یـان مـوزیكی ڕۆك بگرێت. جۆری ئـەو موزیكـەش كـە لـەكاتی ڕاهێنانەكانـدا گـوێی لێدەگرت بـەپێی ئارەزووی مێشكی بوو لەكاتی ڕاهێنانەكەدا. دەشڵێت: "دەتوانم بـیر لـە ئـاڵۆزترین كێشە بكەمەوەو لەسەر ئامێری بەپێ ڕۆیشتنیش بم". كۆندی تەنها لـەكاتی ئـەم ڕاهێنانانـەدا موزیـك بـەكاردەهێنێت. لەوبارەیـەوە دەڵێـت: "لەكاتێكـدا گـوێ لـە موزیك دەگرم دەتـوانم بەباشـی ئاگام لـە ڕاهێنانـەكان بێت، بۆیـە تـەنها لـەكاتی ڕاهێنانە وەرزشـییەكاندا گـوێ لـە موزیـك دەگـرم". واڕاهـاتبوو كـە ئـامێری بـەپێ ڕۆیشتنەكەی بەپێی موزیك دیاریكردبوو نەك بـەپێی كاتـژمێر. كۆنـدی دەشـڵێت: "دەبوو بۆ ماوەی ٣٠ خولەك كارێك بكـەم كـە ئـەوە لەمێشـكمدا دروسـتبكات كـە لەسـەر ئامێری بەپێ ڕۆیشـتن نـیم، لەبەرئـەوە دەبـوو چـەند سـیدییەك لەوانـەی زۆر حـەزم بـەگوێگرتنیان دەكـرد بـەكاربهێنم". وا ڕاهـاتبووم كـاتی دەسـتپێكی

پرۆگرامــی راهێنانــەکانم لەگــەڵ دەســتپێکی پارچــەموزیکی شــیرزۆ دانــابوو، بەوشێوەیە دەمزانی کە پێویستە تا کۆتایی ئەم پارچە موزیکە، رابکەم".

مــارك دەڵێــت: "کۆنــدی ئامانجــەکانی لەبەرچــاویدا دانــابوو و زۆر گرنگــی پێدەدان و خاوەنی گیـانێکی کێبـەرکێکاریی بـەهێز بـوو، مـن لـەهیچ هەڵوسـتێکدا بوێریی رووبەڕوبوونەوەی ئەوم نەبوو". مارك واڕاهـاتبوو کـە هـەموو سـاڵێك لـە جـەژنی لـەدایکبوونی کۆندیـدا، دیارییـەکی پێشـکەش دەکـرد کـە پێکهـاتبوو لـە ئەنجامـدانی راهێنـانێکی تایبــەت بــەلاق بــەتوانای ۱۰۰ پاوەنـد. مـارك دەڵێـت: "پێموانییە کە ئەو حەزی لە وەرگرتنی دیاری بووبێت لەلایەن منەوە، بـەڵام ئـەو راهێنانە وەك تەحەددایەك وابوو، واتە پێویستە هەموو ساڵێك لەوانی پێشـووتر باشتربێت. پێموایە تەمەن هیچ پەیوەندی بەم کارەوە نییـە، ئەمـەش بەرنامـەی ئێمەیە".

مــارك بــەڕێکوپێکیو کەسـایەتییە خاکییەکـەی کۆنـدی زۆر سەرسـامبوو و دەڵێت: "پێموایە من وەك راهێنەرێکی بەهێز، لاوازترین ئەڵقەی رێڕەوی کارەکـان بووم، بەڵام کۆندی هەرگیز وەك بەڕێوەبـەرێکی زانکـۆ رەفتـاری نـەدەکرد. حـەزی نەدەکرد مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵدا بکرێت، دەیویست بەتونـدی راهێنـانی پـێ بکــەم، لەبەرئــەوە رۆژێــك لــەڕۆژان بــەهۆی پۆســتەکەیەوە هەســتم بــەترس نـەکردووە. هەسـتمدەکرد زۆر ئاسـودەم کـە وەك سروشـتی خـۆم رەفتـاری لەگـەڵ دەکەم و ئەرکی خۆم جێبەجێ دەکـەم، ئەمـەش بـۆ دروسـتکردنی پەیوەندییـەکی بـاش، رێخۆشــکەر بــوو". لــە ســتانفۆرد مــارك ئامــادەی یــەکێك لــە ئاهەنگــە نافەرمییەکانی کۆنـدی دەبێـت، ئـەو هێـزە جەسـتەییەی لەکۆندیـدا هـەبوو و بـۆ موزیکـژەنین پێویسـتبوو، مـارك زۆر سەرسـامدەکات. کۆنـدی دەڵێـت: "مـارك پێـی وتم: ئەزانی ئەم کارەت پێویستی بە ماندووبوونێکی جەستەیی وەك ئەوانەی لە تیمی فوتبۆڵی سەربە ستانفۆرددا هەیە، پێویستـە؟"

لـەکاتی سـاڵەکانی یەکەمیـدا وەك بەڕێوەبـەرو پرۆفیسـۆری زانکـۆ، کۆنـدی نەیدەویست بگەڕێتەوە بۆ رازەی حکومی. لە چوونەناوەوەی رێـڕەوی فێرکـاری و پێشکەشــکردنی ئامۆژگــاری بــۆ خوێنــدکارانی ســاڵەکانی یەکــەمی زانکــۆو

ئاڕاستەکردنی ڕێڕەوی ئەکادیمی بۆ خوێندکارانی ساڵی دەرچوون، ڕازیبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی سیاسی لەگەڵ واشنتۆندا نەبڕیبوو. کۆندی زۆربەی کاتە بەنرخەکەی لە هەوڵدان بۆ فایلکردنی خوێندکارانی ساڵەکانی یەکەمی زانکۆکەی تەرخاندەکات بۆ ئەوەی ڕووبکەنە پسپۆڕی پیشەیی لە زانکۆکەداو هەوڵیشی دەدا بەکورتی باس لەو شتە زۆرانە بکات کە ژیانی دەوڵەمەندکردووە کەیەکێکیان گەشتکردن بوو. کۆندی لە ساڵی ١٩٩٣ دا دەڵێت: "من... پێیان دەڵێم کە نزیکەی ٣٠ جار یان زیاتر گەشتم بۆ ئەوروپا کردووەو لەو گەشتانەدا بە حەزی خۆم شتم پێنەگەیشتووە". بەم بەڵگانەی، کۆندی بڕوای بەخۆی دەهێنا کە کارکردنی وەك پرۆفیسۆر، لە بەرپرسێکی سیاسەتی دەرەوە لە واشنتۆن باشترە.

لە ساڵی ١٩٩٥دا ڕایگەیاند: "من وەك زۆربەی ئەوانەی لە واشنتۆن کاریان کردووەو هەموو ژیانیان لەپێناو گەڕانەوە بۆ پایتەخت تەرخانکردووە، تای پۆتۆماك (ڕووبارێکە لە ڕۆژهەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەناو پایتەخدا دەڕوات)م نەگرتووە. دەتوانم بەهەموو ڕاستگۆییەکەوە بڵێم کە هیچ ساتێکم بۆ بیرکردنەوە لە گەڕانەوە، تەرخان نەکردووە. پێموایە لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا چانسی ئەنجامدانی زۆر شتم بەدەستهێناوەو نامەوێت جارێکی تر ئەو شتانە بکەمەوە". بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆندی لە ساڵی ١٩٩٨دا ئەم بیروڕایەی دەگۆڕێت.

پێنج ساڵ بەسەر ئەو وادەیەدا تێپەڕ دەبێت کە کۆندی تیایدا ئیدارەکەی بوشی جێهێشتبوو، دیارە ئارەزوومەندبوو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بچێتە جیهانی سیاسەتی دەرەوە. جۆرج بوشی کوڕی سەرۆکی پێشووتری ئەمەریکا لە پرسە دەرەکییەکاندا داوای ڕاوێژی لێدەکاتو ئەم کۆبوونەوانەی لەگەڵیدا دەبنەهۆی ڕاکێشانی زیاتری کۆندی بە ئاڕاستەی بواری جێبەجێکردنی پسپۆڕییەکەی. دیاربوو کاتەکە بۆ گۆڕانکاری گونجاو بوو، بۆیە بڕیاردەدات دەست لە ستانفۆرد هەڵگرێت. لە ئازاری ساڵی ١٩٩٩دا ڕایگەیاند:"دیارە گرنگترین شت بۆ من گەڕانەوەیە بۆ کارەکەم کە ئەویش سیاسەتی نێودەوڵەتییە. لەماوەی دوو

ساڵو نیوی رابردوودا نەچووم بۆ روسیا، لای من رۆشتن بۆ روسیا وەك هەناسەدان وایە"

کۆندی بریاریش دەدات بچێتە ناو جیهانی بازرگانییەوە بۆ ئەوەی خوێندنەکانی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بخاتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. لەو بارەیەوە دەڵێت: "دەمەوێت مۆڵەتێك لە زانکۆ وەربگرم بۆ گەڕان بەدوای چانسەکانم لە کەرتی تایبەتدا کە ئەزموونێکی پراکتیکیم لەبواری ریفۆرمی ئابوری‌و سیاسیدا پێدەبەخشێت". کۆندی هاوکات دەشیویست "کاریگەریی جیهانگیری لەسەر رەوشی دارایی نێودەوڵەتی‌و دامەزراوە سیاسییەکان" ببینێت. راشیگەیاند کە پلانی داناوە بۆ ئەوەی رۆژێك لە رۆژان بگەرێتەوە بۆ ستانفۆرد بەڵام "کاتی گەرانەوە بۆ ئەو کارانەی کە زۆر پەرۆشم بۆیان، هاتووە، ئەوانیش پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان‌و سیاسەتی نێودەوڵەتییە".

لەمیانەی ئەو ئاهەنگی ماڵئاواییکردنەی بۆ کۆندی سازکردبوو، گێرهارد کاسپەر بەگاڵتەوە باس لەوە دەکات کە هیچ کەسێك بڕواناکات کۆندی لەپێناو سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، دەستبەرداری زانکۆ بێت. گێرهارد دەڵێت:"زۆر بەباشی دەزانین پەرۆشی چییە، دەزانین کە کامپی راهێنانی نیشتمانی فوتبۆڵ لەماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا دەکرێتەوە". گێرهارد سوپاسی کۆندیش دەکات لەبەرئەوەی "زۆرێك لە تواناکانی لە بەهێزکردنی بودجەی ستانفۆردو یەکخستنەوەی ئەڵمانیا خستووەتەگەڕ". ئەم پیاوە راشیگەیاند کە کێشەی یەکەمیان قورستربووەو کاتێکی درێژتریشی خایاندووە"

هەر لەمیانەی ئاهەنگەکەدا کاتێك بریندا سیبۆلین دوو گۆرانی ئاینی، کە خوازراوی کۆندی بوون، پێشکەش دەکات، هەستی ئامادەبووان دەجوڵێنێت. یەکێك لە گۆرانییەکان ناوی (چاوەکانی لەسەر چۆلەکەی دوری)[1]و ئەوی تریشیان ناوی (هەموو سەعاتێك پێویستم پێتە)، بوو. بەهۆی ئەم دوو گۆرانییەوە چاوی زۆربەی ئامادەبووان کە ژمارەیان زیاتر لە ٢٠٠ کەس دەبوو

---

[1] جۆرێکی بچووکە لەچۆلەکەو لە دەوروبەری باخچەو گوندەکاندا بڵاوە.

لەگەڵ کۆندیدا، دەکەوتنە فرمێسکرشتن. گێرهارد دیارییەکی بەنرخی پێشکەش بەکۆندی دەکات کە دیاری هاوبەشی ئەو ئامادەبووانەی ئاهەنگەکە بوو کە خۆشیان دەویست. کۆندی قوتوی دیارییەکە دەکاتەوەو بەسەرسوڕمانێکی زۆرەوە دەبینێت پێکهاتووە لە شەش کتێبی چاپی یەکەمی ڕۆمانی (شەڕو ئاشتی)ی تۆلستۆی. دواتر کۆندی رستەی پێشکەشکردنی دیارییەکە دەخوێنێتەوە کە پێکهاتبوو لە:

**بۆ کۆندۆلیزا رایس**

**خۆزگە جەنگ رۆمان دەبوو**

**بۆ ئەوەی ئاشتی راستی بوایە**

**لەگەڵ ئەوپەڕی رێزو پێزانینمان بۆ ئەو کارە باشانەی وەك نۆیەم بەڕێوەبەری ستانفۆرد پێشکەشت کردن.**

کۆبوونەوەی کۆتایی ئەنجوومەنی دەستەی فێرکاری بەبۆنەی کۆتاییهاتنی ساڵی خوێندنی زانکۆییەوە ئەنجامدرا، براند ئیفرۆن کە هاوکاری کۆندی بوو لەو کۆبوونەوەیەدا قسە لەسەر ئەو "هێزی گەرمە ئەخلاقیو خۆشەویستییە توندەی بۆ بێگەردی، هەیەتی" دەکات کە کۆندی وەك پرۆفیسۆرو بەڕێوەبەری زانکۆ هەیبوو. لەکاتی گۆڕینەوەی پێکی شەمپانیاشدا ئەوەش بیر کۆندی دەخاتەوە کە ئەرکی ئەو وەك پرۆفیسۆری هەمیشەیی لە ستانفۆرد هەرگیز کۆتایی نایەت. پێشی دەڵێت "ئەو وەك مافیا وایە، ئەوەش شتێکە مرۆڤ ناتوانێت وازی لێ بهێنێت".

لە ١-٧-١٩٩٩ کاتێك کۆندی وەك بەڕێوەبەری زانکۆ دەست لەکاردەکێشێتەوە، رایگەیاند کە بۆماوەی ساڵێك مۆڵەت لە زانکۆ وەردەگرێت، دواتر دەگەڕێتەوەو دووبارە پەیوەندی بەپەیمانگای هۆڤەر وەك ئەندامی هاوکار دەکاتەوە، لەوێ کۆندی شارەزاییەکانی لە پرسەکانی کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو و ئەورووپای رۆژهەڵاتو چەندین شارەزایی تر لەبواری راژەی

زانکۆو حکومەتدا، دەخاتە خزمەتەوە، ئەم شارەزاییەشی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵێکی فراوان لە پرسە سیاسییە هاوچەرخەکان، تەرخان دەکات.

جۆن رازیان بەڕێوەبەری پەیمانگای هۆڤەر ئاماژە بەپەیوەندییە جەماوەرییە سەرسوڕهێنەکانی کۆندیو باگراوندە رۆشنبیرییەکەی دەکاتو دەڵێت: " ئەگەر چی شارەزاییەکەی سنووردار بوو، بەلام هەموو ئەم ناوبانگە جوانەی هەبوو". جۆن تواناکانی کۆندی بۆ پاراستنی تۆڕی ناسیاوەکانی لە دەستڕۆیشتووەکانی واشنتۆن بەتواناکانی ئەندامێکی تری ئینیستیتیوی هۆڤەر بەراوردەکات کە جۆرج شۆڵتزەو لە ساڵی ١٩٨٩وە ئەندامێکی نایابی پەیمانگاکەیە. جۆن لەمبارەیەوە دەڵێت: "جۆرج خاوەنی ئەو سەرنجڕاکێشانەیە کە ئەستێرەکان هەیانە. لە ساڵی ١٩٨٩وە دەستی لە ئیدارەکەی ریگان بەرداوە، بەلام ماوەی زیاتر لە دەیەیەکە خاوەنی بنکەیەکی جەماوەریی فراوانەو توانیویشیەتی پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسە دیارەکانی سەرتاسەری جیهاندا، بکات. کۆندی خاوەنی هەمان سەرنجڕاکێشییە، بەلام بەئاستێکی کەمتر توانیویەتی پارێزگاری لەو هاوڕێیایەتیو پەیوەندییانە بکات کەماوەی ١٠ ساڵە لەگەڵ کەسانی وەك کۆڵن پاوڵو دیك چینیو پوڵ ولفۆویتزدا دروستی کردووە. هەروەك توانیویشیەتی بیروبۆچوونی خۆی لە چەندین پرسی سیاسەتی دەرەوەدا دەرببڕێت تەنانەت لەکاتێکدا لێرە لەکەناری خۆرئاوا، بوو"

جۆن ئاماژە بەمێژووی ناسراوی کۆندیو کارکردنی لە چەندین رێکخراوی راژەی گشتیشدا دەکات. کۆندی لەمبارەیەوە دەڵێت:"چەندین جۆری تر ئیشوکاری راوێژکاری کەوتە سەر شانم، کە ئەمانەش بۆ شوێنێکی وەك ئینیستیتیوی هۆڤەر گرنگی خۆیان هەیە. ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەین بیکەین، بەدیهێنانی چەند ئایدۆلۆژیایەکە کە جیهان کەمێك باشتربکاتو زۆریش ئارامتری بکات. ئێمە کۆمێنت لەسەر ئایدۆلۆژیاکانی تایبەت بەجیهانی سیاسەت دەدەین، هەروەها راستییە شاراوەکانی پشت ئەو سیاسەتانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان جێبەجێدەکرێن، بۆ خەڵك روونده‌کەینەوە. کارەکان بەمشێوەیە بەڕێوەدەبرێن". جۆن لە بلاوکراوەی پەیمانگای هۆڤەردا دەڵێت: "کۆندی یەکێکە

لـە ديـارترين ئـەو كەسـانەى بەدرێـژايى ژيـانم ديـدارم لەگەڵيانـدا ئەنجامـداوە. خـاوەنى سـامانێك شـارەزاييە، پەرۆشييەكەشـى لـەو جۆرەيـە كـە وەك پـەتا بڵاودەبێتەوە. كۆندى دەبێتە بەشێكى بنچينەيى لە تێڕوانينى پـەيمانگاى هۆڤـەر بۆ سياسەتى دەرەوە"

پاش تێپەڕبوونى دوو هەفتە بەسەر پەيوەنديكردن بەپەيمانگاى هۆڤـەرەوە، كۆندى مينحەيەكى نوێ دەباتەوە كە لەلايەن هەردوو خۆبەخش تۆماسو باربێرا ستيڤنسنەوە پێشكەشكرابوون. تۆماسو باربێرا سندوقێكيان بـۆ پشـتگيريكردنى ئەنـدامێكى هۆڤـەر دامەزرانـدبوو كـە بتوانێـت "بگاتـە پلـەى لێهاتووترين كەسـە ديارەكانى بوارى پسپۆڕييەكەى خۆى، ئەمە وێڕاى پابەندبوونێكى تەواوەتى بەو لێكۆڵينەوانـەى پەيوەنـدييان بەسياسـەتى دەرەوە هەيـە". ئـەم دوو خۆبەخشـە دەڵـێن: "ئێمـە خۆشـحاڵين بەپێشكەشـكردنى ئـەم چانسـە بـۆ پشـتگيريكردنى دامەزراوەكـەو تاكێـك لەدامەزراوەكـە كـە دەتـوانن جێكـارێكى پـۆزەتيڤو گـرنگ لەسەر ئەو جيهانە نوێيە جێ بهێڵن كە تازە دەركەوتووە".

پـاش تێپـەڕبوونى سـاڵێك بەسـەر وەرگـرتنى پۆسـتى بەڕێوەبـەرى زانكـۆى سـتانفۆرد لەلايـەن كۆندييـەوە، گۆڤـارى تـايم لـە ليسـتى ٥٠ ديـارترين سـەركردە گەنجـەكانى وڵاتـدا، دايـدەنێت. گۆڤارەكـە لەمـەدا ئـەو كەسـانەى هەڵبـژاردبوو كەتەمەنيان لە ٤٠ ساڵانو بەرەوخوارەيەو توانيويانە شتێكى نوێ بهێننەكايـەوە. وتارى گۆڤارەكە پشبينيكردبوو كە هەندێك لەم ڕێزلێنراوانـە "كێشـە دواى كێشـە چارەسـەردەكەن تـا لـە كۆتاييـدا دەگەنـە قۆنـاغى بـەڕێوەبردنى وڵات، رەنگـە جيهانيش"

مايكـڵ مانـدڵبۆم كـە لـەزانكۆى جـۆنز هۆبكنـز كاردەكـات پێشـبينيكردووە كۆندى "تواناى گرتنەدەستى پۆستى حكومى هەبێتو لەتوانايدايە بـەدياريكراوى ببێتە وەزيرى دەرەوە" ئەم پێشبينيە پێنـج سـاڵ پـێش پەيوەنـديكردنى كۆنـدى بەهەڵمـەتى سـەرۆكايەتى جـۆرج دەبليـو بوشـەوە بـوو وەك راوێـژكارى بـوش بـۆ كاروبـارى سياسـەتى دەرەوەو شـەش سـاڵيش پـێش دامەزرانـدنى وەك راوێـژكارى بوش بۆ كاروبارى ئاسايشى نەتەوەيى، بوو. لەتەمەنى چل ساڵيدا كۆنـدى تـوانى

ببێتــە کەســایەتییەکی گرنگی بوارەکەی. ئەوانــەی کــە بەدواداچــوونی ڕێــڕەوی پیشەیی کۆندییان دەکرد هەستیانکردووە کــە ڕۆژێــك لــەڕۆژان دەتوانێت لەســەر تــەختی شــانۆی سیاســەتی نەتــەوەیی دەربکــەوێت. ڕووداوەکــان دەریانخســت کــە کۆندی هیوای ئەو کەسانەی پشبینی سەرکەوتنیان بۆ کردبوو، بەفیڕۆنادات.

کاتێك بوشی کوڕ کە هاوڕێی کۆندی بوو، دەستدەکات بەهەماهەنگیرکردن بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەی، کۆندی بانگهێشت دەکرێت بـۆ ئـەوەی شـارەزاییەکانی لە بەرژەوەندی بوش بخاتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. ئەم خانمە لەناو تیمێك لە ڕاهێنەرانی کاندیدەکە بۆ کاروبـاری سیاســەتی دەرەکی، وەك ڕاهێنــەری ســەرەکی دامــەزرێت، هــەروەها وەك نووســەری ســەرەکی وتــاری کاندیدەکــە بــۆ کاروبــاری ســتراتیژی نــاوکی هەڵدەبــژێردرێت، هــەروەها کەســایەتییەکی دیــارو ســەرەکی ئــەو هەڵمەتە بوو کـە نـاونرا W لـەپێناو ژنانـدا. هەڵمـەتی هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی کۆتاییدێتو جورج بوشی کوڕ هەنگاوێکی تـر بەرەوپێشـەوە دەڕوات. بـوش داوای لێدەکات وەك ڕاوێژکاری بـۆ کاروبـاری ئاسایشـی نەتـەوەیی لەگەڵیـدا بمێنێتـەوە. لەکۆتاییشدا بوش بۆ بەشی خۆرئـاوای کۆشـکی سـپی رایدەکێشـێت، کـە ئەمـەش ئەوەندەی بەردهاویشتنێك لە نووسینگەی کۆشکی سپیی سەرۆکەوە، دووربوو.

# بەشی نۆیەم

## دەروازەیەک بەرەو دەسەلأت: بوشی کوڕ

**ئەگەر سودێکمان لەوانەیەك لەوانەکانی مێژوو وەرگرتبێت ئەوەیە کە هێزە بچووکەکان ئامادەی لەدەستدانی هەموو شتێکیان تێدایە، هەمیشە لە هێزە گەورەکان زیاتر کەللەڕەقترن.... ئەم وانەیە واشت لێدەکات ئەگەر هاتوو جەنگ گرنییەکی هەبێت، بەباشی خۆت بۆ بردنەوەی ئامادەبکەیت.**

### کۆندۆلیزا رایس، ۲۰۰۰

سەعات ٦:٣٠ی سەرلەبەیانی ١١-٩-٢٠٠١ کۆندی وەك هەمیشە دەگاتە نووسینگەکەی خۆی. پێشبینی رۆژێکی درێژو ئاسایی دەکات، واتە تا سەعات ٩ی شەو ناگەرێتەوە ماڵەوە. کاری کۆندی چەند ئەرکێك بوو کە دووبارە دەبوونەوە، وەك خوێندنەوەی پوختە رۆتینییە رۆژەکان بەلأم، دانانی کارکردن لەکاروباری ئاسایشی نەتەوەیی بەرۆتین، زۆر قورسە. دوو سەعات بەسەر دەستپێکی کارکردنیدا تێنەپەڕی، ئەوەبوو نامەیەکی نائاسایی پێگەیشت کە ئاماژەبوو بۆ ئەوەی ئەم رۆژە وەك رۆژەکانی تر ئاسایی نییە.

سەعات (٨:٤٥)ی سەرلەبەیانی یاریدەدەرەکەی دەردەکەویت‌و پێی دەڵێت فرۆکەیەك خۆی کێشاوە بەسەنتەری بازرگانی جیهانیدا. کۆندی بیر لەم روداوە

نامۆیە دەکاتەوەو دواتر پەیوەندی دەکات بە سەرۆك بوش لەفلۆریدا کە لەسەر بەرنامەی هەڵبژاردنەکەی قسەی دەکردو هەواڵەکەی پێدەدات. سەرۆك پێی دەڵێت:"ئای کە رووداوێکی شومە" پاش ماوەیەکی کورت کۆندی کۆبوونەوەیەك بە کارمەندەکانی دەکات، بەڵام ئەوەندەی پێناچێت یاریدەدەرەکەی دێتە ژورەکەو لاپەڕەیەکی پێدەدات. لاپەڕەکە باس لەوە دەکات کە فڕۆکەیەکی تر خۆی کێشاوە بەتاوەرێکی تردا. لەوکاتەدا کۆندی یەکسەر هەستدەکات کە کارەکە هێرشێکی تیرۆریستییە.

کۆندی بیری لەوە دەکاتەوە کە بانگهێشتی کۆبوونەوەیەکی ئەندامانی باڵای ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بکات. دەچێتە قاتی زەمینییەوەو راستەوخۆ روودەکاتە هۆڵی حاڵەتە کتوپڕەکان کە ناوەندی سەرکردایەتی سەربازی بوو و دەکەوێتە بەشی خوارەوەی بەشی خۆرئاواوە، دواتر بەپەلە تەلەفۆن هەڵدەگرێت. لەرووی مێژووییەوە ئەندامانی سەرەکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پێکدێن لە سەرۆك، جێگری سەرۆك (دیك چینی)، وەزیری دەرەوە (کۆڵن پاوڵ)و وەزیری بەرگری (دۆناڵد رامسفێڵد). هەروەها لەناو ئەندامەکانی تری ئەنجوومەنەکە وەزیری گەنجینە (پۆڵ ئۆنێل)و سەرۆکی دەستەی ئەرکان (هێنی شێڵتۆن)و بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگریی ئەمەریکی (جۆرج تینیت) هەن.

تەنها سەرۆك نەبوو کە نەیتوانی ئامادەی کۆبوونەوە نائاسییەکە ببێت، لەبەرئەوەی رۆناڵد رامسفێڵدیش لەوکاتەدا لە نووسینگەکەی خۆی بوو لە پێنتاگۆن، بەڵام بە راکردن بەناو رێڕەوەکاندا دەڕوات تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە فڕۆکەی ئەمەریکان ئێیەرلاینز لە گەشتی ژمارە ٧٧یدا لە سەعات ٩:٤٣ی خولەك خۆی کێشابوو بەباڵەخانەی پێنتاگۆنداو دەستدەکات بە رزگارکردنی بریندارەکان. دواتر دۆناڵد دەچێتە ئەو ناوەندە سەرۆکایەتییەی دەکەوێتە قاتی ژێر زەوییەوە بۆ ئەوەی لە رێگەی تەلەفۆنەوە ئامادەی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ببێت. لەوکاتەدا دیاربوو کۆڵن پاوڵ کە لە لیما لەگەڵ سەرۆکی نوێی پیرۆ، سەرقاڵی نانخواردنی بەیانی بوو، ناچاردەبێت سەعات ١٠:٤٥ی بەیانی

بگەڕێتەوە واشنتۆن، بەڵام شیلتۆن لەوکاتەدا لەناو فڕۆکەیەکدا بوو لەسەر زەریای ئەتلەسیو بەرەو ئەوروپا دەڕۆشت.

پاش دوو خولەك لەخۆکێشانی فڕۆکەی سێیەم بە باڵەخانەی پێنتاگۆندا، فەرمان بە کارمەندانی کۆشکی سپی دەدرێت کۆشکەکە چۆڵبکەن، داوا لە کۆندی دەکرێت هۆڵی حاڵەتە کتوپڕەکان چۆڵبکاتو بچێتە ژورێکی تایبەتی قەڵغانکراوی ژێرزەوییەوە. کۆندی زانیاری ئەوەی پێدەگات کە چینی پێش ئەو، گەیشتۆتە ئەو ژورە، بەڵام ئەم پێش ئەوەی بچێتە ژورەکە، بەتەلەفۆن پەیوەندی بەسەرۆکەوە دەکاتو داوای لێ دەکات نەگەڕێتەوە بۆ کۆشکی سپی. کۆندی پێشی دەڵێت کە وەزیرو کارمەندەکانی، ترسی لێدانێکی تریان هەیە کە ئاڕاستەی واشنتۆن بکرێت. سەرۆك ئامۆژگارییەکانی ئەوان بەهەند وەردەگرێتو بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بەفڕۆکە بەسەر چەند شوێنێکدا دەسوڕێتەوەو تاسەعات ٦:٣٠ ی ئێوارە ناگەڕێتەوە کۆشکی سپی.

هەر کە گەیشتە ژورە قەڵغانکراوەکەی ژێرزەمین، کۆندی تەلەفۆن بۆ خاڵۆ ئەلتۆو هاوسەرەکەی دەکات کە دانیشتووی بیرمنگهام بوونو داوایان لێدەکات بەهەمووان بڵێت ئەم هیچ زیانێکی پێنەگەیشتووە. دواتر کۆندی تەلەفۆن بۆ سەرۆکی چەندین وڵاتی جیهان دەکاتو پێیان ڕادەگەیەنێت کە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان سەلامەتەو کاری خۆی ڕادەپەڕێنێت. بەدرێژایی ئەو ڕۆژە کۆندی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە لەگەڵ سەرۆکدا ئەنجامدەدات. لە سەعات ٣:٥٥ ی ئەو ئێوارەیەوە دیك چینیو کۆندی بەتەلەفۆنکردنەوە سەرقاڵدەبن، هاوکات سەرۆك ڕوودەکاتە بنکەی ئۆفۆتی سەربە هێزە فڕۆکەوانییەکان کە دەکەوێتە نبراسکاوە.

لەو هەینییەدا کۆندی وەك هەموو دانیشتوانی وڵات، هەست بەشۆك دەکات. دواتر بەئاڕاستەی کاتیدرائی نەتەوەیی، لەپێناو ئامادەبوون لە نوێژێکی یادەوەریدا کەتێیدا چەندین وتارخوێنی ئایینە جیاکان وتار پێشکەشدەکەنو هەمووان داوای دڵدانەوەو یەکێتییان دەکرد، دەچێتە ناو کەژاوەیەکی سەرۆکایەتییەوە. لەماوەی هەفتەی یەکەمی ڕووداوەکەدا کۆندی هەروەك ڕۆژانی

تـر، تـوانی پارێزگاری لـه بەرنامـەی سروشـتی ژیـانی خـۆی بکـات. ئـەم خانمـە لـە سەرەتاکانی ساڵی ۲۰۰۲دا دەڵێت: "لەو کاتەوەی کچێکی بچووك بووم، پشـتم بـە بڕوا بەستووە، بڕوایەك کە دەڵێت: هەرگیز من بەتەنها نیمو بنچینە زۆر ناهەژێ. هەمیشـە ئـەو بڕوایـەم وەك بەشـێك لـەخۆم پاراسـتووەو ئێسـتا سـوودی لـێ دەبینم"

ساڵێك پێشتر ئازارێکی تری چەشتبوو کە ئەویش بـەهۆی مردنـی باوکییـەوە بوو کە لە بەهاری ۲۰۰۰دا توشـی نـۆرەدڵێ هـاتو تـامردن چـاك نەبوویـەوە. جۆن هاوشـانی هەڵمـەتی هەڵبـژاردنی بـوشو ئـەو قەیرانـە بـوو کەپرۆسـەی دەنگـدان بەدوای خۆیدا هێنـا. کۆنـدی تـوانی ئـەوەی لەتوانیایـدا بێـت لـەکات، لەتەنیشـت ئەودا بەسەری ببات. جۆن تا ئەوکاتەی بە گوێی خـۆی دەبیسـتێت کـە سـەرۆکی هەڵبـژێردراو، ئەستێرە لاوەکـەی وەك راوێـژکاری داهـاتووی ئاسایشـی نەتـەوەیی دامەزرانـد، لەژیانـدا مـابوو. لـەئێوارەی پـێش سـەری سـاڵی ۲۰۰۰دا بـاوکی کۆنـدی لەتەمـــەنی ۷۷ ســـاڵیدا کۆچـــی دواییـــدەکات کـــە ئەوکاتـــە شـــەش رۆژ بەســـەر دامەزراندنی کۆندیدا تێپەڕیبوو.

پاش هێرشەکانی ۱۱ی سێپتەمبەر، دەرکەوتنی کۆندی لەسـەر شـانۆی سیاسـی زیـاتر بـوو. کۆنـدی وا راهـاتبوو بەپێچـەوانەی برێنـت سـکۆکرۆفتەوە، میـدیاکانی ســەبارەت بـــەنوێترین هەوالـــەکانی شـــەڕی دژەتـــیرۆر ئاگـاداردەکردەوە، بـــەلام سـکۆکرۆفت لەکاتێکـدا لەئیدارەکـەی بوشـی باوکـدا ئـەو پۆسـتەی لەدەسـتدابوو، هەرگیز لەدەرەوەی دیوارەکانی کۆشکی سپی، قسەی بۆ میدیاکان نەکردووە.

سکۆکرۆفت زۆربەی وزەکانی بۆ هەماهەنگیکردنی سیاسـەتی دەرەوەی بـوش تەرخاندەکردو خۆی نەدەخستە پەیوەندییە ئاشکراکانەوە. پاش چەند مانگێکی کـەم لـە دامەزرانـدنی کۆنـدی، برێنـت دەڵێت:"ئەگـەر کۆنـدۆلیزا رایـس کارەکـانی وەك پێویسـت جێبـەجێبکات، سـەرۆك دەبێتـە جێگرنگیـی میـدیاکان". لـەرووی دەرکەوتنییەوە لە چەند راوێژکارێکی پێشووی ئاسایشـی نەتـەوەیی وەك هێنـری کیسنجەر لە ئیدارەی نیکسۆنو ساموێل بێرگەر لە ئیدارەی کلینتـۆن دەچێت کـە زیـاتر داڕێـژەری سیاسـەت بـوون وەك لـە هەماهـەنگکاری سیاسـەتو بەڕێوەبـەرو

بەوشێوەیە ئەم دوانە بەبەراورد لەگەڵ پێشبینەکانیاندا ناوبانگێکی فراوانتریان بەدەستهێنا.

لەماوەی هەفتەکانی یەکەمی دوای ١١ی سێپتەمبەر، کۆندی پەیوەندی راستەوخۆی لەگەڵ وەزیری دەرەوە پاوڵو وەزیری بەرگری رامسفێڵددا هەبوو و هەموو بەیانییەك لە سەعات ٧:١٥ەوە لەسەر ئەوە راهاتبوو. لەمیانەی ئەم پەیوەندییانەدا ئەم سیانە تاووتوێی ئەو بیرۆکانەیان دەکرد کە کۆیان دەکردەوە، پێش ئەوەی ئەم بیرۆکانە بگوازێتەوە بۆ سەرۆك، کۆندی لەبێژنگی دەدان. شایانی باسە کاری یاریدەدەری سەرۆك بۆ پرسەکانی ئاسایشی نەتەوەیی کە پۆستێکە پێی دەوترێت راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، بریتییە لە کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان بەسیاسەتی دەرەوە هەیەو پێشکەشکردنی هەموو بیرورا جیاوازەکان بەسەرۆك. هەروەها پۆستی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی زیاتر رۆڵێکی کارگێڕی هەیە وەك لە بڕیاردان. راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی وەك بەڕێوەبەرێکی متمانەپێکراو وایە کە زۆر کەم لە دەرەوەی کۆشکی سپی دەردەکەوێت. سەرۆکەکانی جیهان واراهاتوون کە پەیوەندییان لەگەڵ راوێژکارانی ئاسایشی نەتەوەییدا بەهێزدەکەن‌و هەریەکێك لەم سەرۆکانە پێشبینییە جیاوازەکانی لەگەڵ پێشبینی راوێژکارەکەی دیاریدەکات. کۆندۆلیزا رایس بەپێچەوانەی زۆربەی راوێژکارانی پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی، بووە ئەستێرەیەکی میدیاکان بەتایبەت دوای هێرشەکانی ١١ ی سێپتەمبەر کەتێیدا دەستیکرد بەئەنجامدانی چەندین کۆنگرەی رۆژنامەوانی سەبارەت بەشەڕی دژە تیرۆر.

کۆندی دەڵێت: "هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەم ئەوەم لەبیربێت کە پێویستە بەوپەڕی رێکوپێکی‌و تەواوەتی چیرۆك‌و رووداوەکە بدەم بەسەرۆك، پێویستە لەوە دڵنیابم کە سەرۆك لەهەموو شتێك دەزانێت". کۆندی پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بیروبۆچوونە تایبەتەکانی خۆی دیاریدەکات‌و لەمیانەی بیروڕای کەسانی تردا پێشکەشی سەرۆکی دەکات. دەشڵێت: "من بەرپرسی چێککردنی سەرجەم کارەکانم پێش ئەوەی پێشکەش بەسەرۆك بکرێن، ئەمەش

مانای ئەوەیە کە خراپ کەلکم لەواقیعی کارکردنی نزیکم لەسەرۆك بوش، وەرنەگرتووە".

دیارە ئەو بیرورا تایبەتانەی کۆندی لە کاروباری سیاسەتی دەرەوەدا هەیەتی، ئەنجامی دیدە کۆنەپارێزییەکەو دیدی واقعبینانەی سیاسیەتی بوون. ئەم دیدە کەمتر داوادەکات کە ئەمەریکا بە هێزی سەربازی بچێتە ناو ناکۆکییەکانی ولاتانی ترەوە. ئەم پرۆگرامەی داوادەکات دەستتێوەردانی سەربازیی نەبێت، بیروباوەڕێکی کلاسیکی سیاسەتی دەسەلاتدارەو وەك ئامێرێك کە پێویستە بەوردبینییەکی زۆرەوە بەکاربهێنرێت، دەڕوانێتە هێزی سەربازی. لەیەکێك لەو وتارانەی لەهەفتەکانی کۆتایی هەلمەتی هەلبژاردندا پێشکەشیدەکات، کۆندی بەڕوونیو بەدەنگێکی بەرز ئەم دیدەی دەردەبڕێت. لە ئۆکتۆبەری ۲۰۰۰دا رایگەیاند کە ئەگەر بوش وەك سەرۆك هەلبژێردرا، هێزەکانی ئەمەریکا لەناوچەی بەلقان دەکێشێتەوەو بەرپرسیارێتی سەرکردایەتیکردنی هێزە ئاشتیپارێزەکان بۆ ئەوروپییەکان جێدێلێت. کۆندی لە درێژەی قسەکانیدا دەلێت کە بوونی هێزی ئەمەریکی لەوێ ئامادەیی ئەو هێزانە لە شوێنەکانی تری وەك ئاسیاو دورگەی فارسی، کەمدەکاتەوە. ئەم وتارەی مشتومڕێکی زۆری لە ئەوروپا وروژاند. دواتر جۆرجی کوڕ دان بەوەدا دەنێتو دەلێت:"وازمان لە رێرەوە هەلەکەمان لە ئەوروپا هێناوە".

کۆندی پوختەی پرۆگرامەکەی لە سیاسەتی دەرەوەدا چڕکردبووەوە، کە ئەمانەش ئەو بیرورایانە بوون کە تێیاندا لەگەلّ جۆرجی کوڕدا هاوبەشبوونو لە وتارێکی درێژدا لە گۆڤاری سیاسەتی دەرەوە، Foreign Affairsدا بلاویکردووەتەوە. وتارەکەی کۆندی چەندین دەستەواژەی روونی سەبارەت بەڕێکوپێکی بەکارهێنانی هێزی سەربازیی، تێدایە لەوانە "بەکارهێنانی هێزی چەکداری ئەمەریکی بەشێوەی ۹۱۱ (ژمارە تەلەفۆنی فریاکەوتنە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان) بەشێوەیەك کە جیهان بگرێتەوە، دەبێتەهۆی لاوازکردنی تواناکانی سوپاو سەربازان ناچاردەکات رۆلی ئاشتپارێز ببیننو دەشبێتە هۆی زیادبوونی نیگەرانی زلهێزەکانی تر سەبارەت بەترسیان لەوەی کە ویلایەتە

یـــەكگرتووەكان لـــەژێر نـــاوی دەســـتتێوەردانی مرۆیـــی ڕۆڵێـــك ببینێـــت لەجێبـــەجێكردنی چـــەمكەكانی ســـەروەری ســـنووردار لەسەرتاســـەری جیهانـــدا. پێویستە سەرۆك ئەوەی لەبیربێت كە سوپا ئامێرێكی خاوەن تایبەتمەندییەكی سـەختە. دەوترێـت سـوپا ئـامێرێكی كوشـندەیەو ئەمـەش ئـەو ڕۆڵەیـە كـە بـۆی دانـراوە، نـاتوانین بڵـێین سـوپا دەتوانێـت ڕۆڵـی ناوبـژیوانێكی سیاسـی ببینێـت. دەتوانین لەوەش دڵنیابین كـە سـوپا بـۆ ئـەوە دانـەنراوە كۆمەڵگەیـەكی مـەدەنی بنیـات بنێـت. بەڕاسـتی باشـترین بـەكارهێنانی هێـزی سـەربازی بریتییـە لـە پێشكەشكردنی یارمەتی بۆ ئامانجی سیاسی ڕوون و ئاشكرا".

ئەم تێڕوانینە لە مانگەكانی یەكەمی گرتنەدەسـتی حوكم لەلایـەن بوشـەوە بـەڕوونی دەركـەوت، گـەورەترین بەڵگـەش لەسـەر ئـەم تێڕوانینـە لـە سیاسـەتی پرۆگرامی وازهێنان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە.

كۆندی بەوە ناسراوە لەكاتێكدا لەژێر فشاردایە خاوەنی هێمنی و خۆڕاگرییـە، ئەمەش هۆكاری بنچینەیی بوو بۆ ئەوەی پاش هێرشەكانی ١١ی سێپتەمبەر وەك وتەبێژی كۆشكی سپی، هەڵبـژێردرێت. هـەرگیز شـلەژان بەكۆندییـەوە نابینرێـت، دەتوانێـت بـە هاوسـەنگییەكی زۆرەوە بیربكاتـەوەو بابەتـە ئاڵۆزەكـان بـەڕوونیو سـادەیی، ڕوونبكاتـەوە. ئـەم تایبەتمەندییانـەی كۆنـدی وایـان لێكردبـوو لـەناو چەندین هاوكاریدا جیاواز بێتو ئەمەش وا لە جۆرجی كوڕ دەكات داوای لێبكات لەكاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەكەیدا لەسەر سیاسەتی دەرەوە، ڕاهێنـانی پـێ بكـات. كویت پلاكەر كە هاوڕێی كاتی زانكۆی سـتانفۆردی، بـوو نازنـاوی خـاوەنی مێشـكە بروسكەئاساكەی لێ ناوە. جۆن ڕازیـان كـە لـە ئینیسـتیتیوی هۆڤـەر بەڕێوەبـەری بوو، دەڵێت كۆندی توانایەكی نـاوازەی لـە قسـەكردن بەشێوەی سـەرپێیی هەیـە. جـۆن دەشـڵێت:"لەكاتی پێشكەشـكردنی وتـاردا دەمـان بـینی هـیچ تێبینییـەكی نووسـراوی پێنـەبوو. ئـەو پلانـی بـۆ بیرهێنانـەوەی ئـەو شـتانەی كەدەیـەوێت بیانڵێـت دادەنـا، بەشـێوەیەك ئەمـەی دەكـرد كـە پێویسـتی بـەتۆماركردنی بیرۆكەكانی نەبوو". كۆندی هۆكاری ئەمە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە كە ئەم كارە لەناو ئـەو پرۆفیسـۆرانەی زانكـۆدا كـە توانـای قسـەكردن و وەڵامدانـەوەی پرسـیاریان

لەبەردەم خوێندکارانی پۆلەکانیاندا هەیە، شتێکی دەگمەن نییە، دیارە ئەو توانیویەتی ئەم لێهاتووییەی تارادەیەکی زۆر، پەرە پێبدات.

کۆندی قسەکردنی لە بەرنامەکانی بەیانی شەممە لە واشنتۆن‌و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی پەیوەندییان بەسیاسەتی دەرەوە هەبوو، بەسادەترین ئەرکەکانی پرۆگرامەکەی لەقەڵەم دەدات. ئەرکی کۆندی لەم ماوەی مێژوودا پێویستی بەشیکردنەوەی ئەو بیروڕا هەمەجۆرانەوە هەیە کە لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دەردەکەون‌و پەیوەندییان بەشەڕی دژە تیرۆر، شەڕ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕ لە هندستان‌و پەیوەندییەکانی کۆریای باکورو چین‌و قەیرانە دیارەکانی جیهانەوە، هەیە. پاش تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر هێرشە تیرۆریستییەکاندا ساموێل بێرگەر دەڵێت: "دەتوانین ئەم ئەرکە لەپێودانگی یەك تا ١٠دا، بەپلەی ١٥ هەم دابنێین. ڕێزێکی زۆرم بۆ ئەو کارانە هەیە کە کۆندی لەم ڕۆژانەدا ئەنجامیاندەدات".

ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەسەردەمی ئیدارەی ترومانـدا دامەزراوە، ئەویش پاش ئەوەی دوای کۆتاییهاتنی شەڕی جیهانی، بەپێویستیان دانا بڕیار لەو سیاسەتانەدا بدرێت کە پێویستیان بەبوونی پەیوەندی باشتر لەنێوان هەردوو تیمی سەربازی‌و دیبلۆماسی سەرۆکدا هەبوو. ترومان لەسەرەتای ماوەی سەرۆکایەتییەکەیدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك پرسی سیاسی ئاڵۆز دەبێتەوە. ترومان پرسی ئەو بۆمبە ناوکییەی دەزانی کە تازە ویلایەتە یەکگرتووەکان پەرەی پێدابوو و ڕووبەڕووی ئەو پرسە بووەوە کە ئایا پێویستە لەدژی ژاپۆنییەکان بەکاری بهێنێت؟. یەکێتیی سۆڤیەت توانی چەند سیستمێکی سەربازیی لە چەندین وڵاتی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا دابمەزرێنێت، بەڵام وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا ڕاستەوخۆ دوای شەڕی جیهانی دووەم بەدەست دارمانی دارایی‌و برسێتییەوە دەیانناڵاند. ئەم بارودۆخانە وای لە ترومان کرد لە ساڵی ١٩٤٧دا یاسای ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بنووسێت کە دامەزراندنی ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاریی نوێی لەخۆگرتبوو کە پێکهاتبوو لە سەرۆکانی ئەرکان‌و سەرکردە سەربازییەکان، ئەم ئەنجوومەنە ناونرا ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی.

ترومان روونیدەکاتەوە کە رۆڵی ئەنجوومەنەکە تەنها راوێژکارییەو رایگەیاند کە خودی خۆی "ئازادی تەواوەتی بۆ پەسەندکردنو رەتکردنەوەو هەموارکردنی ئەو ئامۆژگارییانەی ئەنجوومەنەکە پێشکەشی دەکەنو راوێژکردن لەگەڵ ئەندامانی تری خێزانە فەرمییەکەی" هەیە. سەرۆك پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە خاوەنی وتەی کۆتایی خۆیەتیو بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێی دراوە بڕیار لەسەر ئەم سیاسەتە دەداتو جێبەجێی دەکات.

یەکەمین بەڵگەنامە سیاسییەکان کە ئەنجوومەنەکە پێشکەشی سەرۆکی دەکات، چەند بیروڕایەك بوون کە لە چوارچێوەی بەڵگەنامەیەکدا رێکخرابوونو خرانە نێو پرۆسەی داڕشتنی سیاسەتی ترومانەوە. یەکێك لەو بەڵگەنامانەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پێشکەشیدەکات، یارمەتی دیاریکردنی پلانی مارشاڵ دەدات کە پێکهاتووە لە چەپکێك کۆمەکی دارایی زەبەلاح کە ئەمەریکا پێشکەشی ئەورووپای خۆرئاوای دەکات. سەرپەرشتیکردنی ئەرکەکانی داڕشتنی سیاسەتو ئەرکەکانی تری ئەنجوومەنەکە خرابووە ئەستۆی بەڕێوەبەرەوە کە ئەوکاتە پێی دەوترا سکرتێری جێبەجێکار. ئەدمیراڵ سیدنی ویلیام سوێرس لەسەردەمی ترومانـدا پۆستی سکرتێری جێبەجێکار دەگرێتەدەست. سیدنی یاریدەدەرێکی نزیکی سەرۆك بوو و پاش شەڕی جیهانی دووەم، لە رێکخستنەوەی ئاژانسە هەواڵگرییەکاندا یارمەتی دەدا. سوێرس خاوەنی باکگراوندێکی نایاب بوو لە کاروباری سەربازیو جیهانی بازرگانیداو یەکەم بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگریی ئەمەریکیش بوو و ماوەیەکی زۆر لەو پۆستەدا دەمێنێتەوە. هەروەك زۆربەی راوێژکارانی تری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، سوێرس کەسێکی نزیكو متمانەپێکراوی سەرۆك بوو. جۆن برادۆس سەبارەت بەمێژووی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی نووسیویەتی: "ئەدمیراڵ سوێرس هاوڕێیەکی گەرمی سەرۆك بوو، یاریزانی پۆکەریش بوو و توانیبووی هەمیشە لەگەڵ هاری ترومانـدا کۆك بێت"

کاتێك کارمەندە باڵاکانی هەڵبژارد، ئەو کارانە چین کە جۆرج بوش دەیویست لە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییدا هەبن؟ یەکەم کەس کە ئەم

پۆستەی گرتووەتەدەست ئەم ئاکارانەی بەڕوونی دیاریکردووە. شایانی باسە کاتێك سوێرس بە ترومان رادەگەیەنێت کە دەیەوێت دەست لە پۆستەکەی لە کۆشکی سپی هەلگرێتو بگەڕێتەوە بۆ کەرتی بازرگانی، ترومان داوای لێدەکات ئەو سیمایانە دیاریبکات کە پێویستە لەو کەسەدا هەبێت کە جێگەی دەگرێتەوە. کتێبەکەی برادۆس چەپکێك لەو یاداشتەی لەخۆگرتووە کە سوێرس لە وەڵامی تروماندا پێشکەشی سەرۆکی دەکاتو تێیدا باس لەوە دەکات کە ئەم پێودانگانە تا ئەمڕۆش راستن:

پێویستە ئەو کەسە سیاسی نەبێتو جێی متمانەی سەرۆك بێت

پێویستە ئەو کاندیدە بابەتیانە بێتو ئامادەبێت بیروڕا سیاسییە تایبەتەکانی خۆی لە پلەیەکی خوارتر لە بیروڕاکانی تر دابنێتو بیروڕاکانی هەموو بەرپرسە فەرمییەکان رێکبخات.

پێویستە کاندیدەکە ئامادەیی بۆ پشتگوێخستنی ناوبانگو دیاردەکانی خۆبەزلزانین، تێدابێت.

برادۆس دەڵێت لەچەند دەیەیەکی کەمی پاش دامەزراندنی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، ئەندامەکانی دەتوانن دەسەڵاتێك بەدەستبهێنن کە هاوشانی دەسەڵاتی فەرمانبەرانی حکومەتو دیپلۆماتو ژەنەراڵەکان بێت. بەوپێیەی بەڕێوەبەری چەندین فەرمانبەری دەستڕۆیشتوو بوو و یەکێك بوو لە نزیکترین راوێژکارەکانی سەرۆك، راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی توانیبووی ببێتە کەسایەتییەکی گرنگ لە کۆشکی سپیدا.

کۆندی بە یەکەم ژن دادەنرێت کە ئەم پۆستە بگرێتە دەستو بیستەم راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییە. هەروەها پاش کۆڵن پاوڵ کە لەسەردەمی ئیدارەی ریگاندا ئەم پۆستەی گرتووەتە دەست، بە دووەم رەشپێست دادەنرێت کە لەم پۆستەدا دادەمەزرێندرێت.

دامەزراندنی کۆندی لەو پۆستە دەیکاتە دیارترین ژن لەبواری سیاسەتی دەرەوەو جێسەرنجی ژمارەیەکی زۆر لەو ژنانەی کە کاریان لەو بوارەدا دەکرد. مادلین ئۆلبرایت لەماوەی دووەمی سەرۆکایەتی کلینتۆندا وەك وەزیری دەرەوە

دادەمـەزرێت، ئەمـەش دەرگا والآ دەكات بـۆ هاتنـەناوەوەی زیـاتری ژنـان بـۆ نـاو سیاسەتی دەرەوە. ئۆلبرایت بە پابەندبوونی بە پرسی پێشكەوتنی ژنـان بـۆ ئـەم بوارە دەناسرێت و دامەزراندنی بەسەركەوتن بۆ هەموو ژنان لەقەلەم دا.

یـەكێك لـە هاوكارەكـانی كۆنـدی لـە زانكـۆی سـتانفۆرد لـەكاتی هەلمـەتی سـەرۆكایەتی جـۆرجی كـوردا رایگەیانـد كـە ئـەو توانیویـەتی دەنگدانەوەیـەك دروسـتبكات. مایكـل مـاكفۆل دەلێت:"پیـاوانی قـژروتاوە یـان پیاوانێـك قـژیان ماشوبرنجیی بووبێت كۆنترۆلی سیاسـەتی دەرەوەیـان كردووە، ئەمانـەش لەگـەل كەسێكی وەك كۆندی رایسدا رانەهاتوون". لێكۆلینەوەیەكی نوێ كە گروپی ژنـان بۆ سیاسەتی دەرەوە ئامادەی كردووە دەلێت تائێستاش لـەرووی ژمـارەوە پیـاوان لەپێش ژنانەوەن، بەلام سەرنج دەدرێت كە ژمارەیەكی زۆر لەژنان جێ پەنجەیان لەم بوارەدا جێهێشتووە. لێكۆلینەوەكە دەشلێت: "دامـەزراوەی سیاسـەتی دەرەوە كـە لەبنەرەتـدا لـە نێرینـە پێكـدێت بـەرەو گۆرانكـاری هـەنگاودەنێت. سـەرنج دەدرێت كـە ژمارەیـەكی زۆر لـەژنان لەویلایەتـە یـەكگرتووەكان دەچـنەناو بـواری پرسـە نێودەولەتییـەكان و پۆسـتی سـەركردایەتی دەگرنەدەسـت، كـە ئەمـەش شكاندنی سەدەیەك لە دابونەریتە..... روخساری ئەم ژنانە دەبینرێت و دەنگیـان لـە رێـرەوو پشـت پـەردەی دەسـەلاتەوە دەبیسـترێت كـە ئەمـەش لەپێشـوودا نەبینراوە".

پوختەی ئـەم لێكۆلینەوەیـە بـاس لـەوە دەكات كـە سـەردەمی پـاش جـەنگ توانیویەتی لەهەردوو بواری دیبلۆماسیو بەرگریـدا چانسـێكی زیـاتر بداتـە ژنـان، هـەروەها لـە چـەندین بـواری تـردا لەوانـە مافـەكانی مـرۆڤو یاسـاو فریاكـەوتنی مرۆیـی، بازرگـانی، ژینگـەو میدیاكانیشـدا. لێكۆلینەوەكـە پێداگری لەسـەر گرنگـی مـادلین ئۆلبرایـت دەكاتـەوە بـەم ئاراسـتەیەداو دەلێت: "دامەزرانـدنی مـادلین ئۆلبرایـت وەك ٦٤هـەم وەزیـری دەرەوەی ئەمـەریكا ئاماژەیـەكی زەقـە بـۆ گۆرانكـاریی لـەم پۆسـتەدا... لـە سـالی ١٩٧٠دا ژنـان رێـژەی لەسـەدا 4.8یـان لـە كارمەنـدانی بـواری رازەی دەرەوەدا پێكهێنـابوو... بـەلام لـە سـالی ١٩٩٧دا ژنـان توانیویانـە لەسـەدا ١٨ی پۆسـتە دەرەكییـە بالاكـان و لەسـەدا ٢٤ ی پۆسـتە

کارگێڕییەکانی ڕێڕەوی دەرەوە بگرنە دەستو لەسەدا ۲۲ ی کۆی باڵیۆزەکان مسۆگەربکەن... هەروەها توانیویانە لەسەدا ٤٠ی یاریدەدەرانی وەزیرو لەسەدا ۲۸ی یاریدەدەرانو لەسەدا ۳۱ لە کۆی جێگری یاریدەدەرانی وەزیر بگرنەدەست".

ئەم کۆمەڵە ژنەی سیاسەتی دەرەوە نزیکەی ٦٠٠ ژن دەبنو ئەو سیمایانەی کە ژنان دەڵێن پشکیان لەسەرکەوتنیان هەبووە لەم بوارەدا، پیشاندراوە. دەتوانین ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە وەك پوختەی ئەزموونی کۆندۆلیزا رایس لەم بوارەدا، لەقەڵەم بدەین:

**ڕێزلەخۆگرتنو متمانەبەخۆبوونو سیمایەکی تر کە باسکراوەو بۆ سەرکەوتنی پیشەیی ژنان بەگرنگ دادەنرێت، ئەوەش لەسەروو پێشبینییەکانەوە بوو (بەڕێژەی لە سەدا ۹۵). هەستێکی دڵنیایی باوە کە دەڵێت ژنان پێویستە زیاتر ماندونەناسانە لە هاوکارە نێرینەکانیان کاربکەن بۆ ئەوەی بتوانن هەمان ئاستی ڕێزلێگرتن، متمانەو پلە بەدەستبهێنن کە پیاوان دەیگرنەدەست. ڕێژەی لەسەدا ۸۰ ی ژنان کۆکن لەسەرئەوەی کە بەدەستهێنانی شارەزایی نێودەوڵەتی هۆکارێکی گرنگە بۆ پێشکەوتن لەو کارەی کە مرۆڤ دەیکات. لەسەدا ٧٤ی ژنانیش لەسەر ئەوە کۆکن کە "پەرەپێدانی پرۆگرامێکی دیاریکراو کە هاوکارە نێرینەکانیان پێی ئاسودەبن"، هۆکارێکی گرنگە بۆ سەرکەوتن.**

کۆندیو مادلین ئۆلبرایت دوو ڕێڕەوی جیاوازیان لەبواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا هەبوو، بەڵام ئەم دوو ژنە لەچەند ئاکارێکدا هاوبەش بوون، هەریەکێك لەم دوانە بەباوکیان سەرسام بوونو هەوڵیانداوە سەرکەوتن بەسەر ئەواندا بەدەستبهێنن. مادلین بەو هیوایەی لەپیشەی باوکیدا کاربکات، توانی پێشکەوتن لەبواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا بەدەستبهێنێت. لەمبارەیەوە دەڵێت:"هەوڵمدا جۆرێك کارکردن وەك ئەوەی باوکم بدۆزمەوە. زۆرێك لەوانەی کردوومن دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە حەزمکردووە وەك باوکم بم". کۆندیش لەلایەن خۆیەوە هەنگاوی هاوشێوەی باوکی ناوە، کتومت وەك باوکی، کاری لەهەردوو بواری فێرکردنی زانکۆییو بەڕێوەبردنی زانکۆییدا دەکرد. ژیانی خۆی

لەپێناو تازەلاوانی هەژاردا تەرخاندەکرد ئەمەش ئەو پابەندبوونە بوو کە ژیانی جۆن رایسی باوکی پێ جیادەکرایەوە، کۆندی بەشداری لە دامەزراندنی سەنتەری نەوەی نوێ لەکالیفۆرنیاشدا کردووە. هەروەك پیشەی هەمیشەیی باوکیشی، کۆندی باوەڕبوون ـی لە برپڕەی پشتی ژیانیدا جێگیرکردووە.

مرۆڤ دەتوانێت سەرنجی چەند لێکچوونێکی تر لەنێوان سەردەمی منداڵی کۆندیو مادڵیندا، بدات لەوانە پاراستنو پابەندبوونی پەرۆشانەیان بۆ فێربون. مادڵین دایكوباوکی بەزیادەڕۆ لەڕووی پارستنەوە ناودەباتو دەڵێت باوکی لەسەر سووربوون بۆ فێرکردنی ئەم، زۆر رۆشتووە. دۆبس دەنووسێت:"باوکی مادڵین واڕاهاتبوو کە وتارەکانی بۆ راستدەکردەوە..... سەبارەت پەیوەندیپێکردنی بەباشترین قوتابخانەکانەوە هەمیشە دوودڵبوو، بەباشی پلانی بۆ داهاتووی دادەنا". لەپێناو پاراستنیدا لەترسی سیاسەتی جیاکاری رەگەزی، دایكوباوکی کۆندی زۆر دووردەکەونەوەو خۆیان بۆ فێرکرنو رۆشنبیرکردنی تەرخانکردووەو هەروەك چۆن لەژووری پۆلدا ئاگایان لێ بووە، ئاوهاش لە ماڵەوە گرنگییان پێداوە.

لێرەدا دەتوانین لێکچوونێکی تر لەنێوان کۆندیو مادڵیندا بدۆزینەوە ئەویش ئەوەیە کە هەردووکیان لەسەرەتای ژیانیاندا کەسێکی بێگانە بوون. مادڵین هاووڵاتییەکی چیکییەو لەتەمەنی ١١ ساڵیدا هاتووەتە ناو ویلایەتە یەکگرتووەکانو بەئینگلیزییەکی باش، بەڵام بەشێوەزاری بەریتانی قسەی دەکرد، خودی خۆی دەڵێت: "کاتێکی زۆرم بەدڵەڕاوکێ بەسەربردووە لەبەرئەوەی دەمویست لەوە دڵنیابم کە لەگەڵ کۆمەڵگە نوێیەکەمدا دەگونجێم". بێگومان بارودۆخی کۆندی زیاتر سەرنجراکێش بوو، ئەو کیژۆڵەیەکی رەشپێست بوو و لەشارێکدا دەژیا کە لەو شارانە بوو زۆرترین جیاکاری رەگەزیی تێدابوو، بەڵام هەر لەسەرەتای پێگەیشتنییەوە، بە توندوتۆڵی پەروەردەدەکرێت ئەویش لەبەرئەوەی دڵنیابن کۆندی بە رێگەیەکی جیاواز سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت، نەك تەنها خۆگونجاندن لەگەڵ کولتوری وڵاتدا بەگشتی.

کۆندیو مادلین وەك دوو لێکۆلەر بایەخ بە ئەورووپای رۆژهەلاتو یەکێتیی سۆڤیەت دەدەن، بەلام بێگومان سەرنج دەدەین ئەم دوانە لەگۆڕەپانی سیاسیدا لەیەك ناچن هەرچەندە هەردووکیان دوو کەسایەتی دیاری کاروباری سیاسین. مادلین ئۆلبرایت لە سالی ۱۹۸۸ کۆندی وەك کچێك کە باوکی لە زانکۆی دینیڤەر سەرپەرشتیدەکات، دەناسێت کاتێك بەتەلەفۆن پەیوەندی پێوەدەکات بۆ ئەوەی پرسیاری لێبکات کە ئایا دەتوانێت لە هەلمەتی سەرۆکایەتی کاندیدی دیموکراتەکان مایکل دۆکاکیس یارمەتی بدات. لەم کاتەدا بێدەنگییەکی سەرسوڕهێنەر بال بەسەر تەلەفۆنەکەدا دەکێشێت، کۆندی دواتر بەمشێوەیە وەلامدەداتەوە: "مادلین، نازانم چۆن پێت بلێم کە..... من سەربە پارتی کۆماریم".

کۆندی دەلێت لەگەل مادلینیدا هەرچەندە لەهەندێك کاردا جیاوازن، بەلام باکگراوەندێکی هاوبەشو گرنگیان هەیە. ئەمە روونەدەکاتەوەو دەلێت: "مادلین دەناسمو زۆرم خۆشدەوێت، سەیر نییە کە هەردووکمان دایكوباوکێکی رۆشنبیرمان هەیە، بەلام بڕوامان بەشتە جیاوازەکان هەیە... رەنگە لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی هێز کۆك نەبین... بەلام لە بڕوابوونمان بەهەندێك لە بەها گرنگە بەهێزەکاندا، هاوبەشین".

کۆمەلەی ژنە دیارەکانی بواری سیاسەتی دەرەوە جین کیرباتریك لەخۆدەگرێت کە یەکەم ژنی ئەمەریکییە وەك بالیۆز لەنەتەوە یەکگرتووەکان دادەمەزراوە، لەلایەن سەرۆك ریگانەوە ئەو پۆستەی پێدراوە. جین پسپۆڕی زانستە سیاسییەکان بوو و چەند پۆستێکی لە زانکۆو راژەی حکومیدا گرتووەتە دەست، ماوەی چەند سالێکیش لە وەزارەتی بەرگریدا کاریکردووە، ئەمیش هەروەك کۆندی وەك راوێژکاری کاروباری دەرەوەی کاندیدێکی سەرۆکایەتی کاریکردووە کە ئەویش ریگانە. ژنێکی تریش لەم بوارەدا دەردەکەوێت کە ئەویش سوانی هنتە کە لەماوەی چوار سالی ئیدارەی کلینتۆندا وەك بالیۆزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەنەمسا کاریکردووە. بەهۆی هەولەکانییەوە بۆ جێگیرکردنی ئاشتی لە بۆسنە لەمیانەی ئەو شەڕانەی لەوێ هەلگیرسا، سوپاسو

ستایشێکی زۆر کراوە. سوانی ئێستا لە پەیمانگای جۆن ئێف کینیدی بۆ کارگێڕیی حکومی وانە دەڵێتەوە.

کۆندی دواتر بەمەبەستی دەستبەکاربوون وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، دەچێتە واشنتۆن و لە ۆتەرگەیت شوقەیەك دەکرێت، ئەو شوێنی نیشتەجێبوونەی دەکەوێتە سەر رووباری پۆتۆماك، ئەمەش شوێنێکە کە دادوەرانی باڵای دادگاو چەندین کەسی دیاری تری واشنتۆن تێیدا نیشتەجێ دەبن. کۆندی لەگەڵ خۆیدا ئەو پیانۆیەی باوکی لەتەمەنی ١٣ ساڵیدا بۆی کڕیبوو، ئامێری راهێنانی بەپێ رۆیشتن و ئەو پێڵاوانەی لە بازاڕی فیراماگۆ کڕیبوونی، دەبات بۆ ئەو شارە. وەك سەردەمی ستانفۆرد کاتی پێویستی نابێت بۆ راهێنان، بەڵام لە پێشکەشکردنی ئاهەنگی ژەنین لەبۆنە نافەرمییەکاندا، بەردەوام دەبێت. لە نیسانی ٢٠٠٢دا پەیوەندییەکی تەلەفۆنی وەك سوپرایزێك پێدەگات کە تێیدا داوای لێدەکرێت ئاهەنگێکی گەورە رێکبخات، لەو ئاهەنگەدا خەڵاتی نەتەوەیی بۆ هونەر بەژمارەیەك ژەنیار، دەدرێت.

یەکێك لە ژەنیارە دیارەکان یو-یو ما بوو کە ژەنیاری ڤیۆلۆنسێل بوو، کە یەکێك بوو لەوانەی خەڵات وەردەگرن. ئەم پیاوە داوا لە کۆندی دەکات پێکەوە پارچە موزیکێك لەم ئاهەنگەدا لێبدەن. یو-یو بەیەکێك لەبەناوبانگترین ژەنیارانی موزیکی کلاسیکی لەسەر ئاستی جیهان لەقەڵەمدەدرێت و زۆر بەخۆشحاڵییەوە هاوکاری ئەو کەسانە دەکات کە بەگرنگییەوە دەیانەوێت فێری موزیك بن، ئەمەش بۆیە دەکات، چونکە بڕوای وایە ئەو کەسانە شیاوی ئەوەن لەبەردەم جەماوەرێکی زۆردا موزیك بژەنن. ئەم پیاوە پێشتر بیستبووی کە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی پیانۆژەنێکی لێهاتووە هەربۆیە داوای لێ دەکات لەو بۆنەیەدا کە لە هۆڵی دەستوور لە ٢٢ی نیسان سازدەکرێت، پارچە موزیکێك بژەنێت. ئێوارەی ئاهەنگەکە کۆندی بە ژەنینەکەی توانی سەرنجی خەڵك بەلای خۆیدا رابکێشێت. یو-یو پارچەموزیکێکی برامز هەڵدەبژێرێت کە ژەنیارە خوازراوەکەی کۆندییە، ئەویش بریتیبوو لەپارچەموزیکی خاوی ئاداجیو لە سۆناتەی کەمان، ژمارە ٣ لەسەر چینی D ماینۆر (کە پارچە موزیکێکە بەسەر ڤیۆلۆنسێلدا دابەشکرابوو).

لەو ئێوارەیەدا سەرۆك بوش مەدالیایەك پێشکەش بە یو-یو دەکاتو بە"ژەنیارێکی ناسراوی ڤیولنسیلۆ لەسەرتاسەری جیهان کە بەلگەی باشترین موزیکی کلاسیکییە، ناوی دەبات". دواتریش سەبارەت بە راوێژکارە چاوەڕوانکراوەکەی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی دەلێت: "پاش کەمێکی تر ئەم کەسایەتییە ئەمەریکییە مەزنە، لەگەڵ کەسایەتییەکی جیهانیی مەزنی تر موزیك دەژەنێت".. لەکاتی پێشکەشکردنی پارچە موزیکەکە لەلایەن هەردووکیانەوە، لاوراو بوش ژەنیارەکان پێشکەش دەکەن. کاتێك لاورا بەجەماوەر دەڵێت کۆندۆلیزا رایس پیانۆ دەژەنێت، ئەوەش ئاشکرا دەکات کە بنەچەی کۆندی دەگەڕێتەوە بۆ خۆرئاوای تەکساس. یەکێك لە رەخنەگران بەم رێزلێنانە "راشکاوو راستەوخۆ"یەی خانمی یەکەم بۆ ئەم دوو ژەنیارە، زۆر سەرسام دەبێت. لاورا ئارەزووی موزیکی کلاسیکی دەکاتو بێگومان کۆندیش بەبوونی کەسێك لە کۆشکی سپی کە شەیدای موزیکی کلاسیکی بێت، خۆشحاڵ دەبێت.

دوو ژەنیارە شەیدا سەنگینەکە دەستدەکەن بە ژەنین، لەکۆتایی ژەنینەکەشیاندا پێشوازییەکی گەرمو سەرسوڕهێنیان لێ دەکرێت. پاش چەند رۆژێك لە بۆنەکە گریگ ساندۆ لە رۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵدا دەنووسێت: "خاتوو رایس لێوانلێو بوو لە موزیك...". دەشڵێت:

**بەرکەوتنە موزیکییەکانی بە بەهێزییو ریتمەکانی بەجێگیریی ناسراون، پارچەموزیکەکانیشی دەتبەنە دنیای بیرکردنەوەوە. ئەم وتەش بەتایبەتی لەو کۆپلانەدا راستە کە بەرێز ما هاورێیەتی دەکرد. ئەوکاتەی پێویست بوو کەمێك پەلەبەکات، کۆندی خاوەنی ئەو وردبینییە نەبوو کە دانپیانراوان هەیانبوو، دیاریوو کەمێك ترسی هەبوو و شەرمن بوو. من دەڵێم لەگەڵ ژەنینەکەیدا هاوسۆز بووم. ئەو کاریگەرییەم لەلا دروستبوو کە ئایا کۆندی لەخاڵی لوتکەی ژیانیدا وەستاوە؟ دیاریوو زۆر شەیدایە، پێشموایە هەموو مافێکی هەیە کەوا بێت. کۆندی توانی شەرەفێکی گەورە بە خۆیو هونەرو ولاتەکەشی، بدات.**

یو-یو لەمەودای ئەو رازیبوونە تێدەگات کە ئەو موزیکژەنانەی بۆ خۆشی، بەلام بەشێوەیەکی شێلگیرانە فێربوونی موزیکیان کردووە بەکاری خۆیان، لەکاتی

دەرخستی توانای موزیکییان لەبەردەم هاوڕێو هاوکارەکانیاندا هەستیپێدەکەن، هەروەها لەو کاتانەی بۆیان دەسەلێنن کە موزیکەکەیان تەنها ئارەزویەك نییە. لەکاتی دیدارێکیدا لەگەڵ کچە ڕۆژنامەنووسێکدا کە ڕۆژێك لە ستانفۆرد سەردانی دەکات، کۆندی کاتێك کاسێتێك دەخاتە ناو ریکۆردەری ئۆتۆمبێلە مارسیدزەکەیەوە، شتێکی لەم بابەتە دەکات. دەنگی موزیکە تۆمارکراوەکە کە جولەیەکی زۆر خێرابوو لە چوارینەی برامز بۆ پیانۆ کە پارچە موزیکێك بوو کۆندی زۆر بەلێهاتووانە لەگەڵ تیمی چوارینەی موێر، ئامادەی کردبوو، بە سبەیکەر بەرزدەکاتەوەو بە ئان رایلی داود کە کاری بۆ گۆڤاری جۆرج دەکرد، دەلێت:"پێموابوو دەتەوێت گوێ لەژەنینم بگریت".

ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی پێش ١١ی سێپتەمبەر مانگانە دووجار کۆدەبوویەوە. راوەدوونانی ئوسامە بن لادن، هێرشە ئاسمانییەکانی ئەفغانستان، دەستدرێژییەکانی ئەنسراکس، ئەو نیگەرانییەی بالی بەسەر ئاسایشی فرۆکەخانەکاندا کێشابوو و هەڕەشەی هێرشی تیرۆریستی نوێ، ئەنجوومەنەکە هەموو ئەمانەی لەبەرزترین پلەی ئامادەباشیدا دادەنێت. کۆندی پێش هێرشەکان رایگەیاندبوو کە کاری ئەو "یارمەتیدانە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە حکومەت وەك یەك پیاو کاردەکات"و پێداگریی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پاش هێرشەکانی ١١ ی سێپتەمبەر "وام لێهات لێکۆڵینەوە لەبوونی کۆدەنگی بکەم. پێموانییە هیچ هۆیەك هەبێت بۆ ئەوەی بڕیاری جیاجیا پێشکەش بە سەرۆك بکرێت لەکاتی پێویستدا نەبێت". کۆندی دەشلێت جاری وا هەیە پێویستە چەند بیروڕایەکی هەمەجۆر پێشکەش بکرێن. پاش هێرشەکان ئامانجەکانی ئیدارەکەی بوش تاڕادەیەك زیاتر وردبینیان دەکرد. کۆندی دەلێت: "ئامانجی ئیدارەکە تەنها ئەوە نەبوو کە جیهان زیاتر ئارام بێت بەڵکو باشترکردنی بوو"

شایانی باسە دیارترین راوێژکارانی سەرۆك بریتیبوون لە: دیك چینی جێگری سەرۆك، وەزیری بەرگری دۆناڵد رامسفێلد، وەزیری دەرەوە کۆڵن پاوڵ. کۆندی وەك میانگیرو ناوبژیوانێك وابوو لەنێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا. خۆی لەنێو ئەو دیدە جیاوازانەدا دەبینییەوە کە تیمێکی دانپیانراو

لە سیاسەت لە واشنتۆن دەریاندەبڕی. هەریەکێك لەچینی، رامسفێلدو پۆڵ ولۆفوویتز جێگری، لەتیمی هەڵۆکان (کۆنە پارێزە نوێکان) دادەنرێن کە پشتگیری هێزی سەربازیو دەستتێوەردانی سەربازی دەکەن. چینیو رامسفێلد لەسەردەمی سەرۆك فۆردەوە پەیوەندییان هەیە، ئەوکاتە رامسفێلد وەزیری بەرگری بوو و چینیش کە لەژێر سایەی ئەودابوو، وەك سەرۆکی تیمی فەرمانبەرانی کۆشکی سپی کاریدەکرد. رامسفێلد بە "جەنگاوەرێکی بیرۆکراسی بێ وێنە لەناوەوە" ناودەبرێتو بە هەڵوەشاندنەوەی پلانەکانی ساڵت ۲ ناوبانگی دەرکرووە کە کیسنجەر لەمیانەی ساڵەکانی حوکمی سەرۆك فۆرددا ئامادەیکردبوو. کیسنجەر لە یاداشتەکانیدا بەمشێوەیە باس لە رامسفێلد دەکات: "دیاردەیەکی ناوازەیە لە واشنتۆن: ئەو سیاسەتمەدارە لێبڕاوو بیرۆکراسییە بە توانایەیە کە تموحو تواناو سەرمایەی فیکری لەخۆیدا کۆکردۆتەوە".

لە بەشەکەی تردا پاوڵ هەیە، کە پیاوێکی میانەڕەوەو ئامۆژگاری لەدژی دەستتێوەردانی سەربازی پێشکەشدەکات وەك کۆندی، بڕوای بەوە نییە کە دەوترێت رۆڵی وڵات کارکردنە وەك پۆلیسی جیهانی. لەسەردەمی بوشی باوکدا کاتێك چینی، وەزیری بەرگری بوو و هەمیشە لەگەڵ کۆلن پاوڵدا کە ئەوکاتە پۆستی سەرۆکی دەستەی ئەرکانی لەدەستدابوو، ناکۆك بوون. پاش ماوەیەکی کەم لە هەڵبژاردنی جۆرجی کوڕ، لۆرێنس کاپلان لە رۆژنامەی New Republics دەنووسێت:"ئەو مانۆڕەی پێش دەیەیەك لەمەوبەر وەستابوو، سەری هەڵدایەوە" سەرۆك کاتێك تیمی حکومەتەکەی هەڵدەبژێرێت، ئەم دیدە ناکۆکانەی پێشبینی دەکرد. سەرۆك بوش پێی وایە بیرۆکەی هۆشیارو بیروباوەڕی ناکۆکبەیەك دوو سیمان لە سیماکانی بیرکردنەوەی مرۆڤایەتیدا شیاوی پێزانینن، چونکە ئەو وێنە گشتگیرەی دواجار دێتە ئەنجام رێگە بەسەرۆك دەدات بڕیاری تایبەتی خۆی بدات. سەرۆکی تازەهەڵبژێردراو دەڵێت:"جیاوازی دەبێت، لەڕاستیدا هیوام وایە جیاوازی لەگۆشەنیگاکاندا رووبدات".

بیروڕاکانی کۆندی ئەوەندەی لەگەڵ پاوڵدا کۆکبوون، لەگەڵ چینیو رامسفێلدا کۆك نەبوون، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە یەکسەر بووبێتە هۆی

هاوپەیمانییەکی گەرموگوڕ لەنێوانیاندا. کاپڵان نووسیویەتی: "بەگوێرەی چەند راوێژکارێکی سەرۆك بوش، پاوڵ داوادەکات ئەرکەکانی رایس نەبێتە کۆسپ لەبەردەم سەرکردایەتیکردنیدا بۆ سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانو لەم رووەوە پاوڵ دڵنیاکراوەتەوە. ئەندامانی تیمی کاری بوش پێشبینییان دەکرد رایس ئەرکە رۆتینییە رۆژانەکانی سیاسەتی دەرەوە جێبەجێبکاتو دەست لەرێڕەوی بنچینەیی ئەم سیاسەتە هەڵبگرێت". جۆرج شۆڵتز کە وەزیرێکی دەرەوەی پێشووەو بەیەکێك لەو کۆنەپارێزانە دادەنرێت کە پاڵپشتی رێڕەوی پیشەیی کۆندی بوونو لە ئینیستیتیوتی هۆڤەریش کاری لەگەڵدا کردووە، پێیوایە رایسو پاوڵ لەکەسە خاوەن ویستە بەهێزەکانن‌و دەتوانن بەباشی پێکەوە کاربکەن. شۆڵتز دەڵێت: "ئەم دوانە خاوەنی شێوازێکی زۆر نەرمو ئاسانو دۆستانەن‌و رێزێکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە. پێموایە ئەوان دوو کەسی بەهێزنو ناتوانین لەو جۆرە کەسانەیان دابنێین کە دەستەمۆکردنیان ئاسانە"

بەتێپەڕبوونی تەنها ١٨ مانگ بەسەر وەرگرتنی پۆستەکەی، کۆندی توانی شتێك بکات کە بازدان بێت بەسەر جێهێشتنی کاروباری رێڕەوی سیاسەتی دەرەوەدا. کۆندی دەتوانێت کەشتییەکی هەڵپەسێردراو لێبخورێتو لەکاتێکدا ئیدارەکە قەیران دوای قەیران رووبەڕووی دەبێتەوە، دەتوانێت بیرۆکەی کەسانی تر بۆ خاوەنەکانیان بهێڵێتەوە. کۆندی ئەمە بە ئەرکی خۆی دەزانێتو کەمی شارەزاییەکەی بە بەراورد بە دیك چینی‌و رامسفێڵدو پاوڵ، بەهاوپەیمانیبەستنی لەگەڵ دەسەڵات واتە بەپەیوەندییە بەهێزەکەی لەگەڵ سەرۆکدا، قەرەبوو دەکاتەوە. سەرچاوەیەك لەگۆڤاری Busness Week دەڵێت: "کارەکەی تەنها بەسەربردنی زۆرترین ماوە لەگەڵ سەرۆکدا نەبوو، سەرۆك ئەوەندەی لەگەڵ ئەمدا ئاسودە بوو، لەگەڵ تیمە ناوازەکەی سیاسەتی دەرەوەدا ئاسوودە نەبوو".

پاش روداوی رێگرتنی فرۆکەیەکی جەنگی فیشکەداری چینی لە فرۆکەیەکی سیخوڕیی ئەمەریکی لەسەرەتاکانی نیسانی ٢٠٠١دا، کۆندی دەستدەکات بەکارکردن لەسەر چالاککردنی رۆڵی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەهەماهەنگیرکردن لەگەڵ سەرۆکدا. بەمەبەستی گەڕانەوەی تیمی فرۆکەکە بۆ وڵات، وەزارەتی

دەرەوە بەرپرسیاریتی دانووستانکردن لەگەڵ چینییەکان، دەگریتەدەست. کۆندی لەم ماوەیەدا چەند ئەرکێکی پەیوەندیدار بەسیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەوانە کۆبوونەوە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی چین جوشوا سینگ، دەخاتە سەرشانی. پاش تێپەڕبوونی چوار مانگ بەسەر ئەم رووداوەدا دەرکەوت کە کۆندی هۆکارێکی کاریگەرە لە سیاسەتی دەرەوەدا، توانیشی بەرنامەی دیدارێك لەگەڵ ڤلادمیر پۆتین سەرۆکی روسیادا رێکبخات.

پێش گەشتەکەی کۆندی، سەرۆك بوش سەردانێك بۆ ئەوروپا ئەنجامدەدات، کۆندی توانی رێ بۆ گفتوگۆکانی بوش لەگەڵ پۆتیندا سەبارەت بەپرسەکانی بەرگریی موشەکی، رێکخبات. ئەوکاتە بوش دامەزراندنی سیستمی بەرگری دژەموشەکی لەسەر شێوەی شەڕی ئەستێرەکان، لەڕیزی پێشەوەی ریزبەندی کارەکانی دانابوو. روسیا بەتوندی دژی ئەم بەرنامەیە بوو. بەهۆی شارەزای لەبواری چەك و تەقەمەنی بەتایبەت روسیاوە، بوش کۆندی بۆ جێبەجێکردنی ئەم گەشتە هەڵدەبژێرێت. کۆندی باڵاترین بەرپرسی تیمی ئیدارەکەی بوش بوو بۆ کاروباری دەرەوە کە سەردانی مۆسکۆ بکات و ئەم سەردانە بە بۆنەیەکی مێژوویی گرنگ بۆ یەکێك لە راوێژکارانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، دادەنرێت. ئایفۆ داڵدەر کە ئەندامی پەیمانگای پرۆکینگەرو دانەری چەندین کتێبە سەبارەت بەکاروباری سیاسەتی دەرەوە، دەڵێت: "سەردانەکەی کۆندی بۆ مۆسکۆ یەکەمین سەردانی لەو شێوەیە بوو". داڵدەر دەشڵێت پێشتر هیچ راوێژکارێکی ئاسایشی نەتەوەیی جگە لەکیسنجەر "ئەرکێکی دیپلۆماسی رۆتینی لەمۆسکۆ" جێبەجێنەکردووە.

کۆندی پێشتر دەیزانی کە بەرپرسانی مۆسکۆ بەهیچ شێوەیەك بە زۆربەی بیرۆکەکانی بەتایبەت بەو پلانەی کە پەیوەندی بەکشانەوە لە پرۆتۆکۆلی دژەرۆکێتی بالیستییەوە هەیەو لە ساڵی ١٩٧٢دا ئیمزاکراوەو ئەو رێککەوتننامەیەی بوش و رایس پێکەوە پێیان وایە میراتێکی هاوچەرخی پاشماوەکانی شەڕی ساردە، ئاسودە نین. پێش ئەوەی مۆسکۆ جێ بهێڵێت کۆندی لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی کورتدا رایگەیاند: "هەمیشە وتومانە پرۆتۆکۆلی دژەموشەکی

بالیستی کێشەیە، ئەمەش تەنها بەهۆی ئەو کۆتو بەندەوە نییە کە پرۆتۆکۆلەکە لەسەر تاقیکردنەوەو نرخاندنەکان داینــاون، بــەڵکو لەبەرئەوەیــە کــە ڕێککەوتننامەیەکی نەگونجاوی سەردەمێکی نەگونجاوە. ئەم پرۆتۆکۆلە ئاماژە بۆ چەند پەیوەندییەکی دووژمنکارانە کە پێشتر لەنێوان ئەم دوو وڵاتەدا نەبووە، دەکات، بەڵام ئێمە سەبارەت بەدارشتەی پرۆتۆکۆلەکە، وتوویژ دەکەین. پێموایە ئەم سەردانە بەشێکە لەو راوێژەی کە پێویستە بەبەردەوامی بمێنێتەوە"

دواتــر راگەیەنــدرا کــە ئامــانجی ســەرەکی گەشــتەکە روونکردنــەوەی ئــەو بابەتانــەی کــە بــوش‌و پــۆتین گفتوگۆیــان لەســەر دەکــەن‌و دانــانی ئەجێندایــەکی ســەختە بــۆ گفوتۆکانیــان. گفتوگۆکــانی کۆنــدی لەگــەڵ پــۆتین‌و وەزیــری بــەرگری سێرگی ئیڤانۆڤو بەرپرسانی تــر، دەبنــە یارمەتیــدەرێك بــۆ رێخۆشــکردن لەبــەردەم گفتوگۆکــانی ســنووردانان بــۆ پرچــەککردن کــە بڕیــاربوو ئەنجامبــدرێن‌و ئــەم گفتوگۆیانــەش کۆبوونــەوەی ســەرۆك لەگــەڵ پــۆتین، لەمیانــەی گرێدانی کۆنگرەی لوتکەی هەشت وڵاتە زلهێزەکە لە ئیتاڵیا کە لەهاویندا ئەنجامدرا، لەخۆدەگرێت. لــەو کۆبوونەوەیــەدا هــەردوو ســەرۆك لەســەر ئــەوە رێکدەکــەون لــەداهاتوودا سەبارەت بەکەمکردنەوەی چەکی خەزنکراو لە وڵاتەکانیان دیالۆگ بکەن.

رۆژنامەکانی روسیا دیدارەکانی کۆندی لە مۆسکۆ دەکەنە بابەتی سەرەکی‌و ستایشــی زمانــە روســییە بەهێزەکــەی دەکــەن، کۆنــدی بەپەرۆشــەوە بــاس لــە خۆشەویستی بۆ سانت پترۆسبۆرگ دەکات کە پێشتر پێی دەوتـرا لینینگراد، ئـەو شــارەی کــە پێشــتر وەك دەرچــوویەکی زانکــۆ، چــەند هەفتەیــەکی کــەمی تێــدا بەســەربردووە. گەشــتی هەواڵــەکانی کەناڵــە تەلەفزیۆنییــەکان بەدووورودرێــژیی کۆبوونــەوەکان رومالدەکــەن، رۆژنامــەکانیش هــەمان شــت ئەنجامــدەدەن. لــەکاتی گەڕانەوەی بۆ واشنتۆن، کۆندی سەرنج دەدات کە شێوزای پۆتین پــڕە لــە چالاکی‌و تــەواو لەوانــەی پێشــتر، جیــاوازە. لەمبارەیــەوە دەڵێــت: "چــەندین کۆبوونــەوەم لەگەڵ سەرکردەکانی روسدا ئەنجامداوە، ســەرنجمداوە ئــارەزووی زۆربلێیــی دەکــەن، پۆتین بەوە لەوان جیاوازە کە زیاتر ئارەزووی دیالۆگ دەکات. خولیایەکی زۆری بــۆ گاڵتەوگەپ‌و گێڕانەوەی چیرۆك‌و نوکتە، هەیە".

دیالۆگی پەیوەندیدار بەسیستمی بەرگری موشەکی لەنێوان روسیاو ئەمەریکا، بەشێکی سەرەکی ئەرکی کۆندی بوو. لەو کۆبوونەوەیەی لە کێلگەی سەرۆك لە تەکساس ئەنجامدرا، هەردوو سەرۆك لەسەر کەمکردنەوەی چەکی خەزنکراو لەهەردوو وڵاتدا رێکدەکەون، بەڵام سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی موشەکی بالیستی ناگەنە هیچ رێککەوتنێك. لەمیانەی ئەو لوتکەیەدا کە سێ رۆژ دەخایەنێت، خۆشحاڵی بە هەردوو سەرۆکەوە دەردەکەوێتو رێزی بێپایان بۆ یەکتر دەردەبڕن، بەڵام رێککەوتننامەکە وەك پرسێکی ئاڵۆز لەنێوانیاندا، دەمێنێتەوە.

هاوپەیمانێتییە چالاکەکەی نێوان هەردوو وڵات بەهێزتر بوون کە ئامانج لێی رووبەڕوبوونەوەی تیرۆر بوو لەپاش هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەردا، ئەم هاوپەیمانێتییە کاریگەرییەکی پۆزەتیڤی لەسەر گفتوگۆکانی تایبەت بە سنووردانان بۆ چەکی نێوان ئەم دوو وڵاتە، هەبوو. ئیدارەکەی بوش لەهەنگاونان بەرەو کشانەوە لە پرۆتۆکۆلی موشەکی بالیستی بەردەوامبوو بەڵام ئەم کشانەوەیە کاریگەریی نێگەتیڤی لەسەر ئەو پەیماننامە مێژووییەی تایبەت بە کەمکردنەوەی چەکەوە، نەبوو کە لە بەهاری ٢٠٠٢دا لەنێوان بوشو پۆتیندا ئیمزاکراوە. بوش سەردانی مۆسکۆو سان پترسبۆرگی کرد بۆ ئەوەی لە مانگی ئایاردا دیدارێکی لوتکە لەگەڵ پۆتیندا ئەنجام بدات، ئەنجامی گفتوگۆکان رێککەوتننامەیەکی لێکەوتەوە تا لەماوەی ١٠ ساڵدا دوو لەسەر سێی ئەو موشەکە ناوکییە دورمەودایانەی لەهەردوو وڵاتدا لەکاردابوون، بکشێننەوە. شایانی باسە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٢دا بەفەرمی لە پرۆتۆکۆلی موشەکە بالیستییەکان کشایەوە. پۆڵ وۆلفویتز کە ئەوکاتە جێگری وەزیری بەرگریبوو، لەمیانەی وتارێکدا کە لە رۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵدا بڵاویکردەوە، بایەخی ئەم هەنگاوە روونەدەکاتەوەو لە بەشێکی وتارەکەدا هاتووە:

**لەئەنجامی کاری ماندونەناسانەو سوربوونی هەردوولا، پەیوەندییەکانمان لەگەڵ روسیا، دواتریش پەیوەندییەکانی روسیا لەگەڵ هاوپەیمانەکانمان لەپەیمانی ناتۆ، چووە قۆناغێکی نوێو پرشنگدارەوە. پێموایە ئەو کۆنگرە**

لوتكەییانەی نێوان ویلایەتە یەكگرتووەكانو روسیا كە لەداهاتوودا دەبەسترێن، نابێت بەم پرسیارە بڕیاریان لەسەر بدرێت: لەپێناو هاوسەنگكردنی ترسی ناوكی، ئەم دوو وڵاتە پلان بۆ ئیمزاكردنی چ پەیماننامەیەك دادەنێن؟ لەبری ئەوە ئێمە زیاتر بایەخ بە هاوكاری نێوان هەردوو وڵات دەدەین لەپێناو رووبەڕووبوونەوەی ئەو كۆسپە ئەمنییانەی رووبەڕووی وڵاتەكانمان دەبنەوەو زیاتر جەخت لەسەر جەنگی دژە تیرۆرو ئەوەی لەتوانامانداییە بۆ دەوڵەمەندكردنی ژیانی هەردوو گەلەكەمان لەڕێگەی پەیوەندییەكی ئابووریو كولتووریو سیاسی توندترەوە، دەكەینەوە.

كۆندی توانی هاوسەنگییەك لەنێوان ئەركەكانی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا دروستبكات، بەهۆی ئەمەوە توانیبووی ببێتە داڕێژەری سیاسەتەكانی ئیدارەكەو بەڕێوەبەری ئەم ئەنجوومەنەش، ئەمەش سەرباری كاری ماندونەناسانەی لە هەماهەنگیكردنی ئەو زانیارییە بێشومارانەی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا هەڵدەقوڵانو پەیوەندییان بەشەڕی دژی تیرۆرەوە هەبوو، بۆ ئەو پشكە دەگەڕێتەوە كە لەدانانی بەرنامەی بەرگری موشەكیی بوشدا هەیبوو. كۆندی بەچەند ساتێكدا تێپەڕدەبێت كە كاریگەری هێرشە تیرۆریستییەكانی بیردەهێنێتەوە. رۆژێك پەیوەندییەكی تەلەفۆنی لە هاوڕێیەكی بیرمنگهامەوە پێدەگات. لە پەیوەندییەكەدا دیبۆرا كارسۆن دەڵێت: "ئێستا ئەوەی تۆ دەیڵێیت بەپورە كۆندی دەڵێم". دواتر كوڕەكەی دیبۆرا كە تەمەنی سێ ساڵان بوو، تەلەفۆنەكە دەگرێتەدەستو دەڵێت: "بن لادن پیاوێكی خراپە. تۆو سەرۆك بوش دەیخەنە زیندانەوە". كۆندی بە پێكەنینێكی زۆرەوە وتی: "جۆ، یەكەم شت كە بەیانی دەیكەم ئەوە دەبێت كە قسەكەی تۆی پێ دەگەیەنم كە بوش بن لادن دەخاتە زیندانەوە"

پرۆسەی گەڕان بۆ بن لادن دەستیپێكردو لەپێناو دۆزینەوەی هەڵەكانی بواری هەواڵگری، لیژنەیەك لەكۆنگرێس بۆ لێكۆڵینەوە لە واشنتۆن دروستدەكرێت. لەئایاری ٢٠٠٢، چەندین راپۆرت دەردەكەون كە هەموویان ئاماژە بەوە دەكەن كە ئیدارەكە پێش هێرشەكانی ١١ی سێپتەمبەر زانیاری سەبارەت بە

پلانی رفاندنەکەی ئەلقاعیدە هەبووە. لەپێناو روونکردنەوەی ئەو شتانەی کە حکومەت زانیاری دەربارەیان هەبوو، کۆندی دەستدەکات بە قسەکردن بۆ میدیاکانو لە ١٦/ ٢٠٠٢/٥ رایگەیاند: "لەکانونی یەکەمی ٢٠٠٠دا گروپی هەوالگری، بەدزییەوە چەندین راپۆرتی لەسەر زیادبوونی جموجۆڵی چالاکییە تیرۆریستییەکان، پێگەیشتووە. راپۆرتێکیان تایبەت بوو بەپلاندانان بۆ چەند هێرشێك لەدژی ئامانج یان بەرژەوەندی ئەمەریکی لەلایەن قاعیدەوە".. کۆندی وتیشی کە راپۆرتەکان ئەگەری روودانی پرۆسەی رفاندیشیان لەخۆگرتبوو. کۆندی بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "لەکۆتایی مانگی تەموزدا ئاژانسی فڕۆکەوانی فیدراڵی بەلاغێکی بلاوکردەوە کەتیایدا هاتووە:"ئامانجێکی دیاریکراو لەئارادا نییەو زانیاری متمانەپێکراومان لەسەر هیچ هێرشێك لەدژی بەرژەوەندییەکانی فڕۆکەوانی مەدەنی ئەمەریکی نییە، بەلام گروپە تیرۆریستییەکان بە پلاندانان بۆ کاری رفاندنو مەشقکردن لەسەری ناسراون، لەبەرئەوە داواتان لێدەکەین وریابن". کۆندی پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گروپی هەوالگری کۆك بوون لەسەرئەوەی ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەم هێرشانە لەدژی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە ولاتێکی بیانیدا ئەنجامبدرێن بۆ نموونە دژی باڵیۆزخانەیەكو راپۆرتەکان پێشبینی هیچ روداوێکیان لەناو خاکی ئەمەریکادا، نەدەکرد. ئەم خانمە بەردەوامدەبێتو دەڵێت:"دەمەوێت ئەوە دووپاتبکەمەوە کە هەموو ئاماژەکان بۆ ئەوە بوون ئەم جۆرە هێرشانە لەدەرەوە ئەنجامبدرێن". راشیگەیاند کە هیچ کەسێك پێشبینی ئەوەی نەدەکرد فڕۆکەی مەدەنی ئەمەریکی وەك بۆمبی خۆکوژی بەکاربهێنرێت. وتیشی: "پێموانییە هیچ کەسێك بیتوانیایە پێشبینی ئەوە بکات کە ئەم کەسانە فڕۆکەیەك دەکێشن بەسەنتەری بازرگانی جیهانیو یەکێکی تر دەکێشن بە باڵەخانەی پێنتاگۆندا"

ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی چەند مشتومڕێك سەبارەت بە چەندین قەیرانی وەك ئەگەری هەلگیرسانی شەڕ لەنێوان هندو پاکستانو هێرشی خۆکوژیو بارگرژییە هەلکشاوەکانی ناوچەی رۆژهەلاتو ئەگەری هێرشێکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ سەر عێراق لەنیوەی یەکەمی سالی ٢٠٠٢ دا،

ئەنجامــدەدات. هــەموو ئــەم مشــتومڕانە هاوکــات بــوون لەگــەڵ بــەردەوامیی لێکۆڵینەوە لەسەر شیکردنەوەی ئیدارەکەی بوش بۆ چالاکییە تیرۆریستییەکانو بەدواداچوونی رۆژانە بۆ رووداوەکانی شـەڕی دژەتـیرۆر. کۆنـدی هەرچـەندە خـۆی پســپۆڕی کاروبــاری ســۆڤیەت بــوو، هەســتدەکات لــەپێناو هەماهــەنگیکردنی راسپاردەکانی ئەنجوومەنەکە سەبارەت بەم پرسانەو چەندین پرسی جیهانی تـرو پێشکەشـکردنی بـیروڕا جۆراوجۆرەکـانی تـر سـەبارەت بـە سیاسـەتی دەرەوەی سەرۆك، ناچارە ئاسۆی زانیارییەکانی سەبارەت بە کاروباری ئەم ناوچانە فـراوانتر بکات.

پاش رووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر، پشووەکانی کۆتایی هەفتە کە سەرۆك لـە کامـپ دەیڤـد بەسـەری دەبـرد، دەبنـە ئەنجامـدانی گەشـتی کـار. شـایانی باسـە ئەوەنـدەی کۆنـدی کـاتی لـەکامپ دیڤـد بەسـەربردووە هـیچ راوێـژکارێکی تـری سەرۆك بەسەری نەبردووە. کۆندی بە میوانێکی هەمیشەیی باخەکەی بـوش لـە کراوفۆرد دادەنرێت کە هەندێك پێی دەڵێن کۆشکی سپیی خۆرئاوا. سـەردانەکانی کۆنـدی بـەوە ناسـراوبوون کـە سـەردانی کـارن، هـەروەك سـەردانی ئاسـایی کۆمەڵایەتیشی تێدابوو. جاری واش هەیـە سـەرنجی ئـەوە دەدرێـت کـە سروشـتە نافەرمییەکـەی ئـەو کێڵگەیـە دەبێتـە سروشـێك بـۆ بیرۆکـەی نـوێ، بـۆ نموونـە رۆژێکیــان کاتێــك کۆنــدی لەگــەڵ لاورا بــوشو کــارین هۆگــەز کــە ئــەمیش ژنەراوێـژکارێکی سـەرۆك بـوو، لەسـەر خـوان پێکـەوە دانیشـتبوونو شـەڕی ئەفغانســتانیان تاووتوێــدەکرد، شــتێکی لەوبابەتــە روودەدات. ئــەنجامی کۆبوونەوەی ئەو سێ کەسـە لـەدەوری ئـەو خوانـە، بیرۆکـەی هەڵدانـەخوارەوەی چـەپکێك کۆمـەکی خـۆراکی لـەپێناو سـوککردنی ئـەو کەمخۆراکییـەی لـە وڵاتـدا روویداوە، لێدەکەوێتەوە. ئەم بیرۆکەیەی ئەم سێ ژنە کە کتوپڕ بەبیریانـدا هـات دەبێتــە راســتی، ئــەوەبوو لــە ســەرەتاکانی ئۆکتۆبــەری ٢٠٠١دا قوتـوی زەردی بریسـکەدار لـە چـەندین فرۆکـەی بارهـەڵگری ئەمەریکییـەوە لـە ئاسمـانی ئـەو وڵاتەوە، دەخرێتە خوارەوە کە رۆنەکەرەی فستقو نیسكو ماددەی پرۆتینئـامێزو چەندین ماددەی تریان تێدابوو.

لە وتارێکدا لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٢دا پێشکەشیکرد، کۆندی پوختەی هەستەکانی سەبارەت بە کاریگەری هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر لەسەر یەکخستن، ڕووندەکاتەوە. لەو وتارەدا ئاشکرایکرد کە ئەو گەشبینییەی پێی ناسراوە، تا دەگاتە ئاستی تێڕوانینی بۆ داهاتووی وڵات، درێژدەبێتەوە. هەروەك لە وتارەکەیدا باس لە ڕەنگدانەوەی کاریگەری دایکبووباوکی لەسەر سەرجەم قۆناغەکانی ژیانی دەکات، ئەو دایکوباوکەی لەپێناو ئەوەی کچەکەیان، ببێتە هێزێکی پاڵنەرو پۆزەتیف لەم جیهانەدا، هەوڵێکی زۆریان بۆ داوە. لەو وتارەی کۆندیدا هاتووە:

**ئێمە پابەندین بە جیهانێك کە بازرگانییەکی گەورەترو دیموکراسییەکی مەزنترو ماف گشتگیرتری مرۆڤ بۆ سەرجەم گەلەکان لەهەر شوێنێکدا بێت، بەخۆیەوە دەبینێت. ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر ئەم پابەندبوونانەی زیاتر گرنگکرد نەك بەپێچەوانەوە.... بەڕاستی ئەمەریکا هەوڵدەدات بگاتە شتێکی بەرچاو. ئەمەریکا ئەو مافانە دەگرێتەدەست کە ناکرێت لایەنگریی تێدا بێت، نوێنەرایەتی ئەو راستییانە دەکات کە پێویستییان بەبەڵگەهێنانەوە نییە. ئەمەریکا هاوسۆزیو هیوای لەدەستدایە. ١١ی سێپتەمبەر بەشێکی پێناسەی ئەمەریکای بیرهێنایەوە کە هەندێك خەریکبوو بیریان دەچووەوە، یان پێیان وابوو ئیتر خاوەنی نین. ئێمە بەڵێن دەدەین لە هەڵگرتنی ئەو بەشە بۆ جیهانێکی فراوانتر بەردەوام بین"..**

هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر وڵاتی بردە چەرخێکی نوێوەو ئەمەریکای خستە ناو چەند شەڕێکی مشتومڕئامێزەوە، تیشکیشی خستەسەر سیاسەتەکانی ئیدارەکەی بوش سەبارەت بەشەڕی دژەتیرۆر لەماوەی دوای ١١ی سێپتەمبەردا. بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی جێبەجێکردنی کارەکانی لە ئیدارەکەو ڕوونکردنەوەی سیاسەتەکانی سەرۆك لەکاتی ڕوودانی ڕووداوی یەکبەدواییەکدا، کۆندی لەبەردەم لیژنەی مێژوویی لێکۆڵینەوەدا ئامادە دەبێت. ئەو مشتومڕەی سەبارەت بەدەرکەوتنی لە دانیشتنە ئاشکراکانی گوێگرتن، خۆی لە خۆیدا چیرۆکێك بوو، هەروەك بەڵگەی پەشێوترین قۆناغی ڕێڕەوی پیشەیی بوو.

# بەشی دەیەم

## جەنگ و پشکۆی ژێر خۆڵەمێش

دەتوانم پێداگری لەسەر ئەوە بکەم کە ئەگەر ئێمە تەنها بۆ ساتێکیش بیرمان بەلای بوونی ئەگەری هێرشێك لە دژی واشنتۆن یان نیویۆرك بکردایەتەوە، لەپێناو وەستاندنیدا ئاسمانو زەویمان دەجولاند. دەشزانم کە هیچ شتێك نەیدەتوانی ئەو هێرشە رابگرێت"

کۆندۆلیزا رایس لەکاتی شایەتیدانی لەبەردەم لیژنەی گەڕان بەدوای راستییەکان سەبارەت بە هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر لە ٢٠٠٤/٤/٨

بەهاتنی هاوینی ساڵی ٢٠٠٤، ئەو رۆڵەی لەسەر شانی کۆندۆلیزا رایس بوو وەك نزیکترین راوێژکاری بوش لە کۆشکی سپی، خستییە ناوجەرگەی شانۆی هەردوو سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە. ئەمەش بەوە زیاتر پشتڕاست دەکرێتەوە کە گۆڤاری فۆربیس لە ژمارەی مانگی ئابدا کۆندی خستە پلەی یەکەمی لیستی دەسترۆیشتووترین ژنەکان لە جیهاندا. گۆڤارەکە

رایگەیاند کە "پێشکەشکردنی راوێژ بە سەرکردەی بەهێزترین وڵات لە جیهانداو گرنگیدانی سەرکردەکان لە شوێنە جیاکانی جیهانەوە بەوەی کە دەیڵێت، رایس دەکەنە بەهێزترین ژن لە جیهاندا، هەرچەندە تەمەنی ٤٩ ساڵە"

کۆندی بەوە ناسراوە کە بەبەراورد لەگەڵ راوێژکارانی تری ئاسایشی نەتەوەییدا لە مێژووی ئەمەریکا، زۆرترین دەرکەوتنی هەبووە بەڵام شەڕی عێراق هۆکاری ئەو ناوبانگە زۆرەیەتی کە لە ساڵی ٢٠٠٢ەوە پەیدای کردووە. کۆندی وەك وتەبێژی سەرەکی کۆشکی سپیو گوێزەرەوەی بیرۆکەکانی بۆ میدیاکان مایەوە، هەروەك لە چەندین بەرنامەی گفتوگۆی تەلەفزیۆنیدا دەرکەوت کە هاوکات بوو لەگەڵ ئەوەی ئیدارەکەی بوش پلانی دادەنا بۆ بەردەوامبوون لە شەڕی دژەتیرۆر لەرێگەی بەکارهێنانی هێزی سەربازییەوە لە دژی عێراق.

لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٢، سەرۆك بوشو جێگری سەرۆك واتە چینیو چەند بەرپرسێکی تری ئیدارەکە دەستیانکرد بە رێکخستنی بەڵگەکانیان لە دژی عێراق. بۆ نموونە چینی لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا لە ١٧ی ئازار، نیگەرانی خۆی سەبارەت بە چەکە قۆرخکراوەکانو ئەگەری توانا ناوکییەکان لە عێراقدا دەردەبڕێتو دەڵێت:

**سەرۆك روونیکردووەتەوە کە ئێمە سەبارەت بەپەرەپێدانی چەکی کۆمەڵکوژ لەلایەن چەند وڵاتێکی وەك عێراقەوە، نیگەرانین.... ئێمە دەزانین ئەوان خاوەنی چەکی بایۆلۆجیو کیمیاوین... هۆکاری پێویستیشمان لەبەردەستدایە بۆ بڕوابوون بەوەی ئەم وڵاتانە هەوڵی بەدەستهێنانی چەکی ناوکی دەدەن. ئەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان سەرچاوەی نیگەرانییەو ئێمە لەو بڕوایەشداین ئەم کارە سەرچاوەی نیگەرانییە بۆ سەرجەم ناوچەکە. زۆر بەتوندی بڕوامان وایە کە زۆر گرنگە شێوازێك بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڕەشە کتوپڕە بدۆزینەوە.**

لەمانگی ئابی دواتردا کۆندی لە میانەی دیدارێکی بەناوبانگدا لەگەڵ بی بی سی، دیدی سەرۆك سەبارەت بە سەدام حسێن رادەگەیەنێت. لەو دیدارە بەناوبانگەیدا لەگەڵ کەناڵی چوارەمی بی بی سی رایگەیاند کە سەرۆکی عێراق

"پیاوێکی خراپەو ئەگەر وازی لێ بهێنرێتو چەکی کۆمەڵکوژو هۆکارەکانی بەکارهێنانی دەستبخات، دەبێتە هۆی پشێوی و وێرانکارییەکی تر لەناو گەلەکەیو دراوسێکانیو لە وڵاتەکەی ئێمەشدا". کۆندی پێداگری دەکاتەوە کە بەگوێرەی وانەکانی مێژوو "هۆکارێکی ئەخلاقی زۆر بەهێز" هەیە بۆ لادانی سەدام حسێن لە کورسی دەسەڵات. پێشی وابوو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بیانوی پێویستی لەبەردەستدایە بۆ ئاراستەکردنی لێدانێکی پێشوەخت. کۆندی پرسەکەی بەمشێوەیە روونکردەوە:

**مێژوو پڕە لەو حاڵەتە بێتواناییانەی بوونەتە هۆی کۆتاییەکی سەخت بۆ جیهان. دەبێت بڕوانینە پێشووی خۆمانو بپرسین چەند فەرمانڕەوای ستەمکار هەبوون کە بوونەتە هەڕەشەیەکی جیهانی زەبەلاحو هەزارەها کەسیان کوشتووەو ئەگەر نەوەستێنرانایە ئەوا دەیانتوانی ملیۆنەها کەس بکوژن.**

بۆ زیندوکردنەوەی بۆنەی ١١ی سێپتەمبەر، کۆندی لەچوارچێوەی زنجیرەیەکی رادیۆییدا، دیدارێك لەگەڵ بی بی سی بەناونیشانی لەگەڵمانیت یان دژمان، ئەنجامدەدات. کۆندی ئەو قسەیە دووبارە دەکاتەوە کە پەیامی ئیدارەی ئەمەریکا ئەوەیە کە سەدام حسێن "چەکی بایۆلۆجی پەرەپێداوەو سەبارەت بە گەنجینەی چەكو تەقەمەنییەکانیشی درۆی لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکاندا کردووە"

بێرنت سکۆکرۆفت کە رێبەری کۆندی بوو لە ئیدارەکەدا دژی ستراتیژی ئەو لێدانە دەستپێشخەرە بوو کە ئیدارەکە بەتەمابوو جێبەجێی بکات. پێشتر سکۆکرۆفت وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی کاری لە ئیدارەکەی جۆرج بوشدا کردبوو، هەر ئەویش بوو کە کۆندی وەك پسپۆڕێکی کاروباری یەکێتیی سۆڤیەتو ئەوروپای رۆژهەڵات هێنایە ناو ئەو ئیدارەیەوە. هەر ئەو رۆژەی کۆندی دیدارەکەی لەگەڵ بی بی سی ئەنجامدا، وتارێکی سکۆکرۆفت لە رۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵدا بڵاوکرایەوە. لەو وتارەیدا سکۆکرۆفت هۆشداری دەدات سەبارەت بەوەی جوڵەی سەربازی لە دژی عێراق دەبێتەهۆی ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەشەڕی دژەتیرۆر لابداتو لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتی کە بە

ئاڕاستەکردنی ئەم جۆرە لێدانە قایل نییە دابڕێت، هەروەك دەبێتە هۆی تێکدانی ئارامی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. سکۆکرۆفت نووسیبووی: "بەڵگەیەکی لاواز هەیە لەسەر ئەوەی سەدام حسێن پەیوەندی بە ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانەوە هەیە، تەنانەت بەڵگەیەکی لاوازتر هەیە لەسەر ئەوەی پەیوەندی بە هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەرەوە هەیە". بێرنت نووسیویشیەتی جەختکردنەوە لەسەر عێراق هەڕەشە لە"ئاسایشە پلە یەکە دیارەکە" دەکات کە بریتییە لە شەڕی دژی تیرۆرو ئەو پشتگیرییە نێودەوڵەتییە کەمدەکاتەوە کە پاش هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر دروستبووە. سکۆکرۆفت بەردەوامدەبێتو دەڵێت: "هەر هێرشێك بۆ سەر عێراق لەم کاتەدا دەبێتە هۆی تەگەرە خستنە بەردەم ئەو هەڵمەتە نێودەوڵەتییەی دژی تیرۆر کە پێوەی پابەند بووین دروست دەکاتو تەنانەت رەنگە بەتەواوەتی لەناوی ببات"

سکۆکرۆفت بڕوای وابوو هەڵگیرسانی شەڕ لە دژی عێراق نەك تەنها ئەمەریکا لە شەڕی دژەتیرۆر لادەدات، بەڵکو ئەگەر ئەمەریکا بەبێ هاوپەیمانە باوەکانی ئەو شەڕە بکات، ئەوا خەرجییەکی زۆریشی تێدەچێت:

**هەڵوێستێك لەئارادایە کە بەڵگەی کۆدەنگییەکی تەواوەتی جیهانییە لە دژی هێرشێك بۆ سەر عێراق لەمکاتەدا. ئەگەر ئەم رەوتەی ئەمەریکا بەردەوام بێت ئەوا ویلایەتە یەکگرتووەکان ناچاردەبێت بەتەنها ستراتیژەکەی لە دژی عێراق جێبەجێ بکات، ئەمەش کارەکە قورستردەکاتو تێچووی زیاتر دەکات. بەهۆی ئەمەشەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەر حسابی شەڕی دژەتیرۆر قورسترین باج دەدات. پشتگوێخستنی ئەم هەستە روونەی جیهان دەبێتە هۆی کەمبوونەوەیەکی مەترسیداری هاوکاری نێودەوڵەتی لە دژی تیرۆر. بەهەموو بڕوایەکەوە دەڵێم ئێمە بەبێ هاوکاریو پەرۆشی نێودەوڵەتی بەتایبەت لەڕووی هەواڵگرییەوە، ناتوانین ئەو شەڕە هەڵبگیرسێنین.**

سەرباری ئەوەش سکۆکرۆفت پێشبینی چارەنووسێکی دژواری بۆ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرد ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو هێرشە لە دژی عێراق ئەنجامبدات. سکۆکرۆفت بەردەوامدەبێتو دەڵێت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست،

ناکۆکی نێوان ئیسرائیل‌و فەلەستین بە پرسێکی ئەوپەڕی گرنگ دادەنێت‌و ئەم وڵاتانە هەر هێرشێك وەك لادان لە ناکۆکییەکە سەرەکییەکە سەیردەکەن. سکۆکرۆفت پێی وایە ئەم هێرشە "رق‌و تورەیی بەرومانداا دەتەقێنێتەوە"و دەڵێت بەهۆی ئەو هێرشەوە لەبری بەشداریکردن بە پێشکەشکردنی چارەسەر بۆ ئەو ناکۆکییەی دەیان دەیەی بەسەردا تێپەڕیوە، بەشێوەیەك سەیرمان دەکرێت کە ئێمە لەپێناو ئەوەی بە بەرژەوەندی تەسکی ئەمەریکی ناودەبرێت، بەرژەوەندییە بنچینەییەکانی جیهانی ئیسلام پشتگوێ دەخەین".

لێدوانەکانی کۆندی رەنگدانەوەی سیاسەتی ئەو هەڵۆیانە بوو کە ئیدارەکە لەبەرامبەر شەڕدا جێبەجێی دەکردو ئامادەیی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەتاکی تەنها، بۆ هەنگاونان بەئاڕاستەی ئەو شەڕە کە ئەمەش پێچەوانەی بیروڕاکانی سکۆکرۆفت بوو. لە بەهاری ۲۰۰۳، وڵاتانی فەرەنسا، ئەڵمانیا، روسیا رایانگەیاند لە هاوپەیمانێتییەکەدا بەشداری ناکەن، وەڵامدانەوەی کۆندی توندو بەرز بوو. کۆندی سیاسەتی ئەم وڵاتانەی بە "بێمانا"وەسفکردو رایگەیاند کە پێویستە ستراتیژی ویلایەتە یەکگرتووەکان "سزای فەرەنسا بداتو ئەڵمانیا پشتگوێ بخاتو لە روسیا ببورێت". ئەم هەڵوێستە توندە پێچەوانەی دیدی کۆندی بوو کە لە دیدە زیاتر میانڕەوەکەی سکۆکرۆفتەوە نزیکبوو و لە وتارێکدا کە لە گۆڤاری (کاروباری دەرەوە) نووسیبوی‌و لە ژمارەی کانونی دووەمی ۲۰۰۰دا بڵاوکرایەوە، گوزارشتی لێکردبوو. ئەو کەسانەی لە کۆندییەوە نزیکن دەڵێن هێرشەکانی ۱۱ی سێپتەمبەر دیدی جیهانی کۆندی بە ئاڕاستەی رێڕەوێکی زیاتر کۆنەپارێز، گۆڕیوە. ئەوەتا سەرنج دەدەین کە پاش هێرشەکان، دیدی کۆندی بۆ سیاسەتی دەرەوە، رەنگدانەوەی سەرۆك‌و کۆمەڵە کۆنەپارێزە نوێکەی ئیدارەکەی بوشە. کویت پلاکەر کە هاوڕێی کۆندییە دەڵێت: "ئەوان پێیان وایە هێرشەکانی ۱۱ی سێپتەمبەر وەك بانگەوازێك وابوو بۆ هۆشیارکردنەوەو بەڵگەی پێویستی جێبەجێکردنی چەند کارێکی دیاریکراو بوو کە ئەوانیش چەند کارێکی بەسوێ‌و توندن، بەڵام بەچاوپۆشین لە ئەنجامەکەی، پێویستە ئەنجامبدرێن. تیرۆریستان شەترەنجەکەیان پەرتوبڵاوکردەوەو ئێستا هیچ یەکێك گومانی لەوەدا

نییە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێت مەترسی وا لەئەستۆبگرێت کە هیچ یەکێك پێش ١١ی سێپتەمبەر بەخەیاڵیدا نەدەهات".

کۆندی دان بەوەدا دەنێت کە دیدە زیاتر کۆنەپارێزییەکەی بۆ سیاسەتی دەرەوە "ئەو ئاڕاستەیە نەبووە کە لێوەی هاتووە،"بەڵام بەهۆی بایەخپێدانی سەرۆك بە بەها گشتگیرەکانو ئازادییەوە، دروستبووەو دەڵێت: "سەبارەت بە ئاڕاستەکانی سیاسەتی دەرەوە سەرۆك قیبلەنماو بەندەرێکی بەهێزی هەیە. ئەمە پەیوەندی بەوەوە نییە کامە راستەو کامە هەڵەیە، بەڵکو پەیوەندی بەو کارانەوە هەیە کە چانسی سەرکەوتنیان هەیەو ئەوانەی ئەم چانسەیان نییە. هەستدەکەم لە بەهای ئەم دیدە تێدەگەم".

هەریەك لە کۆندیو جۆرجی کوڕ سیمایەکی بەهێز پێکەوەیان دەبەستێتەوە ئەویش بڕوای ئایینی قوڵە، سەربارى ئەو بەهایانەی بوش لەو، وتارانەی بەبۆنەی ساڵیادی یەکەمی هێرشە تیرۆریستییەکانەوە، باسیکردن. ئەم بەهایانە دەریانخست کە جێپەنجەیەکی ئاینی لەپشت سیاسەتی دەرەوەی بوشەوە هەیە. ئەو قیبلەنما ئەخلاقییەی کۆندی قسەی لەسەر دەکات لە کۆمێنتەکانی بوشدا سەبارەت بەو ئەرکەی ئەمەریکا کە خۆی لە بڵاوکردنەوەی بنەماکانی لەسەرتاسەری جیهاندا دەبینێتەوە، بەڕوونی دیاربوو. لە ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠٢دا بوش رایگەیاند: "ئەو دەستدرێژیەی کرایە سەر نەتەوەکەمان، دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ئەو بنەمایانەی دەمانکاتە نەتەوە.... باوەڕی نەتەوەیی قوڵمان هاندەرمانە بۆ بڕوابوونمان بەوەی کە هەموو ژیانێك خۆی لەخۆیدا بەنرخە لەبەرئەوەی دیاری ئەو فریادڕەسەیە کە دەیەوێت بەئازادیو یەکسانی بژین. هەر ئەمەشە کە زیاتر لەو دوژمنەمان جیادەکاتەوە کە لەگەڵیدا دەجەنگین". بوش راشیگەیاند کە دوژمن "بریتییە لە هەر تیرۆریستێك یان یاخییەك کە بەنیازە بەهۆی تاوانێکی بەکۆمەڵەوە، هەڕەشە لە شارستانییەت بکات"

بوش لە باسکردنی بەڵێنە پیرۆزەکەدا بەردەوام دەبێتو دەڵێت: "پرسەکەمان تەنانەت لە قەبارەی وڵاتەکەمان گەورەترە. پرسەکەمان پەیوەندی

بە شکۆمەندیی مرۆڤایەتیو ئەو ئازادییەوە هەیە کە ویژدان تێیدا حوکم دەکات. ئەم چەمکەی ئەمەریکا پەیرەوی دەکات هیوای هەموو مرۆڤێکە.... ئەم هیوایەش لە ڕوونکردنەوەی ڕێگاکەماندا بەردەوامدەبێتو ئەم ڕووناکییەش لە تاریکیدا تیشکدەداتەوەو تاریکی ناتوانێت بەسەر ئەم ڕووناکییەدا زاڵبێت"

پاش چەند ڕۆژێك سەرۆك لە وتاری رادیۆییدا کە ئاڕاستەی نەتەوەی ئەمەریکای دەکات، بیانووەکەی دووبارەکردەوەو وتی سەدام حسێن هەڕەشەیە بۆ سەراپای جیهان، ئەرکی سەرشانی ویلایەتە یەکگرتووەکانو وڵاتانی ترە ڕووبەڕووی ببنەوە. لەم وتارەدا هاتووە:

**پێویستە کۆنگرێس زۆر بەباشی ئەوە ڕوونبکاتەوە کە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییەی لە هەوڵە ماندونەناسەکانی عێراقدایە بۆ پەرەپێدانو بوونە خاوەنی چەکی کۆمەڵکوژ، سەپاندنی دیناکتۆ بەهیچ شێوەیەك قبوڵناکرێت، لێرەدا کێشەکە ڕوونە، پێویستە لەنێوان جیهانێك کە ترس باڵی بەسەردا بکێشێتو جیهانێکی ئاوازە لە پێشکەوتن، یەکێکیان هەڵبژێرین. پێویستە لەسەرمان خۆمان بۆ بەرگریکردن لە ئاسایشو پێویستییەکانی شکۆمەندیی مرۆڤایەتی، ئامادەبکەین. ویلایەتە یەکگرتووەکان پاڵپشت بە کەلتورو بڕاردەکانی، ئەم هەڵوێستە دەگرێتەبەرو پێویستە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش هەنگاوی هاوشێوەی ئێمە بنێت.**

پاش چەند هەفتەیەکی کەم لە وتارەکەی سەرۆك، کۆندی لە هوتێل والدرۆف ئەستۆریا لە نیویۆرك وتارێك پێشکەشدەکات. وتارەکەی پوختەی ئەو ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەییە بوو کە بوش پەیرەوی دەکات. پێشتر کۆندی دانی بەوەدا نابوو کە بەهاکان ڕۆڵی گرنگیان لە بڕیاردانی سیاسەتی دەرەوەدا هەیە. ئەم دانپێدانانە لە وتارێکیدا هات کە لە گۆڤاری (کاروباری دەرەوە) لە ساڵی ٢٠٠٠ دا بڵاوکراوەتەوەو لەم وتارەدا کۆندی جەخت لەسەر پێویستی پێکەوەگرێدانی گرنگیپێدانە نموونەییەکان لەگەڵ پرسەکانی دەسەڵاتو هێزدا کردووەتەوە. کۆندی دەڵێت: "لە جیهانی واقیعدا هاوسەرگیرییەك لەنێوان دەسەڵاتو بەهاکاندا هەیە. زلهێزەکان گرنگییەکی زۆریان هەیەو لەتوانایاندایە کار بکەنە

سەر ملیۆنـەها کـەس و ڕێـڕەوی مێـژوو بگـۆڕن... بـەهاکانی زلهێزەکـان گرنگییـەکی هاوشێوەیان هەیە". کۆندی پەنادەباتـە بـەر جەختکردنـەوە لەسـەر تێڕوانینێکی زیـاتر نموونـەیی لـە سیاسـەتی دەرەوەدا بەوپێیـەی ئامرازێکـە بـۆ دیـاریکردنی بەهاکانی نەتەوە: "دووجـار سیاسـەتی دەرەوە پرسـی ئاسـایش و بـەرگریکردن لـە گەل و کۆمەڵگەو ئەو بەهایانەمان دەکاتە ئامـانج کە ئـازادی و لێبـووردن و فرەیـی لـەخۆدەگرێت". کتومـت هـەروەك سـەرۆك، کۆنـدیش سیاسـەتی دەرەوە بـەپێی نـاکۆکی لەسـەر هـەژموون دیاریـدەکات، ئـەو ناکۆکییـەی جیهـانی دابەشـکردووەو دەڵێت: "لـەکاتی ڕوداوەکـانی ١١ی سـێپتەمبەرەوە زلهێزەکـان لـە جیهانـدا خۆیـان لەهـەمان لایـەنی ئـەو دابەشبوونە گەورەیـەدا دەبینـن کە هێـزە پشـێوکارەکان و هێزە نیزامییەکان لە جیهاندا جیادەکاتەوە".

لـە ئۆکتۆبـەری ٢٠٠٢دا هـەردوو ئەنجوومـەنی نوێنـەران و پـیران ڕێوشـوێنێك پەسەنددەکات کە بەپێی ئەو ڕێوشوێنە ڕێگە بەسەرۆك دەدرێت هێـزی سـەربازی لـە دژی عێـراق بـەکاربهێنێت. دوای مانگێـك ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نەتـەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ژمارە ١٤٤١ پەسەنددەکات. ئەم بڕیـارە داوادەکـات پرۆسـەی نـوێی پشـکنین لـە عێراقـدا ئەنجامبـدرێت. لـەکانونی دووەمـی ٢٠٠٣دا کۆنـدی وتـارێکی لـە ڕۆژنامـەی نیویـۆرك تـایمز بەناونیشـانی "بۆچـی دەزانـین عێـراق درۆدەکات" بڵاودەکاتەوە. لەم وتارەدا پوختەی ئەو زانیارییانەی خستبووەڕوو کە سەدام حسێن بە پرۆسەی نوێی پشکنینەوە پابەند نییە. کۆنـدی دەڵێت عێـراق ئەو ئازادییەی نەداوە بەچاودێرەکان کە بڕیـاری ١٤٤١ پێـی داون. دەشـڵێت: "ئـەو بەڵێنـە نوێیانـەی عێـراق داویـەتی کـە گوایـە هـەوڵی زیـاتر دەدات، جگـە لـە کاتکوشتن هیچی تر نییـە". کۆنـدی گەیشـتبووە ئـەو ئەنجامـەی کە عێـراق وەك یاری منداڵان مامەڵە لەگەڵ پرۆسەی پشـکنیندا دەکـات، هۆشـداری ئەوەشـی داوە کە ئەو وڵاتە "پێویستە بزانێت کات بەرەو نەمان دەچێت"

کۆندی لە وتارێکیشیدا کە لە تایمزدا بڵاویکردووەتەوە، قسە لەسەر پرسێکی تر دەکات کە دەبێتە قەیرانێکی مشتومڕئامێز لە ئیدارەکەدا. کۆمێنت لەسەر ئەو بەیاننامەیـە دەدات کـە پێکهـاتووە لـە ١٢ هـەزار لاپـەڕەو پێشکەشـی نەتـەوە

یەکگرتووەکانی کردووەو تێیدا باس لەوە دەکات ئەو وڵاتە ملکەچی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانی پەیوەندیدار بە پرۆگرامەکانی چەك بووە. کۆندی رایگەیاند ئەم بەڵگەنامەیە "لە بیانوهێنانەوە یان روونکردنەوەی هەوڵەکانی عێراق بۆ بەدەستهێنانی یۆرانیۆم لەدەرەوە" شکستیهێناوە. پێشتر ئاژانسی هەواڵگریی ناوەندی وەزارەتی دەرەوەش لێکۆڵینەوەیان لەسەر پرسی کڕینی یۆرانیۆم لە نیجەرەوە کردبوو. سی ئای ئەی و وەزارەتیش گەیشتبوونە ئەوەی کە ناتوانرێت ئەم پرسە بسەلمێنرێت. روونبووەوە کە بەڵگەی ئەم پرسە ئەوەندە لاوازە بەشێوەیەك کە دەزگای هەواڵگریی ناوەندی داوای لە بەریتانیا کرد دەستبەرداری ئاماژەدان بۆ ئەم پرسە ببێت. لە پایزی ٢٠٠٢دا سی ئای ئەی ئەم داوایەشی لەیاداشتێکدا بڵاوکردەوە. سەرباری دوو راپۆرتی ئاژانسی هەواڵگریو وەزارەتی دەرەوە، سەرۆك بوش لە وتارێکدا بۆ نەتەوەی ئەمەریکا لە کانونی دووەمی ٢٠٠٣دا رایگەیاند:"حکومەتی بەریتانیا زانیاری ئەوەی بەدەست گەیشتووە کە سەدام حسێن بەمدواییانە هەوڵیداوە بڕێکی زۆر یۆرانیۆم لە ئەفریقا بکڕێت". رۆژی دواتر لە پێنتاگۆن وەزیری بەرگری دۆناڵد رامسفێلد ئەم هەڵوێستەی لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیدا دووبارەکردەوە. شایانی باسە کۆڵن پاوڵ وەزیری دەرەوە پرسی گێڕانەوەی یۆرانیۆمی لەو وتارەدا سڕییەوە کە لە مانگی شوباتی ٢٠٠٣دا لە نەتەوە یەکگرتووەکان پێشکەشی کرد. دواتر ئەو وەزیرە روونی کردەوە کە پێی وا نەبووە لەو بارەیەوە بەڵگەی پێویست هەبێت کە شیاوی ئەوە بێت لەوێ رابگەیەنرێت. دواتر دەرکەوت کە راپۆرتە بەریتانییەکە ساختە بووە، هەربۆیە کۆندی ناچاربوو لەدیدارێکدا لەگەڵ بەرنامەی هەواڵەکانی ئەم هەفتەی ئەی بی سی لە ٢٠٠٣/٦//٨ دان بەوەدا بنێت و بڵێت: "دیارە دواتر زانیمان ئەو راپۆرتە جێ متمانە نییە"

ئیدارەکەی بوش هاورێ لەگەڵ دوو هاوپەیمانی سەرەکی کە بەریتانیاو ئیسپانیا بوون، لەرێگەی پێشکەشکردنی پرۆژە بڕیارێکەوە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، هەوڵیاندا رەزامەندی ئەو رێکخراوە نێودەوڵەتییە لەسەر مەدای ترسناکیی رەوشەکە، وەربگرێت. ئیدارەکەی بوش لەو پرۆژەبڕیارەدا دەڵێت

بەڕاستی: "عێراق لە بەهەلوەرگرتنی ئەو دواچانسەی بڕیاری ١٤٤١ پێی دابوو، شکستی هێناوە". فەرەنساو ئەڵمانیاو روسیا بە پێشنیازێکی تایبەت وەڵامیان دایەوە کە کاتی پشکنین بەدوای چەکدا درێژبکەنەوە. لە پرۆژەی ئەم بڕیارەدا هاتووە: "پێویستە بژاردەی سەربازی کۆتا پەناگە بێت". پرۆژەبڕیارەکە مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد کە رەوش یان ئەو مەرجانەی کە بەکارهێنانی هێز لە دژی عێراق بەپێویست دەزانن، "لەئارادا نییە".

هەر ئەو رۆژەی ئەو دوو پرۆژەبڕیارە پێشکەشکران، کۆندی دووبارە داوای لەسەرۆك کردەوە جوڵەیەکی بەپەلە لە دژی سەدام حسێن ئەنجامبدات. ئەمەش لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا هات کە لە کۆشکی سپی ئەنجامیداو تێیدا پێداگری لەسەر هەڕەشەکانی عێراق کردەوەو ئەو بەرنامەیەشی بیر رۆژنامەنووسان هێنایەوە کە بوش ئامادەی کردبوو. کۆندی وتی: "ئێمە لە ژیان لەژێر مەترسی هەڕەشەی بەرنامەی چەکی کۆمەڵکوژدا بەردەوامین کە بەدەستی کەسێکەوەیە پەیوەندی بە تیرۆرەوە هەیە. کاتی ئەوە هاتووە ئەم کێشەیە چارەسەر بکەین. پێویستە لەم کاتانەدا شتەکان روون بن، کاتێك سەرۆك قسە لەسەر چەند هەفتەیەك دەکات نەك چەند مانگێك، ئەوە مانای ئەوەیە بەڕاستی مەبەستی چەند هەفتەیەکە نەك چەند مانگێك."کۆندی ئەوەشی بیر میدیاکان هێنایەوە کە سەرۆك ئامادەیە بەتەنها بجوڵێت: "سەرۆك روونیکردووەتەوە کە پێویستە ئەنجوومەنی ئاسایش بجوڵێت، ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش نەیتوانی ئەوە بکات لەو کاتەدا پێویستە لەسەرمان لەگەڵ ئەو هاوپەیمانانەمان کە ئامادەن لەگەڵماندا بەشداربن، بجوڵێین".

ئەو پێشنیازەی ویلایەتە یەکگرتووەکانو بەریتانیاو ئیسپانیا پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکانیان کرد، تەنها یەك وڵاتی ئەنجوومەنی ئاسایش پشتگیری دەکرد ئەویش بولگاریا بوو، لەبەرئەوە خاوەنەکانی پێشنیازەکە نەیانتوانی بیخەنە دەنگدانەوە. لە ٢٠٠٣/٣/٢٠ ئیدارەی ئەمەریکا بەتەنها کەوتە جوڵەو هێرشی بۆ سەر عێراق دەستپێکردو پرۆسەکەشی ناونا پرۆسەی ئازادی عێراق. هێزەکانی ئەمەریکا توانییان کۆنترۆڵی بەغدا بکەنو لە ٩ی نیساندا ملیۆنەها

بینـەری تەلـەفزیۆن لـە سەرتاسـەری جیهانـدا روخـانی سـیمبولی پەیکەرەکـەی سەدام بەچاوی خۆیان دەبینن.

لە مانگی داهاتوودا سەرۆك لەسـەر فرۆکەهـەڵگری ئـەبراهام لینکۆڵن کە لە کـەنارەکانی سـان دیێۆگـۆ لەنگـەری گرتبـوو، کۆتاییهـاتنی کـارە جەنگییـە بنچینەییەکانی لـە عێراقـدا راگەیانـد. سـەرۆك بـوش راشـیگەیاند کـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانو هاوپەیمانـەکانی سـەرکەوتنیان بەدەسـتهێناوە. کۆنـدیو سـەرۆك ئەرکان ئەندی کاردو وتەبێژی کۆشکی سپی ئاری فلیچەر چاوەڕێی سەرۆك بوون، ئەمان پێشتر لەرێگەی گەشتی ئاسمانییەوە بە فڕۆکەی گواسـتنەوەی C-2 گـرای هاوەند گەیشتبوون، ئەم فڕۆکەیە ئەوەندەی فڕۆکەی فیشـەکداری ڤـایکنگ S-3 پێشکەوتوونییە کە سەرۆکی گەیاندبووە ئەو شوێنە. ئەوانەی بە فڕۆکـەی گـرای گەیشتبوون لە ژوورێکی تاریکی فڕۆکەکە بـە ئاراستەی پێچەوانە دانیشـتبوونو ئەو لەرینەوە توندە چاوەڕواننەکراوانەی فڕۆکـە کـە رەوتـی بـا، راسـتەوخۆ پـێش دابـەزین دروسـتی دەکـردن، مانـدووی کردبـوون. کۆنـدی کـە چـاویلکەی پـارێزەری لەچاودابوو و ماددەی پێویستیشی کردبووە گوێ، پاش دابەزینی لە فڕۆکەکە هیچ بێتاقەتییـەکی پێـوە دیـار نـەبوو. کۆنـدی دەڵێـت ئەمـە دووەمـین جـارە سـواری فڕۆکـەی گـرای هاوەنـد دەبێـتو "کەشـوهەوای ئـەمجارەیان باشـتربووە". وێنـەی سـەرۆك بـوش کـە لەسـەر فڕۆکەهەڵگرەکـە بـوو و لەپشتیشـییەوە لافیتەیـەکی زەبەلاح هەبوو کە لەسەری نووسرابوو "ئەرکەکە جێبەجێکرا"، بۆ مـاوەی چـەند هەفتـەو مـانگی داهـاتوو دەبێتـە جێرەخنـەی رەخنـەگران لـە سـەرۆك، ئەمـەش هاوکات بوو لەگەڵ بەردەوامبوونی بەرزبوونەوەی ئاستی چرپی شەڕ لە عێراقدا.

لە ٢٠٠٣دا بوش لە دەرکەوتنێکی تـردا جـەختیکردەوە کـە کۆنـدی نزیکتـرین راوێـژکاری متمانـەپێکراوی سـەرۆکە. شـایانی باسـە کۆنـدی یـەکێك بـوو لـەو بەرپرسـە زۆر کەمانـەی کـە ئاگـاداری پلانـی سـەرۆك بـوش بـوو بـۆ گەشـتەکەی ئۆکتۆبەری بۆ بەغدا لە جـەژنی سوپاسـگوزاریدا کـە بەوپـەڕی نهێنی ئەنجامـدراو ئامانج لێی بەرزکردنەوەی وورەی سەربازەکان بوو. لە بەرپرسەکاندا تـەنها کۆنـدی بـۆ یـاوەری سـەرۆك لـەم گەشـتەدا هەڵبـژێردرا. گـرنگترین پلـەو ڕیزبەنـدی ئـەم

گەشتە لە نهێنییەکەیدا بوو لەپێناو روبەڕوبوونەوەی ئەو ئاستەنگانەی کە دێنە بەردەم گەشتی سەرۆك بۆ ناوچەی شەڕەکە، هەروەها گرنگی بەهەموو وردەکارییەکی تری ئەم گەشتە درا. خانمی یەکەم لاورا بوش زانیاری ئەگەری ئەم گەشتەی سەرۆکی لەلا بوو بەڵام تەنها چەند سەعاتێکی کەم پێش هەڵسانی فڕۆکەی ژمارە یەك (فڕۆکەی سەرۆکایەتی)، زانی کە گەشتەکە ئەنجامدەدات. کچەکانی سەرۆکیش هەمان رۆژ بە گەشتەکەیان زانی، بەڵام تا فڕۆکەکە لە بەغدا نەنیشتەوە، دایكوباوکی بوش لەسەردانەکە ئاگادار نەکرانەوە، بەڵام تیمی کۆشکی سپی پێیان وابوو سەرۆك جەژنی سوپاسگوزاری لە کێڵگەکەی خۆی لە کراوفۆرد بەسەردەبات.

سەعات هەشتی شەوی چوارشەممە، سەرۆكو کۆندی بە ئۆتۆمبێلێکی ئاسایی خۆیان لە کێڵگەی کرافۆرد دەدزنەوە. هەردووکیان جلوبەرگی وەرزشی لەبەردەکەنو دوو کڵاوی یاریزانانی بەیسبۆڵ دەکەنە سەریان. دواتر بوش بە پەیامنێرانی راگەیاند کە: "وەك دوو کەسی ئاسایی دەرکەوتین" گەشتکردنەکەیان لەسەر فڕۆکەی هێزی ئاسمانیی ژمارە یەك تایبەتمەندییەکەی ئەوە بوو هێمنو ئارام بوو، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جگە لە تیمە ئاسمانییەکە، تەنها ژمارەیەکی زۆر کەم لە رۆژنامەنووسان یاوەرییان دەکرد. فڕۆکەکە دەستدەکات بەفڕینو هەموو ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بێدەنگ دەکرێنو هێمای ئاگادارکردنەوە بەشێوەیەك گۆڕدرا کە لەلای چاودێرانی بواری ئاسمانی، بشاردرێتەوە، هەموو مۆبایلێكو ئامێرێکی تری ئەلیکترۆنیش کە لەکاتی گەشتدا هەن، لەکارخران. پێنج رۆژ لەوەوبەر لە فڕۆکەخانەی نێودەولەتی بەغدا هاوەنێك ئاراستەی فڕۆکەیەکی فیشکەداری بارهەڵگر کرابوو، لەبەرئەوە لەکاتی نزیکبوونەوەی فڕۆکە سەرۆکایەتییەکە لە فڕۆکەخانەکە، رووناکییەکانی کوژێنرانەوەو فڕۆکەکە بە تاریکیو نهێنی نیشتەوە.

سەرۆك دەبێتە سوپرایز بۆ ئەو ٦٠٠ سەربازەی لەژێر چادرێکی گەورەدا کە لە حەوشەی فڕۆکەخانەکەدا هەڵدرابوو، بەبۆنەی نیوەڕۆخوانی جەژنی سوپاسگوزارییەوە سەرقاڵی ئاهەنگگێڕان، بوون. سەرۆك بە هاواری

سەرسورهێنەرو چەپڵەیەكى زۆر چڕوپڕەوە پێشوازیكرا. سەردانەكەى سەرۆك بوش‌و كۆندى بۆلاى سەربازەكان دوو سەعات‌و نیوى خایاند، دواى ئەوە بە یاوەرى رۆژنامەنووسەكان بە فڕۆكەى هێزى ئاسمانى ژمارە یەك، گەڕانەوە وڵات.

رەخنەگران سەرۆكیان بەوە تۆمەتباركرد كە هۆكارى ئەم گەشتە مەترسیدارەى بوش بۆ بەغدا، سیاسییە بەڵام كۆندى بەرگرى لە پاڵنەرەكانى سەرۆك بۆ ئەم گەشتە كردو وتى: "گوێ نادەم بەوەى دەیڵێن، بەڵام بە چاوپۆشین لەوەى گەلى ئەمەریكا سەربە چ پارتێكە، هەموو كەسێك دەزانێت كە سەرۆكى ویلایەتە یەكگرتووەكان بەوپێیەى فەرماندەى باڵاى هێزە چەكدارەكانە، رۆشتنى بۆ بینینى سەربازەكانى هەنگاوێكە لەوپەڕى گرنگیدایە"

ئەم بڕیارەى سەرۆك بۆ یاوەریكردنى كۆندى لەگەڵ خۆیدا لەم گەشتە مەترسیدارو ئەوپەڕى نهێنییە، بەڵگەى پەیوەندى توندوتۆڵى كارە لەنێوانیاندا. پێشتریش باوكى بوش متمانەیەكى زۆر قوڵى دابوو بەسكۆكرۆفت كە راوێژكارى ئاسایشى نەتەوەیى بوو، بەڵام وادیارە جۆرجى كوڕ متمانەیەكى زیاترى داوە بە راوێژكارى ئاسایشى نەتەوەیى. شایانى باسە كۆندى كاتێكى زۆرى لە كۆشكى سپى‌و كامپ دەیڤدو كێڵگەى كراوفۆرد، لەگەڵ بوشدا بەسەردەبرد. جارێك لەكاتى ئاهەنگێكى ئێوارەخوانددا كە لە بەهارى ٢٠٠٤ دا رێكخرابوو، كۆندى دەكەوێتە هەڵەیەكى زمانەوانى سەیرەوەو دەڵێت: "هەروەك بە مێر.....و هەروەك بەسەرۆك بوشم وت"[1].

كەسوكارى قوربانیانى هێرشە تیرۆریستییەكان كەوتنە فشار دروستكردن بۆ زانینى ئەو زانیارییانەى ئیدارەى ئەمەریكا پێش ١١ى سێپتەمبەر، سەبارەت بە ئەگەرى هێرشى تیرۆریستى، دەیزانى‌و سووربوون لەسەرئەوەى كە پێویستە لەوبارەیەوە لێكۆڵینەوەى فەرمى ئەنجامبدرێت. لیژنەى لێكۆڵینەوەى تایبەت بە ١١ى سێپتەمبەر پێكهاتبوو لە شەش ئەندام‌و ئەركى ئاگاداركردنەوەى نەتەوەى ئەمەریكای لە پشكنینێكى وردى ئەو لایەنە لاوازانەى كە بوونە هۆى رووداني

---

[1] As I was telling my hus.... As I was telling president Bush

ئەم هێرشانە، خرایە ئەستۆ. ئەم لیژنە سەربەخۆیە لە شەش ئەندامی حیزبی دیموکرات و کۆماری پێکهاتبوو هۆکاری دروستکردنی ئەم شێوەیەیان بۆ ئەوە گێڕایەوە کە "مەبەست لێی ئەوەیە ئەو لیژنە توندوتۆڵ بێت لە دیاریکردنی شکست و کەمتەرخەمییەکانی حکومەتدا".

پاش دەستپێکردنی دانیشتنەکانی گوێگرتن، کۆندی لە چەند دانیشتنێکی داخراودا، گەواهینامەی خۆی لەبەردەم لیژنەکە پێشکەشدەکات. لەبەهاری ٢٠٠٤دا رای گشتی داوادەکات کۆندی بەئاشکرا گەواهینامەکەی پێشکەشبکات، کە ئەمەش جارێکی تر دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك رووداو لەسەر رۆڵی ئەو وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی. لیژنەکە بەکۆی دەنگ داوایکرد کۆندی گەواهینامەکەی بەشێوەی ئاشکرا پێشکەش بکات بەڵام کۆندی ئەوەی رەتکردەوە، گوایە ئەو دەسەڵاتە دەستورییەی دراوە بەدەسەڵاتی جێبەجێکار، بەپێی یاسا رێگەی پێنادات. کۆندی لە بەرنامەی ٦٠ خولەکی کەناڵی سی بی ئێسدا رایگەیاند: "لە تێڕوانینی منەوە پێم وانییە شتێك لەوە باشتر بێت کە بتوانم گەواهینامەکەم پێشکەش بکەم. بەڕاستی من خۆم ئارەزوومەندم ئەوە بکەم". وتیشی: "بەڵام بنەمایەکی گرنگمان هەیە، بنامەیەکی کۆنەو دەڵێت راوێژکارانی ئاسایشی نەتەوەیی تا لە پۆستەکانیاندا بن، ناتوانن لەبەردەم کۆنگرێسدا گەواهینامە پێشکەشبکەن".

ریتچارد ئای کلارك کە بەرپرسێکی پێشووی رووبەڕووبوونەوەی تیرۆر بوو لەسەردەمی بوش و کلینتۆندا، پرسی گەواهینامەی ئاشکرای کۆندی دەوروژێنێت. دواتریش کلارك لیستێك لە جموجۆڵی ئیدارەکەی بوش و ئەو کارانەی کە لە دژی قاعیدە نەیکردوون، ئاشکرادەکات کە ئەمانەش بوونەهۆی روودانی هێرشەکان. لە بەیاننامەیەکیدا بەناوی لە **رووبەڕووبوونەوەی سەرجەم دوژمنەکاندا: گرۆکی شەڕی ئەمەریکا لە دژی تیرۆر**، کلارك ئیدارەکەی بەوە تۆمەتبار کرد کە چەندین زانیاری هەواڵگریی گرنگی سەبارەت بە هێرشێکی تیرۆریستی پشتگوێ خستووە، ئەمەش دواجار بووە هۆیەکی لێدانی عێراق بە بیانووی قاعیدەوە. کلارك نووسیویەتی:

جۆرجى كور لەماوەى پێش ١١ى سێپتەمبەر لەجموجۆڵدا شكستى هێنا، سەربارى ئاگاداركردنەوە يەكبەدواى يەكەكان، لەبەرگرتن لە هەڕەشەى قاعيدە شكستيهێناو دواتريش بووەهۆى ئەو سوپرايزە سياسييانەى روويانداا، دواتر پاش هێرشەكان چەند هەنگاوێكى پێويستى نا بەڵام بەس نەبوون.... بەدواى ئەويشدا ئيدارەكە شەڕێكى گرانبەهاو ناپێويستى لەعێراقدا هەڵگيرساندو ئەم شەڕەش بووە هۆى بەهێزكردنى بزووتنەوە راديكاڵييە تيرۆريستو توندڕەوە ئيسلامييەكان لەسەرتاسەرى جيهاندا.

كلارك گەواهينامەكەى لەبەردەم ليژنەى ١١ى سێپتەمبەردا پێشكەشكردو پاش گەواهينامەكەى داوايكرد پەردەى نهێنى لەسەر بەڵگەنامە حكومييەكانى ماوەى پێش هێرشەكانو چەند ماددەيەكى تر، لابدرێت. كلارك پێداگريشى لەسەر ئەوە كردەوە كە ئەم بەڵگەنامانە، گەواهينامە نهێنييەكەى كۆنديش لەبەردەم ليژنەى ناوبراو دەگرێتەوە، ئەمە سەربارى نامەگۆڕينەوەكانى نێوان كلارك كە كاتێك كارى لە ئيدارەكەى بوشدا دەكرد لەگەڵ كۆندىو ستيڤن هادلى جێگرى كۆنديدا.

فشارەكان لەسەر كۆندى بۆ دەركەوتنى ئاشكرا لەبەردەم ليژنەكەدا زياديانكرد. لە ٢٠٠٤/٣/٣٠ راوێژكارى كۆشكى سپى ئەلبرتۆ ئار گۆنزاليس نامەيەك بۆ ليژنەكە دەنێرێت. گۆنزاليس لەم نامەيەدا رەزامەندى لەسەر بەئاشكرا دەركەوتنى كۆندى دەردەبڕێت، بەڵام بەدوو مەرج. گۆنزاليس داوايكرد گەواهينامە ئاشكراكەى كۆندى نەبێتە سەرەتايەك بۆ ئەو ليژنانەى كە رەنگە لە داهاتوودا پێكبهێنرێنو لەوانەيە داواى گەواهينامەى راوێژكارى ئاسايشى نەتەوەيى يان هەر بەرپرسێكى ترى كۆشكى سپى بكەن. مەرجى دووەمى گۆنزاليس ئەوەبوو كە ليژنەكە بە نووسراو رەزامەندى لەسەر ئەوە دەربڕێت كە لە هيچ بەرپرسێكى كۆشكى سپى بەخودى رايسيشەوە، داواى گەواهينامەى ئاشكراى زياتر نەكات. هەندێك لە چاودێران پێيان وايە كە هەڵسوكەوتەكانى كۆندى لەكاتى ئەم مشتومڕەدا ئيدارەكەى ناچاركردووە رێگەى پێبدات گەواهينامەكەى پێشكەش بكات. هەندێك لە وتارەكان نووسيويانە:"خودى رايس

لەرێگەی ژمارەیەکی بێشومار دیدارەوە کە تێیدا رایگەیاندبوو ئارەزوومەندە گەواهینامەکەی بدات، سەلماندبووی بیانووی ئیدارەکە بۆ رێگرتن لە گەواهینامەی ئاشکرا، لاوازە. کۆندی وتبووی ئەو هیچ شتێکی شاراوەی نییە. ئەم قسانەی کۆندی لە چەندین لێدوانی یەکبەدواییەکدا لە تەلەفزیۆن و رۆژنامەکان، رایگەیاندبوون، بەڵام داوای ئیدارەکە بۆ هەبوونی ماف گەواهینەدانی ئاشکرا لەلایەن بەرپرسە جێبەجێکارەکانەوە، پێشوازییەکەی ئاشکرای لێ نەکرا. دواجار پێش ئەوەی زیانی سیاسی زیاتر بەر ئیدارەکەی بکەوێت، بوش رێگەی بەکۆندی دا گەواهینامەکەی پێشکەش بکات.

لە ٨ی نیسان کۆندی لەسەر تەختێکی گەورە، لەبەردەم لیژنەی ١١ی سێپتەمبەر دەوەستێت و سوێند دەخوات. لە لێدوانی کردنەوەی گەواهینامەکەیدا دانی بەوەدا نا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەکاردانەوەی بۆ ئەو هێرشە تیرۆریستییانەی تیرۆریستان ماوەیەکی زۆر پێش هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر، خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، سستبووەو وتی: "تیرۆریستان خۆیان خستبووە حاڵەتی شەڕەوە لە دژمان، بەڵام ئێمە خۆمان نەخستبووە حاڵەتی شەڕەوە لە دژیان". کۆندی چەند رووداوێکی مێژوویی باسدەکات کە دەریدەخست ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کاردانەوەی بەرامبەر بە مەترسییە هاوشێوەکانی هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەردا سستبووە. نموونەی هەڕەشە یەك لەدوای یەکەکانی ئیمپراتۆریەتی ژاپۆنیشی لە ئەمەریکا بەنموونە هێنایەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتگوێی خست تا هێرشی بێرڵ هاربەر (لە جەنگی جیهانی دووەمدا)ی لێکەوتەوە". لەم لێدوانەیدا کۆندی بەرگری لە ستراتیژی ئیدارەکە دەکات سەبارەت بە تیرۆرو پرۆگرامی لێوانلێو لە کۆنگرە رۆژنامەوانییەکانی سەرۆك و کۆبوونەوەی خودی کۆندی خۆی لەگەڵ بەرپرسانی هەواڵگری وەك بەڵگە هێنایەوە، هەروەك پوختەی دەستپێشخەرییەکانی خۆشی لەوانە هاندانی وەزارەتی گەنجینە لەلایەن دەسەڵاتەوە بۆ بەدواداچوون و دەستبەسەرداگرتنی موڵك و ماڵی تیرۆریستان، باسدەکات.

له گەواهینامەکەی کۆندیدا زیاتر ئەو بەشەی جێسەرنجی لیژنەکە بوو کە پەیوەندی بە یاداشتێکی هەواڵگرییەوە هەبوو کە لە مانگی ٨ی ساڵی ٢٠٠١دا گەیشتبووە سەرۆك. لەم یاداشتنامەیەدا چەند زانیارییەکی تێدابوو سەبارەت بە پلانەکانی ئوسامە بن لادن بۆ جێبەجێکردنی هێرشێك لەسەر خاکی ئەمەریکا. کۆندی پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم یاداشتە هیچ هۆشدارییەکی نوێی سەبارەت بە هێرشێکی نزیك، لەخۆنەگرتبوو بەڵام پشتی بە "چەند زانیارییەکی کۆنی بیناکراو لەسەر راپۆرتی کۆن" بەستبوو. کۆندی پوختەی یاداشتنامەکە بەم شێوەیە باسدەکات:

**تیمی زانیارییەکان پیاچوونەوەی بە راپۆرتە هەواڵگرییە کۆنەکاندا کردووە کە زۆربەیان دەگەڕێنەوە بۆ ساڵەکانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو، ئەم راپۆرتانە پەیوەندییان بە چەند پلانێکی قاعیدەوە هەیە بۆ لێدانی چەند ئامانجێك لەناو خاکی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. ئەم راپۆرتانە ئاماژە بەچەند زانیارییەکی بێمتمانە دەکەن کە گوایە رەنگە تیرۆریستێك هەوڵی رفاندنی فرۆکەیەکی ئەمەریکی بدات بۆ ئەوەی حکومەت ناچاربکات ئەو تیرۆریستانەی بەشدارییان لە تەقاندنەوەی سەنتەری بازرگانی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٣دا کردووە، ئازاد بکات. ئەم بەشەی یاداشتنامەکە هیچ زانیارییەکی دیاریکراوی سەبارەت بەهیچ هەڕەشەیەك لەخۆ نەگرتبوو و ئەم زانیاریانە ئاماژەی بە ئەگەری بەکارهێنانی فرۆکە لەلایەن تیرۆریستەکانەوە بەشێوەیەك کە بکرێتە موشەکی هێرشبەر، نەکردبوو**

لەمیانەی پرسیارو وەڵامدا کۆندی پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئیدارەکە پێشبینی هیچ لێدانێکی لەناو خاکی ئەمەریکادا نەکردبوو بەڵکو زیاتر گرنگی بەچالاکییە تیرۆریستەکانی دەرەوەی ئەمەریکا دەدا. ئەندامێکی لیژنەکە بەناوی ریتچارد بێن-ڤینیستی- پرسی یاداشتەکەی وروژاندەوەو ئاماژەی بەوەدا کە خودی ناونیشانی یاداشتنامەکە ئاماژەی تێدایە بۆ هێرشێك لەناو وڵاتدا. بەم شێوەیە ئەم وتووێژە توندە روودەدات:

بن-ڤێنیستی: دکتۆر رایس ئایا ئەوە راستی نییە کە یاداشتەکە هۆشداری سەبارەت بە ڕوودانی ئەگەری هێرش لەم وڵاتە داوە؟ من پرسیاری ئەوەت لێدەکەم ئایا ناونیشانی ئەو یاداشتنامەیەت بیرماوە؟

رایس: پێم‌وایە ناونیشانی یاداشتنامەکە "سووربوونی بن لادن لەسەر هێرشێك لەناو ویلایەتە یەکگرتووەکان" بوو. ئەم یاداشتنامەیە.....

بن-ڤێنیستی: زۆر سوپاس

رایس: نا بەڕێز بن-ڤێنیستی.....

بن-ڤێنیستی: ئەمەوێت گفتوگۆ بکەم لەسەر بابەتی.....

رایس: دەمەوێت قسەکانم سەبارەت بەم خاڵە تەواوبکەم

بن-ڤێنیستی: دڵنیا نیم کە لێرەدا هیچ خاڵێك هەبێت.

رایس: هەرچەندە ئەوە بیروبۆچوونی خۆت بوو، تۆ پرسیارت لێکردم ئایا یاداشتنامەکە هۆشداریی سەبارەت بەهێرشکردن داوە؟

بن-ڤێنیستی: سەبارەت بەناونیشانی یاداشتنامەکە پرسیارم لێکردیت.

رایس: پرسیاری ئەوەت لێکردم ئایا یاداشتنامەکە سەبارەت بە هێرشکردن لەناو ویلایەتە یەکگرتووەکان هۆشداریی داوە. یاداشتنامەکە پشتی بەچەند زانیارییەکی کۆنی بنیادنراو لەسەر چەند راپۆرتێکی کۆن بەستووە. ئەم یاداشتنامەیە هیچ زانیارییەکی سەبارەت بە هێرشی نوێ لەخۆنەگرتووە. لەڕاستیدا یاداشتنامەکە هۆشداری سەبارەت بە هیچ هێرشێکی نزیك لەناو ویلایەتە یەکگرتووەکاندا نەداوە.

لە میانەی گەواهینامەکەیدا کۆندی توانی پارێزگاری لە ئارامیو هاوسەنگیی خۆی بکات، تەنانەت لەکاتی ئەو وتووێژە توندەی سەرەوەدا. لە هەموو دیدارە تەلەفزیۆنییە ئاشکراکانی تریشیدا لەکاتی گفتوگۆکردن لەسەر سیاسەتی سەرۆك بەرامبەر بە عێراق کە مشتومڕێکی زۆری نایەوە، بەئارامی هەڵسوکەوتی دەکردو بینەران هیچ هەڵوێستێك یان ئاکارێکی وایان لێ نەدەبینی کە پێچەوانەی دەرکەوتنی پێشووی بێت لە بەرنامە سیاسییە تەلەفزیۆنییەکاندا. یەکێك لە پەیامنێران سەرنجی ئەوە دەدات کە گەواهیدانەکەی کۆندی هاوکات بوو لەگەڵ

بەردەوامی خەستبوونەوەی شەڕ لە عێراقدا، ئەمەش ڕاستییەك بوو کە ئەگەر لە گواستنەوەی دانیشتنەکانی گوێگرتن لە گەواهینامە سەرنجڕاکێشەکە لە تەلەفزیۆنەوە زیاتر خەڵکی ئەمەریکای نیگەران نەکردبێت، بەقەدەر ئەوە نیگەرانی کردبوون. تۆنی کارۆن لە گۆڤاری تایمدا نووسیویەتی: "هەرچەندە گەواهینامەکەی رایس هیچ سوپرایزێکی سەرسوڕهێنەری لەخۆنەگرتبوو، بەڵام سەرنجمان دا تەنانەت لەوکاتەی ئەو قسەی دەکرد، ژمارەیەکی زۆر تەقینەوە روویانداو. ئەو یاخیبوونەی لە ڕیزەکانی سوننەو شیعەی عێراقدا روویانداو هێزەکانی هاوپەیمانانیان هەژاندو پلانە کاتییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان توشی قەیران کرد، رەنگە لەو نیگەرانییەی ئەو جیاوازییانەی سەبارەت بە هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەرەوە دروستیکردبوون، نیگەرانییەکی زیاتری لە مێشکی دەنگدەری ئەمەریکیدا دروستکردبێت.

لە ئەیلولی ٢٠٠٤، لیژنەی ١١ی سێپتەمبەر بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوەو تێیدا ئەو بیانووەی ئیدارەی ئەمەریکای پوچەڵکردەوە کە دەیوت هەڕەشەی کارێکی تیرۆریستی لە عێراقەوە دێت کە هەڕەشەیەك بوو بوش دانی بەوەدا نابوو کە بەدیاریکراوی لە قاعیدەوە دەردەچێت. لەم راپۆرتەدا هاتووە:"ئێمە بەڵگەیەکی متمانەپێکراومان لەبەردەستدا نییە کە ئاماژە بێت بۆ ئەوەی عێراق و قاعیدە لە هێرشەکانی سەر ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هاوکاری یەکتریان کردبێت". بەمەش رەخنەگرانی بڕیاری سەرۆك بۆ هەڵگیرسانی شەڕ لە عێراقدا مادەیەکی نوێیان بۆ بیانووەکانیان دەستکەوت. بەیاننامەی لیژنەکە پشتگیری چەندین کەسی لێکەوتەوە لەوانە سکۆکرۆفت کە ئاماژەی دابووبەوەی پێویست ناکات شەڕی دژی تیرۆر لە عێراقەوە هەڵبگیرسێنرێت، بەڵام لەو کاتەدا ١٥ مانگ بەسەر دەستپێکی شەڕەکەدا تێپەڕیبوو و زیانەکانی ئەمەریکا لە عێراق تا کاتی نووسینی ئەم دێڕانە واتە تا مانگی کانونی دووەمی ٢٠٠٥، گەیشتبووە ١٣٤٠ قوربانی. کۆی زیانەکانی هێزەکانی هاوپەیمانانیش بەگشتی تا ئەو کاتە گەیشتبووە ١٤٩١ قوربانی.

لــە میانــەی هەڵمــەتی ســەرۆکایەتییەکەی ســاڵی ٢٠٠٤دا، کۆنــدی لــەکاتی گەشتەکانی بوشدا بۆ چەندین شار لەوانـە گەشـتەکەی بـۆ کۆڵۆمبس لـە مـانگی سێپتەمبەردا کە بنکەی ئۆهایۆ بوو کە ئـەمیش ویلایەتـەکێکی ناوەنـدیی گـرنگ بوو بۆ هەڵمەتەکـەی، یـاوەری بـوو. لـە هەفتـەکانی دواتـردا کۆنـدی لـە چـەندین ویلایــەتی ســەرەکی لەوانــە ئــۆریگن، واشــنتۆن، کارۆلینــای بــاکور، پنســلڤانیا، میشــیگانو فلۆریــدا وتــاری پێشکەشــکردو ئــەم وتارانــە تــا دەســتپێکی پرۆســەی دەنگـدان لـە ٢ی نۆڤەمبـەر بـەردەوامبوون. رۆژنامـەی واشـنتۆن پۆسـت وتارێـك بڵاودەکاتــەوە کــە تێیــدا هــاتبوو: "زۆری وتارەکــانی کۆنــدیو شــوێنەکانی پێشکەشـکردنیان زۆر لـەو وتارانـە جیـاوازترە کـە پـێش ئـەم سـاڵی هەڵبژاردنـە بیستبوومان. دیارە ئەم وتارانـە پێشـێلی نـەریتێکی کـۆن دەکـات کـە بـەپێی ئـەو نەریتـە دەبێـت راوێـژکاری ئاسایشـی نەتـەوەیی خـۆی لـە هەڵمـەتی هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی لابـدات". وتـارێکی تـر کـە رۆژنامـەی نیویـۆرك تـایمز بڵاویکـردەوە، سکاڵایەك لەخۆدەگرێت کە لـە دژی زۆر دەرکـەوتنی "لـەم هەڵمـەتی هەڵبژاردنـەدا بەشــێوەیەك کــە زیــاتروەك یاریــدەدەری رۆژنامــەوانی دەرکــەوتووە وەك لــە راوێژکاری کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی"، بڵاوبووەتەوە، بەڵام کۆندی لـە میانـەی دیدارێکیدا لەگەڵ وێستگەی رادیۆی نیشتمانی ئەم بانگەشانەی بەدرۆخستەوەو رایگەیاند کە سنووری کارەکەی نەبەزاندووە. کۆندی بە تافیس سمایلی راگەیانـد: "بێگومـان نـەخێر، مـن راوێـژکاری ئاسایشـی نەتـەوەییم. پێموایـە قسـەکردن بـۆ گەلی ئەمەریکا بەشێکە لـەو رۆڵـەی دەیبیـنم. ئێمـە لەحاڵـەتی شـەڕداینو کـاتی ئـەوە هـاتووە ئـەو کەسـانەی پۆسـتی بەرپرسـیارێتییان داگیرکـردووە لـەدەرەوەی واشنتۆن دەرکەون"..

لەمیانەی ئـەو هەڵمەتـەدا کۆنـدی پرۆگرامـی وتارەکـانی چڕدەکاتەوە، بـەڵام سەرباری ئەوەش بەپێچەوانەی هەڵمەتـە سـەرۆکایەتییەکەی ٢٠٠٠ کـە راهێنـەری بوش بوو بەشداری لـە ڕووداوە سیاسییەکاندا نـەکرد. بەپێچەوانەی کۆنفرانسـی پارتی کۆماری لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە کە بەمەبەستی پشتگیریکردن بـۆ پرۆگرامـی W لەپێناو ژناندا وەك وتەبێـژێکی سـەرەکی بەشـداریکرد، کۆنـدی لـە کۆنفرانسـی

نەتەوەيى پارتى كۆمارى كە لە ٢٠٠٤دا لە نيويۆرك گريدرا، بەشدارنەبوو. سين مارك كۆرميك وتەبێژى فەرمى ئەنجوومەنى ئاسايشى نەتەوەيى دەڵێت: "راوێژكارى ئاسايشى نەتەوەيى لە هەڵمەتەكانى هەڵبژاردن يان بۆنە سياسييەكاندا بە چالاكى بەشدارى ناكات"

پاش دوو هەفتە لە بردنەوەى هەڵبژاردنەكە كە لە نۆڤەمبەرى ساڵى ٢٠٠٤دا ئەنجامدرا، سەرۆك بوش متمانەى خۆى بۆ لێهاتوويى راوێژكارەكەى بوارى ئاسايشى نەتەوەيى دەربڕى. كاتێكيش بۆ پۆستى وەزيرى دەرەوە ديارى كرد، سەرۆك جارێكى تر بەدڵبوونى خۆى بە شياوێتى كۆندى لە ئيدارەكەيدا دووپاتكردەوە. كۆندى بەوەش جێگەى كۆڵن پاوڵ دەگرێتەوە كە خۆى لە كارى حكومى خانەنشينكرد.

كاتێك سەرۆك بەهەموو شانازييەكەوە قسەى لەسەر دەكردو بەچەند وشەيەكى هەڵقوڵاو لە دڵەوە گوزارشتى لە جێبەجێكردنى كارەكانو باكگراوندى كەسايەتيى كۆندى دەكرد، بەشێوەيەك كارى تێكرد كە وەزيرى نوێى دەرەوە خەريك بوو فرمێسك بەچاوەكانيدا بێتەخوارەوە. ئەمەش لە ئاهەنگى راگەياندنى كۆشكى سپيدا هات بۆ پۆستى وەزيرى دەرەوە كە لە ١٦ى نۆڤەمبەردا سازكرا كە هاوكات بوو لەگەڵ تێپەڕيوونى دوو رۆژ بەسەر پەنجاهەمين ساڵيادى لەدايكبونى كۆنديدا. بوش دەڵێت: "لەماوەى چوار ساڵى رابردوودا پشتم بە راوێژەكانى بەستووەو سوودم لە شارەزاييە زۆرەكەى وەرگرتووەو فەرمانە جێگيرو راستەكانيم پەسەندكردووە. ئێستاش شانازييە بۆ من كە ئەو كەسە كاركردنى لە حكومەتەكەى مندا پەسەندكردووە. وەزيرى دەرەوە روخسارى ويلايەتە يەكگرتووەكانە لە جيهاندا. جيهان لە دكتۆر رايسدا هێزو شكۆمەندىو لێهاتوويى دەبينن كە ئەمانەش سيماگەلێكن وڵاتەكەمانى پێ جيادەكرێتەوە". بوش ئاماژەش بەسەردەمى منداڵيى كۆندى لە بيرمنگهام دەدات، سەردەمى خەبات لەپێناو مافە مەدەنييەكاندا كە سەردەمێك بوو بەتوندوتيژى جيادەكرايەوەو دەڵێت: "دكتۆر رايس لەسەروو هەمووو ئەوانەشەوە خاوەنى باوەڕێكى قوڵەو وابەستەى بەهاى ئازادىو هێزەكەيەتى، ئەمەش بۆ ئەوە

دەگەڕێتەوە کە بێبەشی لە ئازادی بینیوە، دواتر ئەو سەردەمەی بینیوە کە تێیدا جارێکی تر ئازادی لەدایك دەبێتەوە"

کۆندی لە وەڵامدا چەند سەرنجێکی راگەیاند لەوانە هەست بەشەرمەزاریی دەکات لەبەرئەوەی جێگەی کۆلن پاوڵ دەگرێتەوەو زۆر شەیدای کارکردنە لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی لە کۆشکی سپیدان. ئەم سەرنجانەی کۆندی پاش ئەوە هات کە ستایشی سەرۆکی کرد:

**بەڕێز سەرۆك زۆر سوپاس. کارکردنم لەگەڵ تۆدا بەدرێژایی چوار ساڵی رابردوو شانازییە بۆ من. من بەنازناوێکی شکۆی دادەنێم بۆ خۆم بەتایبەت لەکاتی قەیران‌و بڕیاردان‌و دیاریکردنی چانسەکانی نەتەوەکەماندا. ئەمەریکا لەژێر سایەی سەرکردایەتیکردنی تۆدا لە دژی تیرۆر دەجەنگێت‌و سەرکەوتن بەدەستدەهێنێت. ئەو هاوپەیمانێتییانەی تۆ رێکتخستوون بوونەتە هۆی ئازادکردنی ملیۆنەها خەڵك لە دەسەڵاتدارە یاخییەکان، ئەم هاوپەیمانێتییانە ئێستا یارمەتی هەردوو گەلی عێراق‌و ئەفغانی دەدات بۆ بنیاتنانی دیموکراسی لە وڵاتەکانیانداو هەموو ئەمانەش لەناو جەرگەی جیهانی ئیسلامدا روودەدەن. هەروەها تۆ لەپێناو فراوانکردنی بازنەی دەوڵەمەندیی‌و پێشکەوتن لە هەموو سوچێکی جیهاندا، کارتکردووە.**

هەمان رۆژ بوش رایگەیاند کە ستیڤن هادلی کە جێگری کۆندی بوو پلەکەی بەرزدەکرێتەوەو دەکرێتە راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی. کردنی کۆندی بە وەزیری دەرەوە لەچوارچێوەی کۆمەڵێك گۆڕانکاریدا هات لە حکومەتەکەی بوش پاش هەڵبژاردنەکان. ئەم گۆڕانکارییانە دەستلەکارکێشانەوەی دۆن ئیڤانز وەزیری بازرگانی‌و جۆن ئاشکرۆفت داواکاری گشتی‌و تۆم ریج وەزیری ئاسایشی ناوخۆشی لەخۆگرتبوو.

پێش دامەزراندنی کۆندی لەم پۆستەدا تەنها ژنێك کە ئەویش مادلین ئۆڵبرایت بوو، پۆستی وەزیری دەرەوەی وەرگرتووە. بەدرێژایی مێژووی ئەمەریکاش تەنها یەك پیاوی رەشپێست ئەو پۆستەی وەرگرتووە. هاوکات لەگەڵ وەرگرتنی پۆستی وەزیری دەرەوە لەلایەن کۆندییەوە چەندین وڵاتی

ئەوروپی دەستدەکەن بە پێشبڕکێ بۆ چانسی باشکردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. وتارێك کە لە گۆڤاری هەفتانەی ئەڵمانی دای زیتدا بلاوکرایەوە پێشبینی ئەوە دەکات کە پەیوەندییەکان لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا باشتر ببێت لەبەرئەوەی ناکرێت لەدوو ساڵی رابردوو خراپتربێت. ئیرهارد ساندشنایدەر کە بەرێوەبەری ئەنجوومەنی پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئەڵمانیایە پێی وایە باکگراوندی ئەکادیمی کە بەسەر باکگراوندە سیاسییە ئەزمووندارەکەیدا زاڵە، کارێکی پۆزەتیڤەو پەیوەندییە توندوتۆڵەکەی لەگەڵ سەرۆکدا گۆڕانکارییەکی گرنگ دەبێت. سانشنایدەر دەڵێت: "لە سەردەمی پاوڵدا نەمان توانی بزانین کە ئایا سیاسەتەکانی کاریگەرییان لەسەر سەرۆك دەبێت، بەڵام ئەگەر خاتوو رایس کارێك پەسەندبکات ئەوە بێگومان دەزانین سەرۆکیش پەسەندی دەکات".

ریتچارد برنشتاین لە وتارێکدا کە لە رۆژنامەی نیویۆرك تایمزدا بلاوکراوەتەوە ئەوە روونندەکاتەوە کە ئەوروپا سەبارەت بە کاریگەریی کۆندی لە پۆستەکەیدا، دوو تێڕوانینی گشتییان هەیەو دەڵێت: "یەکێك لەم دوو تێڕوانینە ئەوەیە کە کۆندی کاریگەریی توندڕەوەکانی ئیدارەکە واتە ئەوانەی پێیان دەووترێت کۆنەپارێزە نوێکان، زیاتردەکات، بەڵام تێڕوانینەکەی تر دەڵێت: "تێگەیشتنە قوڵەکەی بۆ پرسە نێودەوڵەتییەکان بەتایبەت پرسەکانی روسیاو ئەڵمانیا بەڵگەی هاوسۆزییەتی لەگەڵ بیروبۆچوونە ئەوروپییەکان یان بەلایەنی کەمەوە ئاگاداری ئەو بیروڕایانەیە"

لە ١٩ی نۆڤەمبەر، واتە سێ رۆژ پاش دامەزراندنی وەك وەزیری دەرەوە، کۆندی بەمەبەستی چارەسەرکردنی چەند لویەکی ریشاڵیی ناشێرپەنجەیی لە منداڵدانیدا، دەخرێتە نەخۆشخانەی جۆرج تاون لە واشنتۆنی پایتەختدا. کۆندی شێوازی داخستنی خوێنەبەرەکانی لووە ریشاڵییەکان لەرێگەی نەشتەرگەرییەوە هەڵدەبژێرێت کە نزیکەی سەعاتو نیوێك دەخایەنێت. ئەم نەشتەرگەییە لەژێر سرکردنی ناوچەیی (مەوزعی)دا ئەنجامدەدرێتو وپێویستە نەخۆش شەوێك لە نەخۆشخانەدا بمێنێتەوە. بەگوێرەی ئەم کارە نەشتەرگەییە، نەشتەرگەرەکە

چەند تەنۆکەیەکی ورد بەدەرزی دەدات لە خوێنبەرەکانی منداڵدان کە ئەمەش دەبێتەهۆی لەکارخستنی ئەو ماددانەی خوێن دەیانبات بۆ لووەکان. بەگشتی ئەو ژنانەی توشی ئەم حاڵەتانە دەبن لەکاتی چارەسەردا منداڵدانیان دەردەهێنرێن، کە ئەمەش نەشتەرگەرییەکی ئاڵۆزترەو پێویستی بەسرکردنی گشتی هەیەو ماوەی چاکبوونەوەشی زۆر زیاتر دەخایەنێت. نەشتەرگەرێکی بۆستن دەڵێت: "کاتێك ژنێکی وەك کۆندی ئەم بژاردەیە هەڵدەبژێرێت بەڵگەی ئەوەیە کە ژنانێکی زیاتر دەزانن کە ئەم بژاردەشیان هەیە".

شێوازی داخستنی خوێنبەرەکانی لووەکان ماوەی ١٠ ساڵە لەئارادایە لەگەڵ ئەوەشدا ساڵانە تەنها ١٣ هەزار بۆ ١٤ هەزار ژنان ئەم چارەسەرە ئەلتەرناتیڤە ئەنجامدەدەن، لەبەرامبەردا نزیکەی ٢٠٠ هەزار ژن منداڵدانیان دەرهێناوە. لە رۆژنامەیەکی نیویۆرکدا بەناوی نیوز دەی هاتووە: "دکتۆر جاکوب سینامۆن بەرێوەبەری بەشی تیشك لە سەنتەری پزیشکیی مۆنتی فیۆری لە برۆنکس دەڵێت ژمارەیەك لە نەخۆشەکان دەڵێن ئەو پزیشکانەی ژنان چارەسەردەکەن پێیان نەوتوون رێگەیەکی ئاسانتر هەیە لە دەرهێنانی منداڵدان. سینامۆن دەڵێت: دەرهێنانی منداڵدان نانی رۆژانەی نەشتەرگەرانی ژن بووە".

رۆژی پاش نەشتەرگەرییەکە کۆندی نەخۆشخانە بەجێدەهێڵێتو رۆژی دواتریش دەگەڕێتەوە سەرکار. ورەبەرزییەکەی دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم بابەتە پزیشکییە لە لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکاندا لەسەرتاسەری جیهاندا دەربکەوێت، کە ئەمەش بەڵگەی دەرخستنی رادەی ئەو کاریگەرییە بەهێزە بوو کە کەسایەتییەکی جیهانی لە تەنها پرسێکدا، هەیەتی.

پاش کۆتاییهاتنی راژەکەی لە کۆشکی سپی، کۆندی چەند بژاردەیەکی کراوەی لەبەردەمدایە. هەندێك کەس پێشبینی ئەوە دەکەن کە هەموو ئەو سیمایانەی تێدایە کە کاندیدێکی سەرۆکایەتی سەرکەوتوو هەیەتی. کیمیلیا بگلیا کە زانایەکی کۆمەڵناسییە دەڵێت: "دەبێت یەکەم ژنەکاندیدی سەرۆکایەتی چانسی سەرکەوتنی پێ بدرێت". ئەم زانایە چەندین قسەی جەماوەرێکی زۆری ژن وەك بەڵگە دەهێنێتەوە کە هەرکاتێك کۆندی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن

دەرکەوتبێت وتویانە، لەوانە "پێویستە ئەمجارە ژن سەرۆك کۆمار بێت!"

ئەو راپرسییانەی لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٢ دا ئەنجامدران، دەریانخست کە کۆندی بژاردەی یەکەمی خەڵکە بۆ کاندیدی حاکمێکی کۆماری بۆ ویلایەت. هەندێك لە هاوکارە نزیکەکانیشی حەزدەکەن لە بواری کاری بانکی جیهانی یان راوێژکاریدا ببینن کە دوو بوارن کۆندی لە ساڵی ١٩٩٩دا کاتێك وازی لە زانکۆی ستانفۆرد هێنا بیری لێدەکردنەوە. کۆندی یەکێتی نیشتمانی تۆپی پێشی لەبیرنەکردووەو ئارەزوومەندە رۆژێك بێت سەرۆکایەتی بکات. کارەکەی پێشووشی وەك بەڕێوەبەری زانکۆی ستانفۆرد دەروازەیەکی نموونەیی پێدەدات بۆ سەرۆکایەتیکردنی زانکۆیەکی سەرەکی لە وڵاتدا. شایانی باسە تائێستاش دەرگاکانی فەرمانگەی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ستانفۆرد کە پێشتر تێیدا کاریدەکرد، بەڕوویدا کراوەیە. هەروەها بژاردە کراوەکانی بەردەمی، گەڕانەوە بۆ ئەنجوومەنە کارگێڕییەکانی کۆمپانیا گەورەکانیش دەگرێتەوە کە لەکاتی وەرگرتنی پۆستی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییدا، وازی لە هەموویان هێنابوو.

کۆندی کاتێك دەگاتە ئەم پردە، بەسەریدا تێپەڕدەبێت. لەمبارەیەوە دەڵێت:"من پلاندانەرێکی درێژخایەنی لێهاتوو نیم. وا ڕاهاتووم کە شتەکان دانە دانە چارسەردەکەمو سوورم لەسەر ئەوەی کارەکەم بەڕێکوپێکترین شێوە جێبەجێ بکەم". کۆندی پەرۆشییەکی زۆری بۆ هەموو ئەو کارانە هەیە کە بڕیاردەدات بیانخاتە ئەستۆی خۆیو بەهەمان پەرۆشییەوە کار لەسەر بەدیهێنانی هەموو ئامانجەکانی دەکات. ئەو بەردەوام دەبێتو دەڵێت: "حەزدەکەم خۆم بە کەسێکی پەرۆش بۆ ژیان لەقەڵەمبدەم، بەڕاستی پەرۆشم بۆ موزیك، پەرۆشم بۆ کارەکەم، پەرۆشم بۆ خێزانەکەم، هەروەها سەبارەت بەباوەڕەکەشم هەر پەرۆشم".

کەسە نزیکەکانو هاوڕێکانی کۆندی لە بیرمنگهامو هەموو ئەوانەی تریش کە بەبەردەوامی سەردانی ئەو کڵێسەیە دەکەن کە رایسی گەورە نزیکەی ٦٠ ساڵ لەمەوبەر دایمەزراندووە، لەپشت هەموو هەنگاوێکییەوە دەوەستن. قەشە جۆنز دەڵێت: "ئێمە وەك یەکێك لەخۆمان سەیری کۆندی دەکەین کە

گەیشتووەتە ئاستێکی بەرزی خزمەتگوزاریی گشتی، هەموو ئەمانەشی بەهۆی تواناکەیەوە بەدەستهێناوە. ئێمە هەموو رۆژێك لەپێناو ئەودا نوێژ دەکەین".

دامەزراندنی کۆندی وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی هەنگاوێکی زەبەلاح بوو لە بەرژەوەندی ژنانو رەشپێستەکان لەیەك کاتدا. ئەم هەنگاوە پاش نۆ ساڵ لە هەڵبژاردنی کارۆڵ موسلی هات وەك ئەندامی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا کە یەکەم ژنی رەشپێست بوو کورسییەکی لەم شێوەیە بەدەستبهێنێت. سەرنجدەدرێت کە ژمارەی رەشپێستەکان لە ئاستە بالاکانی وەزارەتی دەرەوەدا کەمە (سەرۆك ریگان پێشتر کۆڵن پاوڵی وەك راوێژکاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دامەزراندبوو، کە یەکەم پیاوی رەشپێست بوو لەم پۆستەدا دابمەزرێنرێت)، لەبەرئەوە دامەزراندنی کۆندی لەم پۆستەدا هەمان گرنگی دامەزراندنی ماریان ئەندرسۆنی هەیە کە یەکەم ژنە ئەندامی هەمیشەیی رەشپێست بوو لە گروپی ئۆپرای ئەمەریکیدا. دامەزراندنی کۆندی هەمان گرنگی دامەزراندنی جاکی رۆبنسنیشی هەیە، کە ئەمیش ژنێك بوو توانی لەیاری بەیسبۆڵدا لەمپەری رەنگی پێست تێکبشکێنێت. کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ پێشکەوتنی رەنگە جیاوازەکان لەرێگەی پێدانی خەڵاتی سەرۆکی کۆمەڵەکەوە بۆ ساڵی ۲۰۰۲، دان بەدەستەکەوتەکانی کۆندیدا دەنێت. ئەم رێزلێنانە فەخرییە لەو کەسانە دەنرێت کە کاریان لەپێناو کەمینەکاندا کردووە، جا بەهۆی پۆستەکانیانەوە بێت یان بەهۆی ئەوەی بووبنە نموونەیەکی باش لەم بوارەدا. کویسی مافیۆم کە ئەو کاتە سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ پێشکەوتنی رەنگە جیاوازەکان بوو، دەڵێت بەراستی کۆندی لەسەر رچەشکاندنی بوارە نوێکانی هەموو قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی، راهاتبوو. کویسی بەردەوام دەبێتو دەڵێت: "کۆندی نموونەیەکی لەبەردەمدا نەبوو کە هەنگاوەکانی ئەو هەڵبگرێت، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە کۆندۆلیزا رایس لە هیچ کەسێك ناچێت".

کۆندی لەو کاتەوەی بۆ یەکەمین جار پۆستی پرۆفیسۆری یاریدەدەری وەرگرتووە واتە لەوکاتەی دەستیکرد بەپێدانی زانیاری قوڵ لەسەر یەکێتیی سۆڤیەت لەسەردەمی شەری ساردا بە قوتابییەکانی، قۆناغێکی گەورەی لە

ڕێڕەوە پیشەییەکەیدا بڕیوە. لەکاتێکیشدا کاری لە ئیدارەکەی بوشدا دەکرد، لەریزی پێشەوەی بڕیاردانـدا بـوو. ئـەو کاتـە لـەبواری داڕشتنی سیاسـەتی نـوێ بەرامبـەر بـەو ولآتانـەی تـازە کەوتبوونـە سـەر نەخشـەی ئـەوروپا، یارمـەتی سـەرۆك و ئەنـدامانی ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی دەدا. لـەکاتی مـاوەی یەکەمی سەرۆکایەتی بوشیشدا کۆندی هەر لە ڕیزەکانی یەکەمی بڕیاردانـدا بـوو، ئەویش کاتێك بیروڕای ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی پێشـکەش بەسـەرۆك دەکردو ئەو کاتانەی داوای لێدەکرا بیروڕای خـۆی سـەبارەت بـە شـەڕی دژەتیرۆرو پرسە نێوەدەوڵەتییەکانی تر پێشکەشبکات. هەر لەماوەی یەکـەمی سـەرۆکایەتی بوشدا کۆندی دەسـتدەکات بـە داڕشـتنی مێـژووی سیاسـیو بـەوەوە نەوەسـتا کـە تەنها لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجامبدات.

دیارە ئەرکەکانی کۆندی لـە ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نەتەوەییـدا لەچـەندین ئاستدا جێگای ڕەزامەندی بوون. ئەم پۆستەی ڕێگەی پێدا کە شارەزاییەکەی لەو بـوارەی خـۆی هەڵبیـژاردووە، بەوپـەڕی توانایـەوە، بـەکاربهێنێت. کۆنـدی وەك تاکێکی تیمەکەی سەرۆك، لەبواری ڕاژەی گشتیدا کاری کردووە کە ئەمەش شتێك بوو دایكوباوکی بەچەندین شێوە لەسەری ڕاهاتبوونو ئەم ئاکارە جوانـەیان لـە کۆندیدا چاندبوو. سـەردانی چـەندین شـوێنی لـە جیهانـدا کـردووە. سـەردانی بـۆ مۆزەخانـەی هۆلۆکۆسـت (کۆمەڵکوژییەکـەی نازییـەکان) لـە قـودس زۆر کـاری تێدەکات بەتایبەت کاتێك وێنەیەکی فۆتۆگرافی ژنو مێردێك دەبینێت کە نـوقمی جوانیی ئەو جلوبەرگە بوون کە لەبەریان کردبوو. ئەم وێنەیە تـەواو لـەو ژینگـە خەمبارەی دەوروبـەری ژنو مێردەکـە لـە یـەکێك لـە گەڕەکـە هـەژارەکانی وارشـۆ، تـەواو جیـاوازبوو. کۆنـدی گـوێی لـە هەنـدێك کـەس دەبێـت کـە سـەبارەت بـەو وێنەیە دەیانوت زۆر سەیرە ئەم ژنو مێردە لەکاتێکدا ژیانیان لەمەترسیدا بـووە، بەئەنقسەت هێندە گرنگییان بەڕوخسـاریان داوە. لەوکاتـەدا کۆنـدی دەسـتبەجێ دەڵێـت:"من دیـدێکی جیـاوازم هەیـە. ئـەم دوو کەسـە دەڵـێن: "تائێسـتاش ئێمـە جڵەوی کاروباری خۆمان بەدەسـت خۆمانـەو لێرەشـدا پارێزگـاری لـە شـکۆمەندیی خۆمان دەکەین". هەروەها دەشڵێن: "دەتوانن هـەموو شـتێکمان لـێ زەوت بکـەن

تەنانەت خودی ژیانیشمان، بەڵام بێگومان ناتوانن شکۆمەندیمان لێ دابماڵن"
کۆندی لەم ژن و مێردەدا ئەو سەربەرزیو شکۆمەندییە دەبینێت کە بەهۆیەوە
دایكوباوكی لە بیرمنگهام جلوبەرگی شیكو جوانیان لەبەردەکرد.

سەرباری کەموکورتیو پێشکەوتنە سستە کۆمەڵایەتییەکەی ئەمەریکا،
گەشتە زۆرەکانی کۆندی بوونە هۆی ئەوەی ئەو وڵاتە رێزێکی زیاتر پەیدابکات.
لەساڵی ٢٠٠٢دا جارێك کۆندی لەبەردەم جەماوەرێکی زۆردا دەڵێت: "هەرکاتێك
لەگەڵ سەرۆك بوشدا گەشتم بۆ وڵاتان کردبێتو سەرکردەکانی جیهانم بینیبێت،
ئەمەریکام لە میانەی چاوی کەسانی ترەوە بینیوە. من وڵاتێك دەبینم کە
تائێستاش خەبات لەپێناو مانای راستەقینەی دیموکراسی فرەرەگەزیدا، دەکات.
وڵاتێك دەبینم کە تائێستاش لەپێناو بەراستی پەیرەویکردنو بەرزراگرتنی
فرەییدا خەباتدەکات. خەڵکی تر وڵاتەکەمانی بەدڵە.... لەبەرئەوەی لەپێناو
باشتربووندا تێدەکۆشێت. دەزانم کە وڵاتەکەمان نموونەیی نییە، بەڵام بێگومان
قۆناغێکی زۆرمان بەرەو پێشکەوتن بڕیوە"

پاش ئەوەی دوور لە تیتوسڤیل دەژی کە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای
شارەکەوە کۆندی زۆر لەو کەسایەتییەی دوورناکەوێتەوە کە کاتێك لە بیرمنگهام
دەژیا، . ئەو لەسەر کارکردنی ماندونەناسانە بەردەوامە (بەڵام رەنگە کاتی
خۆشگوزەرانی پێویستی نەبێت)، تائێستاش شێلگیرانە وانەی پیانۆ دەخوێنێت.
کۆندی تائێستاش خاوەنی متمانە بەخۆکردنێکی بەرزو تێروانینێکی
گەشبینانەیە بۆ کارەکانو دەڵێت هەموو شتێك بەرەو پێشکەوتنو باشبوون
هەنگاودەنێت، (شایانی باسە کاتێك تەمەنی کۆندی ١٠ ساڵان بوو، کارێکی لە
کۆشکی سپی دەستدەکەوێت، بەڵام دەرگاکانی بەڕوودا دادەخرێت)، هەمیشە
بڕوای بەهێزبووە. کۆندی خۆی لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ئاستەنگانە نەدەبینی
کە منداڵە رەشپێستە هەژارەکانی بیرمنگهام ڕووبەڕووی دەبوونەوە، بەڵام لەگەڵ
ئەوەشدا پشکی هەبوو لە تێکۆشاندا. تاریکی ئەو کاتانە وەك خاڵی دەستپێکی
ژیانی کۆندی وابوو و بووە پاڵنەرێك بۆ هەوڵی گەیشتن بە ئەوپەڕی ئەو
سنوورەی بەهرەو بیرۆکەکانی پێی دەگات. ئەو زۆر باش لەوە تێدەگات کە مرۆڤ

بەبێ خەبات پاڵنەرێكی بەهێز بۆ پەرسەندن نادۆزێتەوە، ئەمەش ئەو بنەمایەیە كە پێش ئەو باوكی بڕوای پێی هەبوو. كۆندیش وەك سێ نەوەی پێشووی بنەماڵەی رایس و رای پێش ئەم، شانازییان بەم نزایانە دەكرد:

**ئێمە خۆمان رەوش و ئەزموونی خۆمان هەڵنابژێرین بەڵام دەتوانین وەڵامدانەوەكانمان بۆ رەوش و ئەزموونەكە هەڵبژێرین. ئێمە وا راهاتووین كاتێك هەموو شتێك وەك پێویست دەڕوا بەڕێوە، لە خۆشی ساختەو تێركردنی حەزە خۆرسكە ماددییەكانمان نوقم بین و هەست بەخۆلێكۆڕان و لەخۆكۆڕان و بڕوابوون بەخۆمان بكەین. سەرباری هەموو ئەوەش لەڕێگەی خەباتەوە نەبێت ناگەینە رزگاربوون و ناسینی خۆمان، ئەمەشە كە كۆیلەكانی ئەكزۆدس فێری بوون. هەر ئەمەشە كە كۆیلەكان لە ئەمەریكا پێوەی گیرۆدەبوون و بە گۆرانی دەیانوت: "هیچ كەسێك لەو تەنگوچەڵەمانە تێناگات كە ئەمەریكا بەخۆیەوە بینیویەتی- دەبا رێز لە خودا بگرن!.**

دایك و باوكی كۆندی ئەو باوەڕەیان تێدا چاندووە كە دەتوانێت رۆژێك لە رۆژان ببێتە سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكان و توانیشیان بەشێوەیەك ئامادەی بكەن كە ببێتە كەسێك جێ پەنجە بەسەر جیهانەوە جێبهێڵێت. ئایا بەهیچ شێوەیەك ئەوە بەمێشكی جۆن رایسدا دەهات كە نازناوی بەهێزترین ژن لە جیهاندا بدرێت بە ئەستێرە بچووكەكەی؟ ئایا ئەنجێلینا رایس پێشبینی ئەوەی دەكرد كە موعجیزە موزیكییەكەی كە كۆندی بوو، لە سەنتەری كینیدی موزیك بژەنێت و خانمی یەكەمی ویلایەتە یەكگرتووەكان لە ئاهەنگەكەدا كۆندی بناسێنێت؟ رەنگە دایك و باوكی نەیان توانیبێت بەدیاریكراوی پێشبینی ئەم دوو بۆنەیە بكەن، بەڵام جۆن و ئەنجێلینا سنوورێكیان نە بۆ خەونی خۆیان نە بۆ هی كچەكەیان، دانەنابوو.

كۆندی لە ماوەی ٥٠ ساڵدا توانی ببێتە ژنێكی رەچەشكێن بەمانای وشە، توانی ببێتە ژنێكی تێروتەسەل لە زیاتر لەبوارێكدا لەوانە وەك هونەرمەند، ئەكادیمی، نووسەر، بەڕێوەبەری زانكۆ، سوڵتانی سیاسەتی دەرەوەو راوێژكاری سەرۆكایەتی. بێگومان ئێمەو سەراپای جیهانیش چاوەڕوانی شتی زیاتری لێ دەكەین.

# پاشكۆكان

## پاشكۆی یەكەم

### راوێژكارانی ئاسایشی نەتەوەیی لەماوەی ١٩٥٠-٢٠٠٥

| | |
|---|---|
| ستیڤن هادلی | ٢٠٠٥ |
| كۆندۆلیزا رایس | ٢٠٠١-٢٠٠٥ |
| سامویڵ ئێڵ. بێرگەر | ١٩٩٧-٢٠٠١ |
| و.ئەنتۆنی لایك | ١٩٩٣-١٩٩٧ |
| بێرنت سكۆكرۆفت | ١٩٨٩-١٩٩٣ |
| كۆڵن پاوڵ | ١٩٨٧-١٩٨٩ |
| فرانك س. كارلۆچی | ١٩٨٦-١٩٨٧ |
| جۆن م. بۆیند كستەر | ١٩٨٥-١٩٨٦ |
| رۆبەرت سی. ماك فێرلێن | ١٩٨٣-١٩٨٥ |
| ریتچارد ف. ئالان | ١٩٨١-١٩٨٢ |
| زبینگیۆ برزینیسكی | ١٩٧٧-١٩٨١ |
| بێرنت سكۆكرۆفت | ١٩٧٥-١٩٧٧ |
| هێنری كیسنجەر | ١٩٦٨-١٩٧٥ |
| واڵتو. رۆستۆ | ١٩٦٦-١٩٦٨ |
| ماك جۆرج بۆندی | ١٩٦١-١٩٦٦ |
| گۆردۆن گرای | ١٩٥٨-١٩٦١ |
| رۆبەرت كاتلەر | ١٩٥٧-١٩٥٨ |

| | |
|---|---|
| دیلۆن ئەندرسۆن | ١٩٥٥-١٩٥٦ |
| رۆبەرت کاتلەر | ١٩٥٣-١٩٥٥ |
| جەیمس ل. لای (سکرتێری گشتی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) | ١٩٥٠-١٩٥٣ |
| سیدنی سوێرز (سکرتێری گشتی جێبەجێکاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) | ١٩٤٧-١٩٤٩ |

# پاشكۆی دووەم

## ویستگە گرنگەكانی ژیانی كۆندۆلیزا رایس

» ١٤ی نۆڤەمبەری ١٩٥٤ : لەدایكبوونی لە بیرمنگهام، ئەلاباما.

» ١٩٦٥: یەكەم كچە خوێندكاری رەشپێست كە پەیوەندی دەكات بە پۆلەكانی فێركردنی موزیك لە پەیمانگای نیشتمانی باشوور بۆ موزیك لە بیرمنگهام.

» ١٩٦٩: گواستنەوە بۆ دێنفەر، كۆلاورادۆ، بۆ یەكەمین جار پەیوەندی دەكات بە قوتابخانەیەكی تێكەڵاوەوە.

» ١٩٧١: تەواوكردنی قۆناغی دواناوەندیو كۆتاییهێنانی ساڵی یەكەمی زانكۆ.

» ١٩٧٤: تەواوكردنی زانكۆی دێنیڤەر بە پلەی نایاب.

» ١٩٧٥: وەرگرتنی پلەی ماستەر لە كارگێڕیی حكومیی لە زانكۆی نۆتەردام.

» ١٩٨١: وەرگرتنی بڕوانامەی دكتۆرا لە لێكۆڵینەوەی نێودەوڵەتی لە زانكۆی دێنیڤەر.

» ١٩٨١: دامەزراندنی وەك پرۆفیسۆری یاریدەدەری زانكۆ لە وانەی زانستە سیاسییەكان لە زانكۆی ستانفۆرد.

» ١٩٨٤: بڵاوكردنەوەی كتێبی هاوپەیمانێتی تەمومژاوی: یەكێتیی سۆڤیەتو سوپای چیكۆسلۆڤاكیا ١٩٤٨-١٩٦٣ (چاپخانەی برنستۆن).

» ١٩٨٦: بڵاوكردنەوەی كتێبی چەرخی گۆرباتشۆف بە هاوبەشی لەگەڵ ئەلیكسەندەر داڵان، چاپخانەی دەرچوانی ستانفۆرد.

» ١٩٨٦-١٩٨٧: وەرگرتنی پۆستی یاریدەدەری تایبەتی بەڕێوەبەری دەستەی ئەركانی هاوبەشی پێنتاگۆن، ئەویش لەرێگەی بەخشینی دارایی ئەنجوومەنی پەیوەندییە دەرەكییەكانەوە.

- 1987: بەرزبوونەوە بۆ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە فەرمانگەی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی ستانفۆرد.
- ١٩٨٩-١٩٩١: وەرگرتنی چەند پۆستێك لە ئیدارەکەی بوش لەوانە بەڕێوەبەری کاروباری سۆڤیەت و ئەورووپای رۆژهەڵات و یاریدەدەری تایبەتی سەرۆك بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی و بەڕێوەبەری بالای کاروباری سۆڤیەت لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی.
- ١٩٩١: پەیوەندیکردن بە ئەنجوومەنەکانی کارگێڕیی کۆمپانیاکانی شیفرۆن، ترانس ئەمەریکا، هیۆلێت باکارد.
- ١٩٩٢: پێشکەشکردنی وتارێك لە کۆنگرەی نەتەوەیی پارتی کۆماری.
- ئایاری ١٩٩٣: پلە زانستییەکەی بۆ پرۆفیسۆری زانکۆیی لە زانکۆی ستانفۆرد بەرزدەبێتەوە.
- ئەیلولی ١٩٩٣: دامەزراندنی وەك بەڕێوەبەری زانکۆی ستانفۆرد.
- ١٩٩٤: هەڵبژاردنی وەك ئەندامی ئەنجوومەنی ئەمینداراني زانکۆی نۆتەردام.
- ١٩٩٥: پەیوەندیکردن بە ئەنجوومەنی ئیدارەی کۆمپانیای جی بی مۆرگان.
- ١٩٩٩: پەیوەندیکردن بە ئەنجوومەنی کارگێڕی کۆمپانیای چارلز شواب.
- تەمموزی ١٩٩٩: لە پۆستی بەڕێوەبەری زانکۆی ستانفۆرد دەستی لەکارکێشایەوەو پۆستی راوێژکاری سیاسەتی دەرەوەی هەڵمەتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بوشی کوڕی گرتەدەست.
- ٢٠٠٠: پێشکەشکردنی وتارێك لەبەردەم کۆنگرەی نیشتمانی پارتی کۆماری.
- کانونی یەکەمی ٢٠٠٠: سەرۆکی هەڵبژێردراو جۆرج دەبلیو بوش وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی دایدەمەزرێنێت.
- کانونی دووەمی ٢٠٠١: وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سوێندی یاسایی دەخوات.
- نیسانی ٢٠٠٤: پێشکەشکردنی گەواهینامەکەی بەردەم لیژنەی لێکۆڵینەوە سەبارەت بەهێرشەکانی ١١ ی سێپتەمبەر.
- کانونی دووەمی ٢٠٠٥: سوێندخواردنی وەك وەزیری دەرەوە.

# پاشکۆی سێیەم

## وێنەکان



کۆندی لەکاتێکدا لە ساڵەکانی یەکەمی زانکۆی دێنیڤەردا بوو



کۆندی لەگەڵ ژەنیاری ڤیۆلۆنسێل یو-یو ما لەکاتێکدا پێکەوە لە میانەی ئاهەنگێکدا کە کۆمەڵەی "مەدالیای نیشتمانی بۆ هونەر" لە واشنتۆن لە ۲۲-٤-۲۰۰۲ رێکیخستبوو، پارچە موزیکێکی برامز لێدەدەن



لەکاتی وەرگرتنی خەڵاتی سەرۆکی NAACP لە ئاهەنگی خەڵاتی وێنەکان

٢٠٠٢/٢/٢٣



وێنەی فەرمی کۆندۆلیزا رایس لە کۆشکی سپی



وێنەی باپیری کۆندی، جۆن ویسڵی رایس



جۆزێف کۆربێڵ مامۆستای زانکۆی دێنیڤەرو باوکی مادڵین ئۆڵبرایتو رێبەری کۆندی لە خوێندنی روسیو سۆڤیەتیدا. کۆندی ئەم پیاوە وەك یەکێك لە گرنگترین پیاوەکان لە ژیانیدا باسدەکات

ئەم چیرۆکە گەشتی کۆندی لە ڕێڕەوی باڵاترین پلەکانی ئەو بوارەدا دەگێڕێتەوە، کە پیاوان کۆنترۆڵیان کردووە، هاوکارەکانی شێوازەکەی کۆندی بەتوندوتۆڵی ئاوێتە بوو بەنەرمیی، ناودەبەن. لە ڕۆژنامەی نەشناڵ ریڤیو-دا هاتووە: "هەمووان لەسەر ئەوە کۆکین کە کەسایەتییەکی زۆر سەرنجڕاکێشو ئارامو باشو زیرەكو خاکییە، لەگەڵ ئەوەشدا تائێستاش بەسروشتە باشورییەکەی جیادەکرێتەوە هەرچەندە چەندین ساڵ لە شوێنە جیاکانی تردا ژیانی بەسەربردووە". زۆرێك لەوانەی لەکاتی ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا دیدارم لەگەڵدا ئەنجامداون، ستایشی زۆری ئاستی زانیارییەکانیان دەکردو ئاماژەیان بەوە دەکرد کە لە بیرێکی قولەوە زانیاری دەردەهێنێت. کارین فیست کە مامۆستای کۆندی بووە لە زانکۆی دینیڤەر دەڵێت: "کۆندی یەکێکە لە مرۆڤە بەختیارەکانو لایەنی خەمباریی لە ژیانیدا نییە یان بەلایەنی کەمەوە ئەوەندەی من ئاگاداربم ئەو لایەنەی نییە".



٣٠٠٠ دینار